# ئاوێتەی دڵ

## "الفوائد"

نووسینی

ابن قيم الجوزية

وەرگێڕان و پوخت کردنی

فەرمان عزیز نەجار

ناریـن



ناوی کتێب بەعربـــــی: الفوائد
نوسینـــــــــــــی: إن قيم الجوزية
ناوی کتێب بە کـــوردی: ئاوێتەی دڵ
وەرگێڕانـــــــــــی: فرمان نجار
نەخشەسازی نـــاوەوە: شنۆ حمدامین
نۆرە و ساڵی چـــاپ: (٢٠١٠) چاپی دووەم
ژمارەی سپـــــاردن: ژمارەی سپاردن: (٦٥٢)ی ساڵی (٢٠٠٥)ی پــێ دراوە.

ISBN 9953-85-240-5

نارین
هەولێر - چوارڕیانی شێخ محمودی حەفید
بازاڕی زانست بۆ کتێب و چاپەمەنی
ژ. ت/ ٢٥١١٩٨٢ ٦٦(٠٠٩٦٤)
Website www. nareenco.com
E_ mail: nareen@nareenco.com

# پێشـــەکی وەرگـێڕ

إنّ الحمد لله نحمده و نستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيّئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضلّ له، ومن يضلل فلا هادي له، أشهد أنّ لا إله إلا ألله وحده لا شريك له، وأشهد أنّ محمداً عبده و رسوله، أما بعد:

مرۆڤ پێك هاتووە لە لاشە و ڕۆح، گیاندارانی تریش تەنها پێك هاتوونە لە لاشـە و لایەنی ڕۆحیان نیە، ئەوە تەنها مرۆڤە لایەنی ڕۆحی هەیە، مرۆڤ چۆن پێویستی بـە تێرکردن و ئاسوودەکردنی لاشەی هەیە، بە هەمان شێوەش پێویستی بە تێرکردن و ئاسوودەکردنی ڕۆحـی هەیـە، ئەگـەر تـەنها بایـەخ بـە تێرکردنـی لاشـەی بـدات و پێویستی ڕۆحی وازلێ بێنێت، ئەوە ناتوانێت وەك مرۆڤێکی ئاسایی بـژیت، چونکە خۆی لە قاڵبی مرۆڤایەتی دەرهێناوە و چۆتە ڕیزی گیاندارانی تر کە پێویستیان بـە لایـەنی ڕۆحـی نیـە، ئـەوکات نـاتوانێ وەك ئـاژەڵیش بـژیت لەبـەر ئـەوەی ئـاژەڵ پێویستی بە لایەنی ڕۆحی نیە، بۆیە ئەو مرۆڤە بەردەوام لە نیگەرانی و دڵ تەنگی و دڵــە ڕاوکێ دادەبێت نازانێت چی بکات ئینجا بۆ ئەوەی خۆی لەو نەهامەتیـە ڕزگـار بکات خـۆی دەکوژێت، ئـەوە حـاڵی ئـەو کەسـانەیە کـە لایـەنی ڕۆحیـان فـەرامۆش کردووە، جا ئاسوودەکردنی ڕۆح بە پاککردن و چاکردنی دڵ دەبێت، چونکە ئەگـەر دڵ پاك و باش بوو، ئەوە هەموو ئەندامەکانی لاشەی مرۆڤ چاك دەبن، بـەڵام ئەگـەر دڵ خـراپ بـوو، ئـەوە هـەموو ئەندامـەکانی خـراپ دەبێـت، وەك پێغەمبـەرﷺ دەفـەرمووێ: (( وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً، إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، ألاَ وَهِيَ الْقَلْبُ ))[1]، واتــە: لـە نـاو لاشـەی مـرۆڤ پارچـە گۆشـتێك هەیـە، ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە باش و چاك بوو، ئـەوە هـەموو ئەندامـەکانی لاشـەی مـرۆڤ باش دەبێت، بەڵام ئەگەر ئەو پارچە گۆشتە خراپ بـوو، ئـەوە هـەموو ئەندامـەکانی

(١) صحيح: رواه البخاری و مسلم.

خراپ دەبێت، ئەو پارچە گۆشتەش دڵــە.

بەڵـێ: دڵ نەخۆش دەکەوێت هەر وەك چۆن لاشـە نـەخۆش دەکـەوێت، شـیفا و دەرمانەکەشی تەوبە و پەشیمانیە، دڵ ژەنگ و لێڵ دەبێـت هـەر وەك چۆن ئاوێنـە لێڵ دەبێت، پاك بوونەوەکەشی بە زیکری خوایە، دڵ ڕووت دەبێـت هـەر وەك چـۆن لاشە ڕووت دەبێت، پۆشاکەکەشی تەقوایە، دڵ تێنی و برسی دەبێت هەر وەك چۆن لاشــەی مــرۆڤ برســی و تــێنی دەبێــت، خــواردن و خواردنەوەکەشــی ناســین و خۆشویستن و تەوەکول و گەڕانەوەیە بۆ لای خوای گەورە.

جا بۆ پاککردنەوەی دڵی خۆم ودڵی ئێوەش ئەو کتێبە نایابـەم هەڵبـژاردووە کـە ئەگـەر خوێنـەر بـە دڵێکـی ئامـادەوە بیخوێنێتـەوە، ئـەوە بابەتـەکانی لـەم کتێبـە باسکراوە لەگەڵ دڵی ئاوێــتە دەبێت و هەست دەکات دڵـی ئـاو داوە بـە شـتێك کـە پێویستیەتی، ئەم کتێبە کـە عەرەبیەکـەی نـاوی ((الفوائـد))ە بەشـاهێدی زانایـان یەکێکـە لـەو کتێبـە نایابانـەی لـەم بارەیـەوە نووسـرابێت، دەبینـین زۆربـەی ئـەو نووسـەرانەی دەربـارەی ئاسـوودەیی دڵ شـتیان نووسـیوە سـوودیان لـەم کتێبـە بینیوە، بەڵام مـن نـاوی کتێبەکـەم نـاوە ((ئاوێــتەی دڵ)) چـونکە مـرۆڤ لـە کـاتی خوێندنەوەیدا دڵی ئاوێتـەی بابەتەکانی دەبێـت، بەڕاسـتی مـن لـە وەرگێڕانـی ئـەم کتێبـە زۆر شـتی نایـاب فێربـووم و سـوودم لێ بینـی، ئومێـد دەکـەم ئێـوەش لێـی سوودمەند بن، واخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

فەرمان عزیز نەجـار
najar_ır@maktoob.com
١٤٢٩/٦/٢٥.ك
٢٠٠٨/٦/٢٩.ز
ـ هەولـــێر ـ

# کورتەیەك لە ژیانی (ابن القیم)[١]

**ناو و نەسەبی:**

ئەم بەڕێزە ناوی(محمد)ی کوڕی(ابی بکر)ی کوڕی(ایوب)ی کوڕی(سعد)ی کوڕی(حریز الزرعی الدمشقی)یە، لەقەبەکەشی (شمس الدین)ە کونیەکەشی (ابوعبدالله)یە، بەڵام ئەم بەڕێزە ناسراوە بە (ابن قیم الجوزیة).

(الجوزیّة) قوتابخانەیەك بووە کە باوکی (ابن القیم) بەڕێوەبەرێکی چالاکی ئەم قوتابخانەیە بووە بە جۆرێك زۆر بە چاکی کاروباری ئەم قوتابخانەی بەڕێوەبردووە و هەڵی سوڕاندووە، هەر بۆیەش ناوی کوڕەکەیان بردووە بە (ابن القّیم)، واتە: کوڕی بەڕێوەبەرە چالاکەکە.

**لە دایك بوونی:**

ئەم بەڕێزە لە (٧)ی (صفر)ی ساڵی(٦٩١) ی کۆچی لە (دمشق) لە خانەوادەیەکی ئاین پەروەر لە دایك بووە، ئەم بەڕێزە لە خانەوادەیەکی پڕ لە زانست و نەجیب زادە پەروەردە بووە، هەر بۆیەش زۆر تامەزرۆی زانست و زانیاری بووە و بەردەوام هەوڵیداوە لە هەموو بوارێکدا زانست بە دەست بهێنێت، بە تایبەتی زانستە عەرەبی و شەرعیەکان، تاکو وای لێهات لەم بوارەدا بوو بە زانا و (مفتی)یەکی پایە بەرز.

---

(١) بۆ ژیان نامەی (ابن القیم) بڕوانە ئەم کتێبانە:
یەکەم: (ذیل طبقات الحنابلة) دانراوی (ابن رجب ) (٥\٤٤٧ ـ ٤٥٢).
دووەم: (البدایة والنهایة) دانراوی (ابن کثیر) (٧\٦٥٧ ـ ٦٥٨).
سێیەم:(شذرات الذهب) دانراوی (ابن العماد) (٦\١٦٨ ـ ١٧١).
چوارەم:(الدررالکامنة) دانراوی (ابن حجر) (٣\٤٠٠ ـ ٤٠٣).

## مامۆســـتاکانی:

(ابن قيم) لەلای ئەم بەڕێزانەی خوارەوە زانستی وەرگرتووە:

زانستی عەرەبی لەلای (مجدالدين ابي بكر محمد المرسي) و (محمد بن ابي الفتح البعلـي) و (مجدالـدين اسماعيـل بـن محمـد المرانـي) خوێنـدوە، زانـستی (اصـول) و (فقــه)ی لــەلای (ابــن تيميــة)ە خوێنـدوە، زانـستی حەديـسی لـەلای (زيـن الـدين الشيرازی)و(صدر الدين الدمشقي)و(تقي الـدين المقدسـي)و(عيـسى بـن عبـد الـرحمن الحنبلـي)و(فاطمـة بنـت ابـراهيم البطـائحي) خوێنـدوە، چەندين مامۆسـتای تريـشی هەبووە کە ئێمە لێرەدا ناومان نەهێناوە.

## قوتابییەکانی:

قوتابییەکانی زۆرن هێندێك لەوانـە:

یەکەم: (ابن رجب الحنبلي).

دووەم: (ابن کثـــــير).

سێیەم: (ابن عبدالهــادی).

چوارەم: (شمس الدين محمد النابلسي)

پێنجەم: (ابراهيم)و (عبدالله)ی کوڕی.

ستایشی زانایان لە بارەیەوە:

زۆرێك لە زانایان مەدحیان کردووە لەوانـە:

* (ابن کثير) دەفـەرمووێ: ئەم بەڕێزە شەو و ڕۆژ سەرقاڵی - نوسين و خوێندن و بەندايەتـی - بوو، زۆر نوێژی دەکردوو و زۆر قورئـانی دەخوێنـدەوە، ڕەوشـتی زۆر جوان بوو، دڵی زۆر ساف بوو، حەسوودی بەکـەس نـەدەبرد، بڕواناکـەم کـەس لـەو سەردەمەی ئێمە هەبووبێت بەندايەتی لەو زياتر کردبێت.

* (ابن رجب) دەفـەرمووێ: کەسم نەبینی لەو زاناتربێت، نەم بینیوە کـەس وەك ئەو شارەزایی هەبێت لە قورئان و سووننە و ڕاستەقینەکانی ئیمـان، مـن نـاڵێم ئـەو (معصوم)ە، بەڵام پیاوی وەك ئەوم نەبینیوە.

* (القاضي برهان الدين الزرعي) دەفـەرمووێ: لە سـەردەمی خۆیدا کەسـی لـەو زانا تر نەبوو.

* (ابن حجر العـسقلاني) دەفــەرمووێ: بەڕاسـتی ئـەم بـەڕێزە کابرایـەکی زانـا و لێزان بووە، کە شارە زایەکی چاکی بە خیلافی (مذهب)ەکان هەبووە.

* (مـلا علـي القـاري الحنفـي) دەفــەرمووێ: هـەر کەسـێك (منـازل الـسائرين)ی خوێندبێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە خۆی و مامۆستاکەی زۆر پابەند بوونە بـە (اهـل السنة و الجماعة) بۆت دەردەکەوێت کە ئەوانە وەلی ئەم ئومەتە بوونە.

## پیـــــشەکەی:

١. پێش نوێژی دەکرد لــــە (الجوزية).
٢. وتنەوەی وانەی شەرعی لە (الصدرية) و چەند شوێنی تر.
٣. نووسینی کتێب.
٤. دەرکردنی فتوای شیاو بۆ ئەو سەردەمەی لێ ی ژیـــاوە.

## بەرهەمەکانی:

بەرهەمــەکانی زۆرن بــەڵام ئێمــە لێــرەدا هێنــدێکیان دەژمێــرین لەوانــەی کــە چاپکراون:

١ـ زاد المعاد في هدي خير العباد.
٢ـ تهذيب سنن ابي داود.
٣ـ طريق الهجرتين و باب السعادتين.
٤ـ اعلام الموقعين عن رب العالمين.
٥ـ اغاثة اللهفان في احكام طلاق الغضبان.

٦ـ اغاثة اللهفان من مصايد الشيطان.

٧ـ بدائع الفوائد.

٨ـ الفوائد، ئەم كتێبەیە كە لەبەر دەستت دایە.

٩ـ التبيان في اقسام القران.

١٠ـ تحفة المودود باحكام المولود.

١١ـ تفسير سورة الكافرون و المعوذتين.

١٢ـ جلاء الافهام في الصلاة والسلام على خير الانام.

١٣ـ اجتماع الجيوش الاسلامية على غزو المعطلة و الجهمية.

١٤ـ حادي الارواح الى بلاد الافراح.

١٥ـ الـــروح.

١٦ـ روضة المحبين و نزهة المشتاقين.

١٧ـ شفاء العليل في مسائل القضاء و القدر و الحكمة و التعليل.

١٨ـ الصلاة و حكم تاركها.

١٩ـ الصواعق المرسلة على الجهمية و المعطلة.

٢٠ـ الطرق الحكمية في السياسة الشرعية.

٢١ـ عدة الصابرين و ذخيرة الشاكرين.

٢٢ـ الفروســـية.

٢٣ـ الفوائد المشوقة الى علوم القران و علم البيان.

٢٤ـ الكافية الشافية فى الانتصار للفرقة الناجية.

٢٥ـ مدارج السالكين بين منازل اياك نعبد و اياك نستعين.

٢٦ـ مفتاح دار السعادة.

٢٧ـ الوابل الصيب و رافع الكلم الطيب.

٢٨ـ الجواب الكافي.

٢٩ـ هداية الحيارى في اجوبة اليهود و النصارى.

٣٠ـ الرسالة التبوكية.

چەندین كتێبی تریشی هەیە، بەڵام چاپ نەكراون.

## وەفات کردنی:

پێشەوا (ابن القیم) ڕەحمەتی خوای لێبێت لە کاتی عیشا لە شەوی پێنج شەممەی(١٣)ی (رجب)ی ساڵی (٧٥١)ی کۆچی وەفاتی کردوە، دوای نیوەڕۆ لە مزگەوتی (الاموي)، پاشان لە مزگەوتی (جراح) نوێژی لەسەر کرا، لە گۆڕستانی (الباب الصغیر)یشدا نێژرا کە خەڵکێکی زۆر ئامادەی جەنازەکەی بوون.

## ســوود وەرگرتن لە قورئان[1]

ئەگەر دەتەوێت سوودمەندبیت لە قورئان، ئەوە لە کاتی خوێندن و گوێ گرتن بۆی، بیر و هۆشت کۆکەرەوە و بەدڵ گوێ ی بۆ بگرە، ئەوسا بە دڵ و هۆشەوە ئامادەی بە، وەك ئەوەی کە خوای گەورە ئەم ئایەتانە ڕاستەوخۆ ئاڕاستەی تۆ دەکات، چونکە ئەم قورئانە پەیامی خوای گەورەیە بۆ تۆ، کە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی کە محمدەﷺ ڕایگەیاندوە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ (ق:٣٧)، واتـــــە: بێگومان لەم بەسەرهاتانەدا کاریگەری و بیرخستنەوە هەیە بۆ کەسێك کە دڵێکی زیندووی هەبێت، یان بەدڵێکی ئامادەوەگوێ بگرێت بۆ قورئان.

جا ئەم قورئانە لەکاتێکدا کاریگەری تەواوی خۆی لەسەر مرۆڤدا دەبێت، ئەگەر ئایەتەکان شوێنی نیشتنەوەیان هەبێت ـ کە دڵ نیشتنەوەی ئایەتەکانە ـ ئامرازی وەرگرتنی ئایەتەکانیش هەبێت ـ کەگوێ گرتن و خوێندنەوە ئایەتەکانی قورئانە هیچ بەربەستێکیش نەبێت لە سوودمەندبوون لێی ـ کەبێ ئاگاییە لە قورئانـ جا

---

(١) خوێنەری بەڕێز: ئەگەر دەتەوێت سوودمەند بیت لەو کتێبە، ئەوە بە وردی و بە تێگەیشتنەوە بیخوێنەوە.

ئەو ئایەتەی پێشوو ئەم خاڵانەی هەموو لە خۆ گرتوە، کە زۆر بە جوانی و بەکورتی ڕونیان دەکاتەوە و دەیان گەیەنێتە سەر مەبەست.

کـــە دەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ﴾ (ق:٣٧)، واتـــە: بێگومـــان لـــەم بەسەرهاتانەی قورئاندا کاریگەری و یادخستنەوە هەیە.

ئەمە ئامەژەیە بۆ ئەو ئایەتانەی کە پـێش ئـەم ئایەتـە باسـکراوە لـە سـەرەتای سورەتەکە تا ئێرە، ئائەم بەسەرهاتانە کاریگەری هەیە.

کە دەفـەرمووێ: ﴿لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ﴾(ق:٣٧)، واتـە: کاریگەری هەیە بۆ کەسێك کە دڵێکی زیندووی هەبێت.

ئەمەش شوێنی نیشتنەوەی ئایەتەکانە کە دڵە، مەبەستیش بە دڵ، دڵی زیندووە کە بیر بکاتەوە، هەر وەك خوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا﴾ (یـس٦٩ـــ ٧٠)، واتـــە: ئـەم قورئانـە یادخەرەوەیـە و قورئانێکی ڕوون و ئاشکرایە، ئەم قورئانە بۆ ئەوەیـە ئەوکەسانە بێداربکاتـەوە کـە دڵ زیندوون، کـە دەفـــەرمووێ: ﴿وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ (ق:٣٧)، واتـــە: دڵ ئامـادە و بـە ئاگایە لە کاتی خوێندن و گوێ گرتنی قورئان.

(ابن قتيبة) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفـەرمووێ: ﴿وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ واتـە: کـە گوێ دەگرێت بۆ کتێبی خوا ـ کە قورئانەـ دڵی ئامادەیـە و بـیر و هۆشـی لەوێیـە، بێ ئاگانیە لێی.

ئەوە ئامـاژەیە بۆ ئەو بەربەستەی، کە ڕێگرە لەو کاریگەر بوونە بە قورئان، ئـەم بەربەستەش بێ ئاگای دڵ و تێڕانەمانی ئایەتەکانـە بـە بـیر و هۆشـەوە، جـا ئەگـەر کاریگەریەکە چەنگ کەوت کە قورئانە، شوێنی ئایەتەکانیش چەنگ کەوت کە دڵێکی زینـــدووە، ئـــامرازی وەرگـــرتنی قورئـــانیش چـــەنگ کـــەوت کـــە گـــوێ گـــرتن و خوێندنەوەیەتی، هیچ بەربەستێکیش نەبوو لە سوودمەندبوون لێی کەبێ ئاگای دڵ و ڕوو وەرگێڕانـە لێـی بـۆ شـتێکی تـر، ئـەوکات بەڕاسـتی قورئـان کاریگـەری خـۆی

دەبێت و ڕۆڵی خۆی دەبینێت و مرۆڤەکەش بەهرەمەند دەکات.

ئەگەر گوترا: باشـە ئەگەر مرۆڤ بەم خاڵانە لە قورئـان سوودمەند دەبێـت، بۆ ئامرازی (أَوْ) لەم ئایەتەدا ﴿أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ە بە کار هاتووە؟! لە کاتێکدا ئەم شوێنە شوێنی (واوالجمع)ە نەك شوێنی (أَوْ) چونکە (أَوْ) لە نێوان دوو شتان بۆ مەبەستی یەکێکیان بەکاردێت؟!

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا گوتراوە: ئەمە پرسیارێکی زۆر جوانە و وەڵامەکەشی بەم جۆرەیە: ئایەتەکە بە ئامرازی (أَوْ) ئاڕاستەکراوە، ئەوەش بەگوێرەی حاڵی بانگ کراوەکەیە، چونکە هێندێ کەس هەیە، کە دڵی زیندوو و بە ئاگایە و فیترەت پاك و تەواوە، جا ئەگەر بە دڵ بیری کردەوە و بەفیکری خۆی ڕوانی، ئەوە دڵ و عەقلی ڕاستی و دروستی قورئانی بۆ دەسەلمێنێت.

جا نیشتنەوەی ئایەتەکان لەسەر دڵی، کامەرانی دەکات و دەبێت بە ڕۆشنایی بۆی کە دەکاتە ڕۆشنای لەسەر ڕۆشنایی فیترەت، ئەوەش وەسفی ئەو کەسانەیە کە دەرحەقیان گوتراوە: ﴿وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ﴾ (سبأ:٦)، واتە: ئەوانەی زانیاریان پێدراوە چاك دەزانن ئەوەی کە لەلایەن پەروەردیگارتەوە بۆت ڕەوانەکراوە حەقە.

هەروەها دەرحەقیان گوتراوە: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ ۖ ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ ۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِىٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ ۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ ۗ يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ (النور:٣٥)، واتە: خوای گەورە نور و ڕووناکی ئاسمانەکان و زەویە، نموونەی نورەکەشی وەك تاقێك وایە کە چرایەکی تێدابێت، چرایەکەش لە ناو شووشەیەك دابێت، شووشەکەش وەك هەسارەیەکی پرشنگدار وابێت، کە داگیرساوە لە ڕۆنی بەفەڕی زەیتوون، نە ڕووی لە ڕۆژهەڵاتە نە ڕووی لە ڕۆژئاوایە، ڕۆنەکەشی

خەریکە خـۆی دابگرسـێت و ڕووناکی بداتـەوە، ئەگەرچـی ئـاگریش نـەیگاتێ، ئـەم قورئانە نوری وەحیە لەسەر نوری فیترەت، خـوای گـەورەش ڕێنمـای ئـەو کەسانە دەکات کە دەیەوێت و شایستەن بۆ نورەکەی.

بەڵێ: ئەمە حـــــاڵ و گوزەرانی دڵی زیندوو و بە ئاگایە.

(ابن قيم) دەفـەرمووێ: لـە کتێبی اجتماع الجيوش الاسلامية على غزو المعطلة و الجهمية دا باسی ئەم ئایەتەمان کردووە، کە چ نهێنی و حیکمەتێکی لە خۆگرتوە.

جـا خـاوەنی دڵـی زینـدوو، دڵـی بـەجۆرێك لەگـەڵ ئایەتـەکانی قورئانـدا تێکـەڵ دەبێت، هەر وەك ئەوە وایە کە لەسەر ڕووپەری دڵیدا ئایەتـەکان نووسـرابێت، هـەر کاتێکیش بیـەوێت لەسـەر ڕووپـەری دڵیدا دەیخوێنێتـەوە، هێنـدێ کەسـیش هەیـە ئامادەییەکی تەواوی نیە، دڵی هۆشیار نیە، ژیانی کامڵ نیـە، ئەمـەیان پێوسـتی بـە جیهان بینیە، کە ڕاستی و ناڕاستی بۆ جیابکاتەوە، چونکە دڵی نەگەیشتۆتە پلـەی دڵی زیندووی هۆشیار، جا ئەم مرۆڤە بۆ گەیشتن بە هیدایەتی خوا، پێویستە بـە دڵ گوێ بۆ پەیامی خـوا بگرێت لـە ماناکـانی ووردبێتـەوە، ئـەوکات دەگاتـە دڵنیـایی، بۆشی ڕوون دەبێتەوە، کە ئەم پەیامە ڕاست و دروستە.

مرۆڤی یەکەم: وەك ئەو کەسە وایە کە شتێکی پێ ڕابگەیـەنن، کـە شـتەکەی بـە چاوی خۆی بینیبێت، ـ ئەم جۆرەیان ـ گەیشتووە بە پلەی ئیحسان.

مرۆڤی دووەم: وەك ئەو کەسە وایە کە شتێکی پێ ڕابگەیـەنن، کـە شـتەکەی بـە چاو نەبینیوە، بەڵام دڵنیایە کە هەواڵدەرەکـە ڕاسـت دەکـات و هەواڵەکـەش ڕاسـتە بۆیـە دەڵێت: هەواڵەکەی بە ڕاست دەزانم ـ ئەم جۆرەیان ـ گەیشتووە بـە پلـەی ئیمان، پلەی (علم اليقين)نیان بڕیـوە، واتـە: دڵیـشی بـەرەو (عـين الـيقين) دەڕوات، ئەم جۆرەیان بڕوایەکی پتەوی هەیە کە ئەو بڕوایە دەری دەهێنێت لە بازنەی کـوفر بۆ بازنەی ئیسلام، (عين اليقين)یش: کە جۆری یەکەمە.

دووجـۆرە: جۆرێکیـان لـە دنیادایـە واتـە: لـە دنیـادا بـە چـاوی دڵ ڕاسـتیەکان دەبینێت، جۆرێکیشیان لە دواڕۆژدایە واتە: لە دواڕۆژدا بـە چـاوی سـەر ڕاسـتیەکان دەبینێت.

جا ئەو(عین الیقین)ەی لە دنیادایە پەیوەستە بە چاوی دڵـەوە، هـەر وەك چۆن شایەتی دان لەسەر شتێك پەیوەستە بەبینینی چاوەوە.

بـەڵام (عـین الـیقین) لـە دوارۆژدا، پەیوەسـتە بـەو هەواڵـە غەیبانـەی کـە پێغەمبەران(علیهم السلام) ڕایان گەیاندووە، لە ڕۆژی دوایدا بە چـاوی سـەر ڕاستی ئەو هەواڵانە دەبینرێت، لە دنیاشدا بە چاوی دڵ ڕاسـتیەکان دەبینـرێـت، ئـەوە هـەر دوو جۆرەکەی (عین الیقین)ە

# بنچینە ئیمانیانیەکان لە سورەتی ( ق ) دا

سورەتی (ق) چەندین بنچینەی ئیمانی لە خۆگرتووەو کۆیکردۆتـەوە، کە بەسـە بۆ کەسێك بیەوێت بەهرەمەندبێت لەم سوورەتە، شیفادەریشە بۆ دڵێك کـە بیـەوێت دڵی زیندوبێتەوە..

ئەم سورەتە ئەو خاڵانەی لە خۆگرتووە:

دروســـت کردنـــەوەی مـــرۆڤ، پەیمانـــەکانی ڕۆژی دوایـــی، ڕوون کردنـــەوەی یەکتاپەرستی، ڕوون کردنەوەی گوزەرانی پێغەمبەران، ئیمان بە مەلائیکـەت، بـەش کردنی خەڵکی بۆ دووبـەش مرۆڤـی دۆڕا و سـەرکەوتوو، باسـکردنی سـیفاتە بـەرز و بڵندەکانی خوای گەورە بە دوورگـرتنی لـە هـەموو کـەم وکورتیـەك، لـەم سـورەتەدا باسـی دووقیامـەت کـراوە، قیامـەتی بـچووك‌و قیامـەتی گـەورە، باسـی دوو جیهـان کراوە، جیهانی گەورە کە جیهانی دوا ڕۆژە، جیهـانی بـچووك کـە جیهـانی دنیایـە، لەم سـورەتەدا باسـی دروسـت کردنـی مـرۆڤ و مردنـی و زینـدوو کردنـەوەی کـراوە، باسکردنی ئەو ساتەی کە مرۆڤ دەمرێت و زیندوو دەکرێتـەوە، باسـکردنی ئاگـاداری خـوای گـەورە بـەم مرۆڤـە لـە هـەموو بوارێکـدا، بـەڵکو بـە ئاگایـە بـە(وسـوس)ەی ناودڵیشی، هـەر ووتەیـەکی لـە زمـان دەرچـێت ئـەوە تۆمـار دەکـرێ و ڕۆژی دوایـی لێپوسینەوەی لەسەر دەکرێ، هەموو مرۆڤێك دوو کەسی لە گەڵدایە، یەکێکیان پاڵی پێوە دەنێت و ئامادەی دەکات بۆ لێپرسینەوە، ئـەوەی تریـشیان شـایەتی لەسـەر دەدات، جا کاتێك پاسەوانەکە مرۆڤەکە ئامادە دەکـات دەڵێـت: ﴿هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ﴾ (ق:٢٣)، واتـە: خودایە ئەوە ئەو کەسەیە کە فـەرمانت دابـوو ئامـادە بکرێـت، ئـەوە هێناومە و ئامادەم کردووە.

جا لەوکاتەی ئـەو مرۆڤـە ئامادەیـە دەگوتـرێ: ﴿أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ﴾ (ق:٢٤)، واتـە: هەموو کافرێکی ڕقەکار فڕێ دەنە ناو دۆزەخ.

ئەم نمـوونەیە وەك ئەوە وایـە کـە مرۆڤێکـی تاوانبـار بێننـە خزمـەت پاشـایەك و بڵێـن: قوربان ئەوە تاوانبارەکە ئامادەیە، پاشـاش بڵێـت: بیبـەن بـۆ بەندیخانـە بـە

گوێرەی تاوانەکەی سزای بدەن.

بڕوانە ئەم سورەتە چۆن ئەوە ڕۆشـن دەکاتـەوە کە خـوای گـەورە خـودی ئـەو لاشە لە ناوچووانە زینـدوو دەکاتـەوە، جـا ئەگـەر شیاوی پاداشـت بێت، پاداشـتی دەکات، ئەگەر شیاوی سـزاش بێـت، سـزای دەدات، وەك ئـەو ڕۆحـەی کـە ئیمـانی هێناوە پاداشت دەکرێت، ئەو ڕۆحەش کە کافر بووە سزا دەدرێت، بـەم جـۆرە نیـە کە دەڵێـن: خوای گەورە ڕۆحێکی تر جگە لەم ڕۆحە دروست دەکات، جا ئەو ڕۆحـە پاداشت دەکات و سـزا دەدات، هـەر وەك ئەوانـەی شـارەزایەکی تـەواویان نیـە بـەو زیندووکردنەوەی کەوا ڕایان گەیاندووە، کەوا گومان دەبەن خوای گەورە لاشـەیەکی تر جگە لەم لاشە لە ناوچووە دروسـت دەکـات، جـا پاداشـت و سـزای ئـەم لاشـەیە دەدات، ئەوانە بۆچوونیان وایە کە خوای گەورە ڕۆحێکی تازە بەدی دەهێنێت، نەك ئەو ڕۆحەی پێشوو زیندوو بکاتەوە، بەڵکو لاشـەیەکی تـازە بـەدی دەهێنێـت، نـەك ئـەو لاشـەی پێـشوو دروسـت بکاتــەوە، ئـەم بۆچـوونەش پێـچەوانەی ئەوەیـە کـە پێغەمبـەران لەسـەری کـۆکن، پێـچەوانەی قورئـان و حـەدیس و هـەموو پەرتووکـە ئاسمانیەکانە، ئەم بۆچوونە لە ڕاستیدا دان نەهێنانە بە زیندوو بوونەوە، بەڵکو ئەم بۆچوونە وەکو بیروباوەڕی ئەوانە وایە کە زینـدوو بوونـەوە بـە درۆ دەزانـن، ئەوانـە بڕوایان بەوە هەیە کە خوای گەورە تeveryanyی هەیە بـۆ بـەدی هێنـانی لاشـەیەکی تـری تـازە لـە بـاتی ئـەم لاشـە لـە بـەین چـووانە، ئینجـا ئـەم لاشـانە سـزابدا و پاداشـت بکات،کە وابوو ئەوانە چۆن بڕوا بەوە ناکەن کە خـوای گـەورە توانـای هەیـە خـودی ئەو لاشانەی پێشوو کە لە ناوچوونە زیندوو بکاتەوە !

لە کاتێکدا کە بەچاوی خۆیان ـ لە دنیادا ـ دەبینن خوای گەورە لە هەموو کـات و سـاتێکدا لاشـەیەك بـەدی دەهێنێـت و ڕۆح و ژیـانی بـە بـەردا دەکـات و زینـدووی دەکات، چۆن سەیریان پێ دێت کە بە چاوی خۆیان ئەمە دەبینن! ئەوانە سـەیریان بەوە دێت خوای گـەورە زینـدوویان بکاتـەوە دوای ئـەوەی کـە ئێـسك و پروسـکیان بووە بە خۆڵەمێش، ئینجا لێ پرسینەوەیان لە گەڵدا بکات؟ جا بۆیە دەڵێـن: ﴿أَءِذَا

مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴾ (الصافات:١٦)، واتـە: ئەگـەر ئێمە مـردین و بووینـە خاك و ئیسك، ئایا زیندوو دەکرێینەوە؟ دەڵێـن: ﴿ذَٰلِكَ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ ﴾ (ق:٣)، واتـە: ئەم زیندوو بوونەوە شتێکی دوورە لە ڕاستیەوە.

کەوابوو بەدیهێنانی لاشەیەکی تری تازە لە باتی ئـەم لاشە لـە ناوچـووانە پێـی ناگوتـرێ: (بعث) زیندووکردنەوە، پێی ناگوتـرێ: (رجع)گێڕانـەوەی جـاری دووەم، بەڵکو پێی دەگوتـرێ: بەدیهێنان لە نەبوونەوە، ئەم ئایەتەش مانای تەواوی نـەدەدا ئەگەر وابا: ﴿قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ ٱلْأَرْضُ مِنْهُمْ ﴾ (ق:٤)، واتـە: بێگومـان ئێمـە دەزانـین کاتێك کە مردن زەوی وردە وردە لاشەیان دەکاتەوە بە خاك.

چـونکە خـوای گـەورە ئەمـەی کـردووە بـە وەڵامێـك بـۆ پرسـیارێکی نادیـار، پرسیارەکەش ئەوەیە، ئایا بەشەکانی ئەو لاشەیە کۆدەکاتەوە کەبووە بەخاك؟ جا خـوای گـەورە پێیـان ڕادەگەیـەنێت، کـە ئاگـادارە زەوی گۆشـتو ئێسکی کـردوون بەخاك.

کـەوابوو چۆن ئاگادارە بە بەشەکانی لاشـەیان، بـە هـەمان شـێوەش بـە توانایـە لەسەر کۆکردنەوەو دروست کردنەوەی لاشەکانیان بۆ جاری دووەم، خـوای گـەورە بە دەرخستنی دەسەڵاتو حیکمەتو زانستی ڕاستو دروستی خۆی زیندوو بوونـەوە دەسەلمێنێت، جا ئەوانەی بڕوا بە زیندوو بوونەوە ناکەن سێ گومانیان هەیە:

یەکـەم: تێکـەڵ بـوونی بەشـەکانی لاشـە لەگـەڵ زەویـدا بـە جۆرێـك مرۆڤێك لـە مرۆڤێکی تر جیا ناکرێتەوە.

دووەم: ئەم کارە ئاستەمە و کەس توانای بەسەردا نیە.

سـێیەم: ئـەم زینـدوو کردنەوەیـە هـیچ سـوودێکی تێـدا نیـە، بـەڵکو سـوود و حیکمەت لە بەردەوام بوونی ئەم ژیانە دایە کە نەوەیەك بمرێت و نەوەیەکی تر بێتـە شوێنی، بەڵام سوود و حیکمەت لـەوە دانیـە کـە ئـەو مرۆڤانـە بمـرن ئینجا زینـدوو بکرێنەوە.

# بەڵگەی زیندوو بوونەوەی ڕۆژی دوایی

ئەو بەڵگانەی کە لە قورئاندا هـاتوون لەسـەر ڕۆژی دوایـی، لەسـەر سـێ بنچینە دامەزراون:

یەکـەم: دەرخـستنی زانـستی پـەروەردگار لەمـەڕ نـەمانی لاشـەیان هـەر وەك دەفەرموێت لە وەڵامی ئەوانـەی دەڵێـن: ﴿قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ (٧٨) قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ﴾(یـس٧٨ ــ ٧٩)، واتــە: کـێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە کە بووە بە خۆڵەمێش ـ ئەی محمد ــ پێیـان بڵـێ: ئەو زاتەی کە یەکـەمجار بـەدی هێنـاوە، هـەر ئـەویش زینـدووی دەکاتـەوە، خـوای گەورە بە هەموو دروست کراوێك بە ئاگایە.

خـوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ (٨٥) إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ﴾(الحجـر:٨٥ــــ٨٦)، واتـــە: بێگومـــان ڕۆژی قیامـــەت بەڕێوەیە بە جوانی چاو پۆشی بکە، بەڕاستی پەروەدگارت بەدیهێنەرێکی شـارەزا و لێزانە.

دەفـــەرمووێ: ﴿قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡ﴾ (ق:٤)، واتـــە: بێگومـــان ئێمـــە دەزانین کاتێك کە مردن زەوی وردە وردە لاشەیان دەکاتەوە بە خاك.

دووەم: دەرخـــستنی توانـــا و دەســـەڵاتی بـــێ پایـــانی خـــوای گـــەورە کـــە دەفـــــەرمووێ:﴿أَوَلَيۡسَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۚ﴾ (یـس:٨١)، واتـە: ئایـا ئـەو خوایـەی کـە ئاسمانـەکان و زەوی دروسـت کـردووە، ناتوانێت دووبارە وەك خۆیان دروستیان بکاتەوە.

هـەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ﴾ (القیامـة:٤)، واتـــە: بـەڵێ توانامان هەیە کە نەخشە و وردەکانی سەر پەنجەکانی بەدی بهێنینەوە.

لە ئایەتێکی تر دەفـەرمووێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ (الحج:٦)، واتـە: بێگومـان هـەر خـوای گـەورە حەقـە، هـەر ئـەویش مردووان زیندوو دەکاتەوە، هەر ئەویش بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە.

خوای گـەورە لـەم ئایەتـەدا هـەر دوو سیفەتە مەزنەکـەی کـە زانست و توانایە پێکـەوە کۆکردۆتـەوە، هـەر وەك دەفـەرمووێ: ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ﴾(یس:٨١)، واتـە: ئایا ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە، ناتوانێت دووبـارە وەك خۆیـان دروستیان بکاتەوە؟! بەڵێ دەتوانێت چونکە خـوای گـەورە لـە دروست کردنـدا بـە توانا و زانایە.

سێیەم: دەرخستنی حیکمەتی بێ پایانی خوای گەورە، هەر وەك دەفـەرمووێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ﴾ (الدخان:٣٨)، واتـە: ئاسمانـەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە بە گاڵتە دروستمان نەکردوون.

هـــەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا﴾ (ص:٢٧)، واتـە: ئاسمان و زەوی و دروستکراوانی نێوانمـان بـێ هـودە و هەرەمـەکی دروست نەکردووە.

لە ئایەتێکی تر دەفـەرمووێ: ﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾ (القیامة:٣٦)، واتـە: ئایا ئادەمیزاد وادەزانێت هەروا وازی لێدەهێنرێت و لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت.

دەفـــــــەرمووێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ﴾ (المومنون:١١٥)، واتـە: ئایا گومانتان وایـە کـە ئێوەمـان بێ هودە دروست کردووە و ئێوە بۆ لای ئێمە ناگەڕێنەوە، بەرزی و بڵندی بۆ خوای گەورە، پاشای حـەق ـ لەم کارە بێ هودەیە ـ.

هـــەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ

ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾ (الجاثيـة:٢١)، واتـە: ئایا ئەوانەی کە گوناه و تاوانەکانیان ئەنجامداوە، وا دەزانـن هـەروەك ئەوانـە حیـسابیان بـۆ دەکـەین کـە ئیمانیـان هێنـاوە و کـاروکردەوە چـاکەکانیان ئەنجامداوە؟! ژیانی دنیا ومردن ودوای مردنیان وەك یەك دەبێت؟! ئای کە بڕیاری خراپ بڕیار دەدەن.

جا کـەوابوو ڕاستی ڕۆژی دوایی بە عەقل و شەرع سەلمێنراوە، وە ناو و سیفاتە بـەرز و بڵنـدەکانی خـوای گـەورەش ئـەم ڕاسـتیانە دەسـەلمێنێت، بێگومـان خـوای گەورە دوورە لەوەی کە دەڵێـن: توانای نیە دووبارە مرۆڤەکان دروست بکاتەوە.

جا پاشان خوای گەورە ڕایدەگەیەنێت کـە ئەوانـە چـونکە دژی ڕاسـتین، زینـدوو بوونەوەش بە ڕاسـت نـازانن ئـەوە سـەرگەردان بوونـە: ﴿فَهُمْ فِىٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ﴾(ق:٥)، واتـە: ئەوان بە هۆی ئەو گومانانەیانەوە لە سەرگەردانیدا دەژین.

پاشان خوای گـەورە بانگیـان دەکـات کـە سـەیری بیناسـازی و بـەرز و بڵنـدی و جوانی ئاسمان بکەن کە هـیچ کـەم و کـوڕی لێ نابینرێـت، بانگیـان دەکـات سـەیری زەوی بکەن کە چۆن ڕایخستووە و بڵاوی کردۆتـەوە وکێـوی لەسـەردا دامەزرانـدوە ولە هەموو جۆرە ڕوەکێکی جوان و ڕازاوەی جۆرا و جۆری تێدا ڕواندوە.

ئا ئەمانە هەر هەمووی ڕۆشـنکەرەوەی دڵــە، ئەگـەر بەنـدەی دڵ زینـدوو لێیـان وردبێتەوە، ئەوە یەکتاپەرستی و ڕۆژی دوای یاد دەکەوێتەوە کە پێغەمبەران پێیان ڕاگەیاندوە، ئەوکەسەی سەیری ئەم دروستکراوانە بکات و لێیان وردبێتەوە ئەمانەی بۆ ڕۆشن دەبێتەوە:

## یەکەم: دڵی ڕۆشن دەبێت.

دووەم: یەکتاپەرسـتی ڕاسـتەقینە و دواڕۆژی یـاد دەکەوێتـەوە، ئـەم پلەیـەش چنگی کەس ناکەوێت، جگە لەو کەسانە نەبێت کە بە دڵ و بـەکردەوە دەگەڕێنـەوە بۆلای ڕەزامەندی خوای گەورە، تەنها ڕەزامەندی خوای گەورەیان مەبەستە.

بەڵێ: پاشان خوای گەورە بانگیـان دەکات کـە سـەرنج بدەن و وردببنـەوە لـە تــوخمی ڕزق و خــۆراك و جــل و بــەرگیان و ئــامرازی گواســتنەوەیان و بــاخ و باخچەکانیان کە ئەمانە هەر هەمووی بە هۆی ئەو ئاوە بە فـەڕەوە بەرهـەم هـاتوون کە خوای گەورە لە ئاسمانەوە باراندوویەتیە خـوارەوە، کـە هـەر بـەهۆی ئەوەوەیـە چەندین باخ و باخاتی جۆر بە جۆر لە بەرووبوومی لە جۆری سپی و ڕەش و سوور و زەرد و شیرین و ترش دەڕوێنێت، وە دانەوێڵەی جۆراوجۆر لە شێوە و تـوخم و تـام دەڕوێنێت.

پاشان خوای گەورە ـ هەر لە سورەتی (ق)ـ بە تـەنها باسـی دار خورمـا دەکـات، چونکە دارێکی بە فەڕە و حیکمەتی زۆری تیایە کە شاراوە نیە لـەو کەسـەی لێـی ورد دەبێتـــەوە خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا﴾ (البقرة:١٦٤)، واتـە: خوای گەورە بەو ئـاوەی کـە لـە ئاسمانـەوە دەیبارێنێـت زەوی زینـدوو دەکاتـەوە، دوای و شـك بـوون و مردنـی. پاشـان دەفـەرمووێ: ﴿كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ﴾(ق:١١)، واتــە: بـە هـەمان شـێوە ئێـوەش دوای مـردن لـە خاکـدا زینـدوو دەکەینەوە و دێنە دەرەوە.

ئەم هاوشـێوەش زینـدوو کردنـەوەی مـرۆڤ و ڕووەك و وێنـەی ئەمانـەش، لەگـەڵ هێندێ نهێنی وحیکمەتەکانی لە کتێبی (المعالم)دا بەپێوەری قورئان باسمـان لێـوە کردووە.

پاشان خوای گەورە ـ هەر لە سورەتی (ق)دا ـ دێت زۆر بە جوانی و بـە کـورتی باسی گوزەرانی پێغەمبەران دەکات و ڕونی دەکاتەوە کە پێغەمبـەرانی نـاردووە بـۆ گـەلی (نـوح) و (عـاد) و (ثمـود) و (لـوط) و (قـوم فرعـون)، بـەڵام ئـەوان ئـەو پێغەمبەرانەیان بە درۆ خستۆتەوە و بڕوایان پێ نـەهێناون، بۆیـە خـوای گـەورە بـە هۆی ئەمەوە بە سزای جۆراوجۆر لە ناوی بردوون.

خوای گەورە دەرحەق بەم گەلانە پەیمانی خۆی بەجێ هێناوە کە لەسـەر زمـانی پێغەمبـەران پـێ ی دابـوون، ئـەویش ئـەوەبووە ئەگـەر ئیمـان نـەهێنن و دەسـت

هەڵنەگرن لە تاوان، ئەوکات لە ناویان دەبات.

بەڵـێ: ئەمە حاڵ و گوزەرانی پێغەمبەرانـە لەگـەڵ گەلـەکانیان، کـە پێغەمبـەری ئیسلام ـ محمد ـ بۆی باس کردووین، بەبێ ئەوەی هیچ مامۆسـتایەك ئەمانـەی فێـر کردبێت یان ژیان نامەیانی لە کتێبێکدا خوێندبێتەوە، بەڵکو بـە شـێوەیەکی دوور و درێــژ باسی لە گوزەرانی ئەم پێغەمبەرانە کردووە، بەو شێوەی کە لەلای جوولەکـە وگاورەکاندا باسکراوە.

جا هێندێ کەسی گەمـژە دەڵێـن: ئەمانـە شـتێکی ئاساییە کـە هۆیەکەشـی بـە زەمان وکەشـەوە بەنـدە، ئـەوەی ئـەو قـسە پووچـەڵانە دەکـات، خۆشـی دەزانێـت قسەکانی گەندەڵ و پووچە، چـونکە دان نـەهێنان بەمانـە، وەك ئـەوە وایـە کـە دان نەهێنێت بەو هەموو پادشا و زانایانەی ڕابووردوو.

## مانـــــای (العی)

پاشان خوای گەورە ـ هـەر لـە سورەتی (ق)دا ـ دیسان باسـی زینـدوو بوونـەوە دەکـات دەفــەرمووێ: ﴿أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ﴾ (ق:١٥)، واتــە: ئایا ئێمـە یەکـەمجار ئەم خەڵکەمان دروست کرد بێ توانا بووین لە دروست کردنی؟! ئەگەر کەسێك بـێ توانا بێت لەمەڕ کارێك ئەوە پێی دەڵێـن: (عيي به) واتــە: بـێ توانـا بـوو بەرانبـەر ئەم کارە.

وە دەڵێـن: (عيي فلان بهذا الامر) واتـە: فلان کەس بـێ توانـا بـوو بەرانبـەر ئـەم کـارە.

شاعیر دەڵێت:

عَيُّــــوا بِأَمْــرِهِم، كَمَــا   عَيَّــت بِبَيْـضَتِها الحَمامَـــة

واتــە: بێ توانا بوون بەرانبەر کارەکانیان، هـەر وەك کۆتر چـۆن بـێ توانایـە لـە بەرانبەر هێلکەکەی ـ لە کاتی هێرشی دووژمنەکەیدا

خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَلَمۡ يَعۡيَ بِخَلۡقِهِنَّ﴾ (الاحقاف:٣٣).

(ابن عباس) و (مقاتل) فەرموویانە: واتە: بێ توانا نیە لە دروست کردنیاندا.

ابن قیم، دەڵێت: ئەم تەفسیرە بەگوێرەی ووتەکەیە، ئەگینا لە ڕاستیدا لەوە فراوانترە، هەر وەك عەرەب دەڵێن: (اعیاني ان اعرف كذا) واتە: نەم توانی ئەو کابرایە بناسم، ئەگەر بێتوو دەم و چاوی نەبینێت و نەیناسێت.

دەڵێن: (اعیاني دواؤك) واتە: نەم توانی دەرمانەکەت بۆ بدۆزمەوە، ئەگەر بێتو چارەسەریەکەی نە دۆزییەوە.

کەوابوو: بەرانبەر مانای (عیي) ـ (العجز)ە واتە: بێ توانای، ئەو دێڕە شیعرەی، کە کردوویانە بە بەڵگەش، ئەم مانایە دەبەخشێ، چونکە کۆتر بێ توانانیە لە هەڵگرتنی هێلکە لە سکیدا، بەڵام ئەو کات بێ توانایە بەرانبەر هێلکەکەی کە دەیەوێت دایبنێت، بۆیە بەولاو ئەولادا دەگەڕێت تا شوێنێك بدۆزێتەوە هێلکەکەی لێ دابنێت، ئینجا کە داینا بێ توانایە بەرانبەر پاراستنی نازانێت چۆن بی پارێزێت، بۆیە لە شوێنك بۆ شوێنێکی تر دەیبات تا هێلانەیەکی بۆ دابین بکات، (الاعیاء) لەم ئایەتەدا بە مانای ماندوو بوون (التعب)نیە، هەر وەك هێندێ لەوانەی کە شارەزایەکی چاکیان لە تەفسیری قورئان نیە ڕایان وایە، بەڵکو مانای ماندوو بوون خوای گەورە لە کۆتایی سورەتەکەدا باسی کردووە و خۆی لێ بەدوور گرتووە کە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾ (ق:٣٨)، واتە: دوای دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی، هیچ ماندوویەتیەك ڕووی تێ نەکردین.

پاشان خوای گەورە ڕادەگەیەنێت کە ئەوانە: ﴿بَلْ هُمْ فِي لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ (ق:١٥)، واتە: ئەوانە لە گوماندان بەرانبەر بە دروست بوونەوەیەکی تازە.

پاشان خوای گەورە ئاگاداریان دەکاتەوە کە دروست کردنی مرۆڤ گەورەترین بەڵگە و نیشانەیە لەسەر دەسەڵات و پەروەردگاریەتی خوا، گەورەترین بەڵگەیە لەسەر زیندووبوونەوە، ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر یەکتاپەرستی و دوارۆژدا.

کەوابوو چ بەڵگەیەك لەم بەڵگە ڕۆشنتر هەیە لەسەر دەسەڵات و توانای خوای گەورە؟! کە ئەندام و ئێسك وگۆشت و دەمار و ئامێر و زانیاری و توانا، کە هەر

هەمووی خوای گەورە لە دڵوپە ئاوێکدا دروستی کردووە، ئەگەر مرۆڤ کەمێك بە دادپەروەرانە و وردبێتەوە لە خودی خۆی کە خوای گەورە بەچ شێوەیەکی جوان و رێك دروستی کردووە، ئەوکات بە هۆی ئەمەوە دڵنیا دەبێت لەو هەواڵانەی کە پێغەمبەران لە بارەی خوا و ناو و سیفاتەکانی خواوە ڕایانگەیاندووە.

پاشان خوای گەورە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە لە هەموو کات و ساتێکدا بە ئاگایە لە مرۆڤ، بەڵکو ئاگادارە کە چی بە دڵ و دەروونیاندا دێت، پاشان ئەوە دەردەخات کە بەهێز و زانست لە مرۆڤ نزیکە، وەك ئەو ڕەگە دەمارەی لەلاشەیدایە.

مامۆستای گەورەمان ابن تیمیه لە بارەی ئەم ئایەتەدا: ﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ﴾ (ق:١٦)، دەفەرمووێ: مەبەست بە(نحن)واتە: ئێمە بە مەلائیکەت لێی نزیکین ـ نەك زاتی خوا لێ ی نزیك بێت ـ هەر وەك دەفەرمووێ: ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾ (القيامة:١٨)، واتە:کاتێك جبریل قورئانی بەسەردا خوێندیت تۆش شوێنی بکەوە لەخوێندنەوەیدا.

ابن تیمیه دەفەرموێ: ئەم ئایەتەش کە دێت بەڵگەیە لەسەر نزیکی مەلائیکەت کە دەفەرمووێ: ﴿إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ﴾(ق:١٧)، واتە: دوو مەلائیکەت چاودێری مرۆڤ دەکەن.

کە خوای گەورە فەرمویەتی: ئێمە لە شاڕەگی دڵی لێی نزیکترین، ئا لێرەدا ئەو نزیکییەی بەستاوەتەوە بە نزیکی مەلائیکەت ـ نەك نزیکی زاتی خۆی ـ ئەگەر مەبەست بەم نزیکیە نزیکی زاتی خوا بایە، ئەوە خوای گەورە چاودێری کردنی مرۆڤی نە دەبەستاوە بە ئامادەبوونی دوو مەلائیکەت، کەوابوو ئەم ئایەتە هیچ بەڵگەیەکی تیا نیە بۆ (حلولي) و(معطلة)ە.

پاشان خوای گەورە ــ هەر لە سورەتی (ق)داــ باسی ئەوە دەکات کە دوو مەلائیکەت لەلای ڕاست وچەپی مرۆڤدا چاودێرە کە هەموو گوفتار و کردارێکی ئەم

مرۆڤە تۆمار دەکات، هەر وتەیەکیش لە دەمی ئەم مرۆڤـەدا دەربـچێت ئـەوە خێـرا یەکێك لەو مەلائیکەتانەی چاودێرە تۆماری دەکات لەسەر کردەوەکانی.

پاشان ـ هەر لە سورەتی (ق)دا ـ خوای گەورە باسی قیامەتی بچووك دەکات، کـە (سکرة الموت)ە واتـە: ئێش و ئازاری مردن، ئەمـەش ڕاسـتەقینەیەکە و هـەر هـەموو کەسـێك دەبێـت تـامی ئـەم مردنـە بـچێژێت، ئـەم مردنـەش گەیـشتنە بـە خـوا و بەرزبونەوەی ڕۆحە بۆ شوێنی خۆی، ئەم قیامەتە گچکەیەش دەسپێکی پاداشـت و سزای قیامەتی گەورەیە.

پاشان خـوای گـەورە باسـی قیامـەتی گـەورە دەکـات دەفـەرمووێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡوَعِيدِ﴾ (ق:٢٠)، واتــە: کـە فـوو کـرا بـە صـور، ئـیتر ئـەوە ڕۆژی پێشهاتنی هەڕەشە و ئاگادارکردنەوەکانە.

پاشان خوای گەورە باسی حاڵ و گوزەرانی خەڵکی دەکـات لـەو ڕۆژەدا کـە لـەو ڕۆژەدا هەر کەسێك دێتە خزمەت خوای گەورە مەلائیکەیەك بـە سـەرەوەیەتی ولێـی دەخوڕێت، مەلائیکەتێکیش شـایەتی لەسـەر دەدات، جگـە لەشـایەتی ئەندامـەکانی لاشەی خۆی کە لەو ڕۆژەدا شایەتی لەسەر دەدەن، جگە لـە شـایەتی زەویش کـە شایەتی لەسەر دەدات، وە شایەتی ئەو پێغەمبەرەی بۆی ڕەوان کراوە کـە شـایەتی لەسەر دەدات، بڕوادارانیش کە شایەتی لەسەر دەدەن.

بێگومان خوای گـەورە مەلائیکـەت و پێغەمبـەران و ئـەو شـوێنانەی کـە چاکە و خراپەیان لەسەر ئەنجامداوە، هەر هەمووی دەکات بەشـایەت لەسـەر مرۆڤدا، ئـەو ئەندامانەش کە مرۆڤ گونـاهی پـێ ئـەنجام داوە خـوای گـەورە لەسـەری دەکـات بـە شایەت، خوای گەورە بە تەنها بە زانستی خـۆی بەنـدەکانی سزانادات، ئـەوەش لـە کاتێکدا کە خوای گەورە دادپەروەری هەموو دادپەروەرانە.

پاشـان خـوای گـەورە ـ هـەر لـە سورەتی (ق)دا ـ ڕوونـی دەکاتـەوە کە ئـەو مەلائیکەتەی لە دنیادا کراوە بە چاودێر بەسەر مرۆڤـەوە، هـەموو کاروکردەوەکـانی دەنووسێت و دەفـەرمووێ: خوایە ئەو مرۆڤەی کـە پێـت سـپاردبووم لـە دنیـادا کـە

چاودێری بکەم، ئەوە هێناومە و ئامادەم کردووە، ئەم تەفسیرە ووتەی (مجـاهد)ە.

(ابــن قتیبــة)ش دەربــارەی ئــەم ئایەتــەدا ﴿هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ﴾ دەفـــەرمووێ: واتـە:خوایە ئەو کـارو و گفتارانـەی کـە کردوویـەتی هـەموویم لەسـەر نووسـیوە و وا لەلام ئامادەیە.

بەڵام لە ڕاستیدا هەردوو ماناکە لە خۆ دەگرێت، کە بەم شێوەیە: ئـەو مرۆڤـەی کە من چاودێر بووم لەسەری، ئەوە کار و گوفتارەکانیەتی کە هەموویم نووسیوە.

ئینجا ئەوکات دەگوترێ: ﴿أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ﴾ (ق:٢٤)، واتـە: فرێیدەنە ناو دۆزەخ. جا یان ئـەم دوو مەلائیکەتـەی کـە لێیـدەخوڕن و شـایەتی لەسـەر دەدەن، ئـەم فەرمانەیان پێ دەکرێت، یان ئەو مەلائیکەتەی کە سپاردراوە بە سـزادانی ئـەو ئـەم فەرمانەی پێ دەکرێت.

# شەش ڕەوشتی خەڵکی دۆزەخ

پاشان خوای گەورە هەر لە سورەتی (ق)دا باسی ڕەوشتی ئەو مرۆڤانە دەکات، کە دەچێتە دۆزەخەوە، کە شەش ڕەوشتیان لێ باس دەکات بەم شێوە:

یەکـەم: سـپڵەو کـافرە بەرانبـەر بـە بەخشـشەکانی خـوای گـەورە، کـافرە بـە یەکتاپەرستی و ناوو سـیفات و ئـاینی خـوا، کـافرە بـە پێغەمبـەران و مەلائیکـەتانی خوا، کافرە بە کتێبەکانی خوا و زیندوو بوونـەوە.

دووەم: کەللە ڕەقە و حەق وەرناگرێت و ڕەقەکاری لێ دەکات.

سێیـەم: ڕێگری چاکە و خێـرە، جـا ئـەم ڕێگـرتن لـە خێـر و چـاکەیە گشتیە، جیاوازی نیە ڕێگری خێر و چاکە بێت بۆ خودی خۆی وەك بەندایەتی کردنـی خـوا و نزیك بوونەوە لە بەخششی خوا، یان ڕێگری خێـر و چـاکە بێـت بـۆ خـەڵکی تـر، ئـا ئەمە نە خێری بۆ خـۆی هەیـە، نـە خێـری بـۆ خـەڵکیش هەیە، هـەر وەك زۆرینـەی خەڵکی وان.

چوارەم: لەگەڵ ئەوەی کە خێر و چاکە لە خـەڵکی قەدەغـە دەکـات، زیانیـشیان پێ دەگەیەنێت، کە بە زمانی و دەستی ستەمیان لێ دەکات و فرِوفێـڵ و تەڵەکـەیان لەگەڵ دەکات.

پێنجەم: (مریب)یشە، کە ـ گومانی لە ڕاستی ئیسلام هەیە ـ لەگەڵ ئەوەش چ شتێك گومانی تیابێت ئەو ڕووی تـێ دەکا و بـۆی دەچـێت، هـەر بۆیـەش گوتـراوە: فلانە کەس(مریب)ە ئەگەر کەسێکی گوماندار بێت.

شەشەم: لەگەڵ ئەوەی ئەم هەموو کارە قێزەونەشی هەیە(مشرك)یشە بـە خـوا، کە هاوبەشی بۆ خوا بڕیار داوە، لەگەڵ خوای گەورە یەکێکی تری کردووە بە خوا و لە شوێنی خوا دەیپەرستێ و خۆشی دەوێ، هەر کەسێکیش ڕقی لـەو شـتە بێتـەوە کە ئەو کردوویەتی بە خوا، ئەویش لێی تووڕە دەبێت، هەر کەسێکیش خوایەکـەی

ئەوی خۆش بووێت ئەویش خۆشی دەوێت، سوێند بە ناوی ئەو شتە دەخوات کە کردوویەتی بە خوا، دووژمنایەتی و دۆستایەتی خۆی لە پێناوی دەردەبڕێت.

جا ئەم مرۆڤە لە ڕۆژی دوایی مشت ومڕ دەکات لەگەڵ ئەو شەیتانەی کە چرپاندوویەتی بە گوێیا کە ئەو کارانە بکات، ئەو مرۆڤ شەیتانەکە تۆمەت بار دەکات بەوەی کە ئەو ئەم کارانەی پێ ئەنجام داوە، شەیتانەکەش دەڵێت: من ئەو توانا و دەسەڵاتەم نیە کە بە زۆر خەڵکی گومڕا و سەرگەردان بکەم، بەڵکو ئەو خۆی لە ناو گومڕایی و سەرگەردانیدا نقووم ببوو، خۆی گەندەڵی و خراپەی بەسەر حەق و کامەرانیدا هەڵبژاد، هەر وەك (ابلیس) لە دوا ڕۆژدا کاتێك فرێی دەدەنە ناو دۆزەخ خەڵکی دۆزەخیش ڕووی تێدەکەن پێی دەڵێن: بۆ وات بەسەر ئێمە هێنا ئەویش پێیاندەڵێت: ﴿وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ﴾ (ابراهیم:۲۲)، واتە: من هیچ دەسەڵاتم بەسەر ئێوەدا نەبوە کە گومڕاتان بکەم، من تەنها بانگم کردن کوفر و تاوان بکەن ئێوەش بە دممەوە هاتن و ئەنجامتاندا.

بەم شێوەیە ڕوون بۆوە کە ئەوەی لەگەڵی دایە شەیتانەکەیەتی، لە خزمەت خوای گەورە مرۆڤەکە و شەیتانەکە مشت و مڕ دەکەن، کۆمەڵێ لە زانایانی تریش فەرموویانە: بەڵکو ئەوەی مرۆڤەکە مشت ومڕی لەگەڵدا دەکات مەلائیکەتەکەیە، مرۆڤەکە تۆمەت باری دەکات بەوەی زیادی لەسەر نووسیوە، کە ئەو ئەوەندە کارەی ئەنجام نەداوە، تۆمەت باری دەکات بەوەی کە پەلەی کردووە لە نووسینی کارەکانی فەرامۆشی نەکردووە تاکو تەوبە بکات.

جا مەلائیکەتە کە دەڵێت: هیچ شتێکی زیادم لەسەر نەنووسیووە و پەلەشم نەکردووە لە نووسینی کارەکانی: ﴿وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ﴾ (ق:۲۷)، واتە: بەڵکو ئەو خۆی لە ناوگومڕایی وسەرگەردانیەکی دوور نقووم بوو.

خوای پەروەردیگاریش دەفەرموێ: ﴿لَا تَخْتَصِمُوا لَدَيَّ﴾ (ق:۲۸)، واتە: مشت و مڕ لە لای من مەکەن.

خوای گەورە لە سورەتی (الصافات)دا باسی مشت ومڕی کافر و شەیتان دەکات، کە لە خزمەتی ئەودا مشت ومڕ دەکەن، لە سورەتی (الزمر)یشدا باسی ئەو

خەڵکە دەکات کە لە خزمەتیدا مشت ومڕ دەکـــــەن.

لە سورەتی (الشعراء) و سورەتی(ص)یشدا باسی مشت ومڕی خەڵکی ناو دۆزەخ دەکـات، پاشـان خـوای گـەورە ئـەوە ڕوون دەکاتـەوە کـە هـەر فەرمانێکیـدا ئـەوە هەڵوەشانەوەی بۆ نیە و ناگۆڕێت.

گوتـراوە: مەبەست بە نەگۆڕی فەرمانی خوا ئـەم ئایەتەیـە: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ (هـود:١١٩)، واتــە: دۆزەخ پــڕ دەکـەم لـە گرۆهـی (جـن) و خەڵکی.

خـوای گـەورە پەیمانیـشی داوە بـە ئیمانـداران بـە بەهەشـت، جائـەم پەیمانانـە هەڵناوەشێتەوە و ناگۆڕێت.

(ابـن عبـاس) دەفــەرمووێ: خـوای گـەورە دەفـەرموێ: پـەیمانی مـن ناگۆڕێـت بەرانبەر بـەو کەسـانەی ملکەچـی مـن بوونـە و بەندایـەتی منیـان کـردووە، پـەیمانم ناگۆڕێت بەرانبەر بەو کەسانەش کە بێ فەرمانی منیان کردووە.

(مجاهـد)یش دەفـەرمووێ: خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: مـن بڕیـاری خـۆم داوە، ئەوە نیە دیسان بڕیارێکی تر بدەم.

لەم دوو تەفسیرە ئەمـەیان تەفـسیرێکی دروسـتە، تەفـسیرێکی تـریش هەیـە بـۆ ئایەتەکە، ئەویش بەم شێوەیـە:

خوای گەورە دەفــەرمووێ: فـەرمانی مـن ناگۆڕێـت بـە درۆ و تەڵەکـە، هـەر وەك پاشــا و کاربەدەســتانی دنیــا بڕیارێــك دەدەن، پاشــان درۆی لەگــەڵ دەکــەن و نایبەنەسەر.

مەبەست بە گۆڕینی فەرمان، ئەو فەرمانەیە کە داویەتی دەربارەی ئەو دووانە کە مشت و مڕ دەکەن.

(ابن قتيبة) و (الفراء) ئەم ڕایەیان هەڵبژاردووە، (الفراء) دەفـەرمووێ: تەفـسیری ئایەتەکە بەم شێوەیە خوا دەفەرمووێ کـەس درۆ نـەکات لـە لای مـن، چـونکە مـن زانستم بەشتی نهێنیش هەیە، (ابن قتيبـة)ش دەفــەرمووێ: خـوا دەفـەرمووێ هـیچ

بڕیار و فەرمانێك لای من نە دەگوڕێ و نـە زیـادیش دەکـات و نـە کـەمیش دەکـات، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی: بڕیار لای من، نەیفـەرمووە بڕیـاری مـن، ئەمـەش وەك ئەوەیە کە دەگوترێ: درۆ مەکە لای من، جا بە گوێرەی تەفـسیرەکەی یەکـەم، کە (الفراء)ە ئەم ئایەتە: ﴿وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلۡعَبِيدِ﴾ (ق:٢٩)، تـەواو کەرەکـەی ئەمەیـە: ﴿مَا يُبَدَّلُ ٱلۡقَوۡلُ لَدَيَّ﴾، واتـە: ئەو بڕیارەی داومە و گووتوومـە بەرانبـەر بـەو کارانەیـە کە ئەنجامی داوە، ئەمەش کارێکی زۆر دادپەروەرانەیە و ستەمی تیانیە.

بە گوێرەی تەفسیرەکەی دووەم، کـە (ابـن قتيبـة)یـە خـوای گـەورە زاتـی خـۆی وەسف کردووە بە دوو سیفەت:

یەکەم: زانستی فراوان و بێ پایانی ناهێڵێت لە خزمەتیـدا بڕیـار بگۆڕێـت و حـەق بدا بە ناحەق.

دووەم: دادپەروەری بێ پایانی ڕێ نادا، ستەم لە بەندەی بکات.

پاشان خوای گەورە ـ هەر لە سورەتی (ق)دا باسی فراوانی دۆزەخ دەکـات، کـە هەر کاتێـك کۆمـەڵێك فرێدەرێنـە نـاو دۆزەخـەوە، دۆزەخ دەڵێـت: ﴿هَلۡ مِن مَّزِيدٖ﴾ (ق:٣٠)، واتـە: با بێت زیاتـــر نیە بێت؟!

بەڵام ئەو کەسە بە هەڵەداچووە کە دەڵێت ئەمە بە مانای "ليس من مزيد"واتـــە: شـوێن نەمـــاوە لـــە دۆزەخ، چـونکە حەدیـسی(صـحیح)یـش ئـەم بۆچـوونە ڕەت دەکاتەوە.

# باسکردنی چوار ڕەوشتی بەهەشتیەکان

پاشان خوای گەورە ـ هەر لە سورەتی (ق)دا ـ باسی نزیکی بەهەشت دەکات بۆ تەقواداران، بەهەشتیەکانیش ئەوانەن کە بەم چوار ڕەوشتانە وەسف کراون:

یەکەم: (اوّاب)ە،واتە: لە بێ فەرمانی خوا دەگەڕێتەوە بۆ گوێڕایەڵی خوا، لە بێ ئاگابوون لە خوا دەگەڕێتەوە بۆ سەر زیکر و یادی خوا.

(عبیدي)ی کوڕی(عمیر) دەفـەرمووێ: (الاوّاب) ئەو کەسەیە کـە گوناهـەکانی بـیر دەکەوێتەوە داوای لێبووردن لە خوا دەکات لەسەر گوناهەکانی.

(سعید بن المسیب)یش دەفـەرمووێ: (الاوّاب) ئـەو کەسـەیە کـە گونـاه دەکـات، پاشان تەوبە دەکات، دیسان گوناه دەکات، پاشان تەوبە دەکاتەوە.

دووەم: ڕەوشـــتێکی تـــری بەهەشـــتیەکان وەك (ابـــن عبـــاس) دەفـــەرمووێ: (الحفیظ)ە واتە: پارێزەرە لەسەر ئەو شتانەی کە خوا فەرمانی پێ کردووە.

(قتادة) دەفـەرمووێ: پارێزەرە کە حەق و فەرمانی خوا دەپارێزێت و گوێڕایـەڵی دەکات.

دەروونی مرۆڤ دوو توانا و هێزی هەیە:

- ❖ هێزی وەرگــرتن (الطلـب).
- ❖ هێزی خۆگرتنەوە (الامساك).

ئینجـا (الاواب) بـۆ هێـزی وەرگـرتن (الطلـب) بـە کارهـاتووە، کـە مرۆڤەکـە ڕوو دەکاتە وەرگرتن و ئەنجامدانی بەندایەتی خوا، (الحفیظ)یش بـۆ هێـزی خۆگرتنـەوە (امساك) بە کار هاتووە، کە مرۆڤەکە خۆی دەگرێتەوە لـە ئەنجامـدانی گونـاه و بـێ فەرمانی خوا.

کـەوابوو: مرۆڤی (الحفیظ) خۆی دەگرێتەوە و خۆی دەپارێزێت لەو شتانەی لێـی قەدەغەکراوە، مرۆڤی (الاواب)یش ڕوو دەکاتە بەندایەتی خوا.

سێیەم: ڕەوشتێکی تری بەهەشتیەکان ئەوەیە وەك خوای گـەورە دەفــەرمووێ:

﴿ مَّنْ خَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ ﴾ (ق:٣٣). ئەم ئایەتە ئەو خاڵانە لە خۆ دەگرێت:
کە ئەم مرۆڤە ئیمانی هێناوە بە بوونی خوا و بە پەروەردگاریەتی خوا و بە دەسەڵات و زانستی بێ پایانی خوا بەرانبەر بە هەموو کاروباری بەندەکانی ئیمان هێنان بە کتێبە ئاسمانیەکان و پێغەمبەران و فەرمان و قەدەغەکراوەکانی خوا، دانهێنان و ئیمان هێنان بە پاداشت و سزا و زیندوو بوونەوە.
جا ترسان لە خوای گەورە بە پەنهانی کە لەم ئایەتەدا باسکراوە نایەتە جێ و سوودی نابێت تاکو ئەم خاڵانەی باسکرا تیایدا کۆ نەبێتەوە.

چوارەم: ڕەوشتێکی تری بەهەشتیەکان ئەوەیە وەك خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ﴾(ق:٣٣).
(ابن عباس) لە بارەی تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێ: ئەو بەندەیە دەگەڕێتەوە لە بێ فەرمانی خوا و ڕوو دەکاتە بەندایەتی خوا.
پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوەی ڕاستە، بەردەوامبوون و مانەوەی دڵە لەسەر بەندایەتی و خۆشەویستی خوا.

پاشان خوای گەورە - هەر لە سورەتی (ق)دا - باسی پاداشتی ئەو کەسانە دەکات کە ئەم کارانە ئەنجام دەدەن خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ﴾ (ق:٣٤ ـــ ٣٥)، واتە: بفەرموون بچنە ناو بەهەشتەوە بە ئاشتی و ئارامیەوە، ئا ئەوە ئیتر ڕۆژی نەمرین و نەبڕاوەیە، هەرچیش داوای دەکەن و حەزی لێ دەکەن بۆیان ئامادەیە تیایدا، بەڵکو زۆر لەوەش زیاترمان لەلا هەیە.

پاشان خوای گەورە دەیان ترسێنێت ئەگەر بەردەوام بن لەسەر گوناه تاوان هەر وەك چۆن هۆز و نەتەوەکانی پێش ئەوانی لە ناو بردووە بە سزا لە کاتێکا کە ئەوان لەمان زۆر بەهێز و دەسەڵات تریش بوون، کەچی هێز و دەسەڵاتیان فریایان نەکەوت.

ئایا هیچ شتێك هەبوو ڕزگاریان بکات لە سزای خوای گەورە ؟!

(قتادة) دەفـەرمووێ: دووژمنـانی خـوا زۆر گـەڕان بـە دوای ڕزگـار بووندا،کەچـی بینیان فەرمانی خوا هەر دەیانگاتێ.

(الزجـاج) دەفــەرمووێ: زۆر گـەڕان و سـووڕان هـیچ شـتێکیان نەدۆزیـەوە کـە ڕزگاریان بکات لە مردن.

لە ڕاستیدا ئەوان دەگەڕان بە دوای شتێك کە دەربازیـان بکـات لـە مـردن، بـەڵام چنگیان نەدەکەوت.

پاشان خوای گەورە، هەر لە سورەتی (ق)دا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کـە ئەوانـەی باســـــکران: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ (ق:٣٧)، واتـە: بیرخستنەوەیە بۆ کەسێك کە دڵێکی زیندووی هەبێت، یان بە دڵێکی ئامادەوە گوێ بۆ قورئان بگرێت.

پاشان خوای گەورە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچـی لـە نێوانیشیاندا هەیە بە شـەش ڕۆژ دروسـتی کـردوون، هـیچ ماندویەتیـەکیش ڕوی تـێ نەکردووە، ئەمەش بـۆ بـەدرۆ خـستنەوەی جوولەکەکانـە کـە دووژمنـانی خـوان کـە دەڵێـن: خوا دوای دروست کردنی ئەمانە لە ڕۆژی حەوتەمیش حەسایەوە.

پاشان خوای گەورە فـەرمان بە پێغەمبـەر دەکـات کـە ئـارام بگرێـت لەسـەر ئـەو بوختانانەی کە (جـوو) بە خوای هەڵدەبەستن، هەر وەك چۆن خوای گـەورە ئـارامی گرتـووە لەسـەر ئـەو قـسە گەندەڵـەی (جـوو) کـە دەڵێـن: خـوا حەسـاوەتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێ: (( مَا أَحَدٌ أَصْبَرُ عَلَى أَذًى سَمِعَهُ مِنَ اللهِ، يَدْعُونَ لَهُ الْوَلَدَ، ثُمَّ يُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ )) [١]، واتـە: هیچ کەسێك وەکو خودا بـە ئـارام نیـە، ئەزیـەت لـە بەندەکانی دەبینێت و دەبیستێت، نەوەی بۆ بڕیار دەدەن لەگەڵ ئەوەشـدا دەیـان بەخشێت و ڕۆزیان دەدات.

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٤٧٢)، مسلم (٢٥٩٣).

پاشان خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەرﷺ دەکات، بەو شتەی ئارامی پێ دەبەخشێت کە تەسبیحات و سوپاس و ستایش کردنی پەروەردگاریەتی پێش خۆر هەڵاتن و پێش ئاوابوونی، وە لە شەوگاریشدا تەسبیحات و ستایشی خوا بکات، وە دوای سوجدەکانیش.

پاشان خوای گەورە سورەتی (ق) بە باسکردنی زیندوو کردنەوە کۆتای پێ دەهێنێت، کە بانگ بێژێك بانگی ڕۆحەکان دەکاتەوە بۆ لاشەکانیان تاکو لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت، ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە ئەم بانگە لە شوێنێکی زۆر نزیکەوەیە کە هەموو کەسێك گوێی لێ دەبێت، هەر وەك دەفەرمووێ: ﴿يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ﴾ (ق:٤٢)، واتە: ئەو ڕۆژە دەنگێکی زۆر بەرز و سامناك بە ڕاستیی دەبیستن، ئەمەش بۆ زیندوو کردنەوەی خزمەت خوایە.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يَوْمَ تَشَقَّقُ الْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا﴾(ق:٤٤)، واتە: ڕۆژێك دێت زەوی لە ئاستی ئەوان شەق دەبێت.

هەر وەکو چۆن بۆ ڕووەك شەق دەبێت، ئەوهاش زەوی شەق دەبێت و خەڵکی لە گۆڕەکانیان دێنە دەرەوە (سراعا)واتە: بە پەلە و هەڵەداوان، وە دەفەرمووێ: ﴿ذَلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ﴾ (ق:٤٤)، واتە: ئا ئەوە (حشر)ی مرۆڤەکانە بۆ لێپرسینەوە، ئەمەش لای ئێمە کارێکی زۆر ئاسانە.

پاشان خوای گەورە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بەئاگایە بەوەی دوژمنەکانی دەیڵێن، وا نەبێت لای خوا شاراوە بێت، بەڵکو سزاشیان دەداتەوە، خوای گەورە باسی زانست و دەسەڵاتی خۆی دەکات کە دەتوانێت سزایان بدات.

پاشان خوای گەورە بە پێغەمبەرﷺ ڕادەگەیەنێت کە ئەو ڕەوانە نەکراوە تا بە دەسەڵات و بە زۆر ئیسلامیان بە سەردا بسەپێنێت، بەڵکو خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات کە بە قورئان یادەوەری ئەو کەسانە بکات کە لە هەڕەشەکانی خوا دەترسن، چونکە ئەمانە لەم ئامۆژگاریی و بیر خستنەوانەدا سوود وەردەگرن، بەڵام کەسێك کە بڕوای بە زیندوو بوونەوە نەبێ و لە سزای خوا نەترسێ و ئومێدی بە پاداشتی خوا نەبێت، ئەوە بیر خستنەوە سوودی پێ ناگەیەنێت

## شەرحی حەدیسی: ((وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ))

ئەم فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە بە (عمر)ی دەفـەرموو: (( وَمَا يُـدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّـهَ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ ، فَقَدْ غَفَـرْتُ لَكُـمْ )) [1]، واتــە: تـۆ چـوزانیت! بـەڵکو خـوای گـەورە ڕووی قـسەی کردبێتـە یـارانی (بـدر) مـژدەی دابنـێ و پێـی فەرموو‌بن: چی دەکەن بیکەن، من هەر لە ئێستاوە لێتان خۆشبووم.

مانای ئەم فەرموودەیە بۆتە گرفت لـە لای زۆرێـك لـە خەڵكیدا، چـونکە ڕواڵـەتی ئـەم فەرموودەیـە، وا پیـشان دەدات کـە سـەحابەی بـەدر هەرچـی حـەز دەکـەن ئەنجامی بدەن بۆیان دروستە و کارێکی ئاساییە، ئەمەش مەحاڵە و دروست نیە، جا بۆیە کۆمـەڵێك لـە زانایـان یـەك لـەوان: (ابـن الجوزي)ە فەرموویـەتی: مەبەسـت لـە ووشەی "اعملـوا" بـۆ (استقبال) نیە واتە: لەمەودوا چی دەکـەن بیکـەن مـن لێتـان خۆش بوومە، بەڵکو "اعملـوا" بۆ (الماضي)ە واتە: لـەو کارانـەی کردووتانـە خـۆش بووم، بەڵگەش لەسەر ئەم بۆچوونە دوو شـتە:

یەکەم: ئەگـەر "اعملــوا" بـۆ ئـەو کارانـە بوایـە کـە لەمەوبـەدوا دەکرێـت، دەبـا وەڵامەکەی ئاوا بایە: "فسأغفرلكم" واتە: لەمەوبەدوا لێتان خۆش دەبم.

دووەم: ئاشکرایە کە ئەمە پەیوەستە بە گوناحەوە، لە ڕاستیدا ئەم وەڵامـە بـەم شێوەیە: من بە هۆی ئەم جەنگـەوە- کە بەدرە- لـە گوناهـەکانی پێـشووتان خـۆش بووم، بەڵام ئەم ڕایە بێ هێزە لە دوو ڕووەوە:

❖ یەکـەم: ووشـەی "اعملــوا" بـۆ کـاری داهـاتووە نـەك کـاری ڕابـردوو، وە ئـەم دێڕەش کە دەفەرمووێ: "قد غفرت لكم" لێـرەدا "غفرت" بە (فعل ماضـي) هـاتووە کە دەکات بەڵگە نیە لەسـەر ئـەوەی کـە "اعملــوا" وەکـو (غفـر)بـە مانـای ڕابـردوو (ماضي) بێت، چونکە "قد غفر" لێبووردن لە مەوبەدوا دەگەیەنێت.

---

(١) صحيح: رواه البخاری (٢٤٩٤)، و ابو داود (٢٦٥٠)، والترمذی (٣٣٠٢)، واحمد فی المسند (١/٨٠).

وەکو ئەم ئایەتە کە خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ﴾ (النحل:١)، واتـە: فەرمانی خوا هات، کە هێشتا نەهاتووە.

لە شوێنێکی تردا دەفـەرمووێ: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ﴾(الفجر:٢٢)، واتــە: پـەروەردگارت هات، ئەمە لە قیامەتە کە هێشتا نەهاتووە

❖ دووەم: خـودی حەدیـسەکە بەرپەرچـی ئـەم بۆچـوونە دەداتـەوە، چـونکە ووتنی حەدیسەکە بە هـۆی چیرۆکەکەی (حاطـب)وە بـووە، کـە سـیخوڕی لەسـەر پێغەمبەرﷺ کردبوو، ئەم کارەش دوای جەنگی بەدر بوو نەك پێش جـەنگی بـەدر، بەڵێ ئەمە هۆی ووتنی ئەم حەدیسەیە.

ئەوەی ئێمە تێی گەیشتبین لەم حەدیسە بەم شێوەیە، والله أعلم، خـوای گـەورە ئەم لێبووردنەی بە کەسانێك فەرمووە کە زانیویەتی ئەوانە واز لە دینـداری نـاهێنن، بـەڵکو کاتێـك دەمـرن بـە موسـلمانیەتی و لەسـەر ئیـسلام دەمـرن، کەچـی هێنـدێ هەڵەش دەکەن وەکو هـەموو خـەڵکی تـر، بـەڵام خـوای گـەورە فەرامۆشـیان ناکـات لەسەری بەردەوام بن، بەڵکو یارمەتیان دەدات بۆ تەوبەکردن و پەشیمان بوونەوە و چاکەکردن، جا بە هـۆی ئەمانـەوە ئـەو کـارە هەڵـەی ئەنجامیانـداوە دەسـڕێتەوە و نامێنێت.

جا تایبەت کردنی لێبووردن بە جـەنگاوەرانی بـەدر جگـە لـە خـەڵکی تـر، لەبـەر ئەوەیە چونکە ئەوان هۆکارەکانی لێبووردنیان تیادا کۆبۆتەوە دەرگـای لێبـوردنیش کراوەتەوە بۆ کەسێك کە بەم کارانە هەڵسێت کە ئـەوان ئـەنجامیان داوە، هـەر وەك چۆن ناگونجێت بە بەهانەی لێبووردن دەست لە بەندایەتی هەڵگرێت.

کەواتــە ئەگــەر بێتــوو لێبــووردن بــەبێ بــەردەوامی لەسـەر بەندایـەتی چـەنگ بکەوتایە، ئەوە نوێژ و ڕۆژوو و حەج و زەکات و جیهاد پێویستی نەدەکرد، ئەمـەش شتێکی مەحاڵە، وە گەورەترین واجبیش تەوبە کردنە دوای گوناه.

کــەوابوو گــرینتی بێــدانی لێبــووردن وا ناگەیــەنێت کــە دەســت هــەڵگرێت لــە هۆکارەکانی لێبووردن، وێنەی ئەمەش ئەم حەدیسەیە: (( أَذْنَـبَ عَبْـدٌ ذَنْبًـا فَقَـالَ: أَيٌّ

رَبِّ، أَذْنَبْتُ ذَنْبًا فَاغْفِرْ لِي، فغفر له، ثُمَّ مَكَثَ مَا شَاءَ اللَّهُ أن يمكث، ثُمَّ أَذْنَبَ ذَنْبًا آخَرَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ، أَصَبْتُ ذَنْبًا، فَاغْفِرْهُ لِي، فغفر له، ثُمَّ مَكَثَ مَا شَاءَ اللَّهُ أن يمكث، ثُمَّ أَذْنَبَ ذَنْبًا آخَرَ، أَذْنَبَ ذَنْبًا، فَقَالَ: رَبِّ، أَصَبْتُ ذَنْبًا، فَاغْفِرْهُ لِي فَقَالَ الله: عَلِمَ عَبْدِي أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَ يَأْخُذُ بِهِ، قد غَفَرْتُ لِعَبْدِي، فَلْيَعْمَلْ مَا شَاءَ ))[1].

واتـە: کاتێك بەندە گوناهێك دەکات ـ پاشان لە گوناهەکە پەشیمان دەبێتەوەــ دەڵێت: ئەی پەروەردگارا گوناهێکم ئەنجامدا داوات لێ دەکەم لێم ببوورە، خواش لێی دەبوورێت، ماوەیەك دەمێنێتەوە بەم شێوە ئەوەندەی خوا حەز بکات، پاشان گوناهێکی تر دەکات ـ دیسان ـ دەڵێت: ئەی پەروەردگارا گوناهێکم ئەنجامدا لێم ببورە، خواش لێی دەبوورێت، ماوەیەك بەم شێوە دەمێنێتەوە ئەوەندەی خوا حەز بکات، پاشان گوناهێکی تر ئەنجام دەدات، دەڵێت: ئەی پەرورردگارا تووشی گوناه هاتمەوە لێم ببورە، خوای گەورەش دەفەرموێ: بەندەکەم دەزانێت پەروەردگارێکی هەیە لە گوناه دەبوورێت و یان سزای دەدات، کەواتە من لە بەندەکەم بوورد چی دەکات با بیکا.

ئەوەش وا ناگەیەنێت کە خوای گەورە ڕێگا بە کردنی گوناه و تاوان بدات، بەڵکو ئەمە وا دەگەیەنێت کە خوای گەورە لێی دەبوورێت، چونکە بەم شێوە گوناه دەکات و پەشیمان دەبێتەوە و تەوبە دەکات.

جا خوای گەورە ئەو بەندەی تایبەت کردووە بە لێبوردن، چونکە زانیویەتی سوورنابێت لەسەر گوناح، بەڵکو هەر کاتێك تووشی گوناهێك هات بە پەلە تەوبە دەکات، ئەم حوکمەش گشتیە هەموو کەسێك دەگرێتەوە کە بەم شێوە بێت، بەڵام ئەو بەندە لێبووردنی بۆ براوەتەوە وەك یارانی بەدر.

بە هەمان شێوەش ئەو کەسانەی کە پێغەمبەرﷺ مژدەی بەهەشتی پێداون، یان پێیانی ڕاگەیاندووە کە خوا لێیان خۆش بووە، ئەوە وا ناگەیەنێت کە ڕێگای

(١) صحيح: رواه البخاري (٧٥٠٧)، و مسلم (٢٧٥٨).

پێدابن گوناه و تاوان بکەن و واز لە بەندایەتی وکارە واجبەکان بهێنن، بەڵکو ئەم هاوەڵانە دوای ئەوەی مژدەی لێبوردنیان پێدرا، زیاتر لە خوا دەترسان و بەندایەتی خوایان دەکرد، هەر وەك ئەو (١٠) هاوەڵەی کە مژدەی بەهەشتیان پێدرابوو.

بڕوانە: ئەوە (ابوبکر)ە کە نموونەی لە خوا ترسان و خواناسان بوو، بە هەمان شێوە ئیمامی(عمر)، چونکە ئەوانە دەیانزانی لێبووردنی خوا پەیوەستە بە کۆڵنەدان و بەندایەتی کردنی خوا تاکو مردن، هیچ کام لەو هاوەڵانەی پێغەمبەرﷺ گومانیان بۆ ئەوە نەدەچوو کە ڕێیان پێدراوە چی بکەن با بیکەن بە ئارەزووی خۆیان.

## تەفسیری ئەم ئایەتە: ﴿هُوَ ٱلَّذِی جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا﴾

خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِی جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِی مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَیْهِ ٱلنُّشُورُ﴾(الملك:١٥)، واتـە: خـوای گـەورە زەوی زەلیـل و ملکـەچ کردووە بۆ ئەوەی بگەڕێت بە هەموو گۆشە و کەنارێکیدا، لەو رزق و ڕوزیەش بخۆن کە پێشکەشتانی دەکات، دڵنیاشبن کە سەرەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەوە.

خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە زەوی ملکـەچ کـردووە بۆ خەڵکی تاکو بەسەریدا بڕۆن و خانوو بەرەی لەسەردا دروست بکەن و بـیری تیـا هەڵکـەنن، لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕێگـەی بـە زەوی نـەداوە کـە ڕێگربێـت بەرانبـەر ئـەم کارانەی، کە خەڵکی لەسەریدا ئەنجامی دەدەن .

خوای گەورە ئەوەشمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە زەوی کردووە بە لانك و فـەرش و شـوێنی حەسـانەوە، ڕوونیـشی دەکاتـەوە کـە زەوی بـە شـێوەیەکی هێلکـەیی بەدیهێناوە، ئاوی لێ دەرهێنـاوە و لەوەڕگاشـی بـۆ مـاڵات لـێ فـەراهم هێنـاوە، بـە کێوەکانیش زەوی دامەزراو و ڕاگـر کـردووە، ڕێگاشـی بـۆ سـازکردوون، لـە زەویـدا دەریا و کانیاویشی بۆ فەراهەم هێناون، خێر و بێری زۆریشی تیایدا ڕژاندووە.

هـەر لـە خێـر و بەرەکـەتی زەوی، ئەوەیـە کـە هـەموو گیانـداران خۆراکیـان لـە بـەروبوومی زەوی دەدرێـت، لـە خێـر و بەرەکـەتی زەوی ئەوەیـە کـە زەوی ئـارام دەگرێت لە هەموو کـارێکی قێـزەوەن کـە لەسـەر پـشتی ئـەنجام دەدرێـت، کەچـی بەرانبەر ئەمەش چاکترین و بەسوودترین بەروبوومت پێشکەش دەکات.

لە خێر و بەرەکەتی زەوی ئەوەیە کە ئـەو پاشـەڕۆیە پیـسەی مـرۆڤ لـە لاشـەی فرێی دەدات زەوی بۆی دەشارێتەوە، بەرانبەر ئەمەش خواردن و خواردنەوەی بـۆ دەردەدات.

بەم شێوەیە زەوی ئێش و ئـازار و خراپـە و پیـسیەی لەسـەر ئـەنجام دەدرێت، بەڵام ئەو سوود و خێر دەبەخشێت.

پوختەی قسان: خوای گەورە زەوی وەك حوشتر ملکەچ کردووە بۆمان، بۆ کوێ لێی دەخوڕیت دەڕوات، بەڕاستی خوای گەورە جوانی تەعبیر کردووە ڕێگا و بانەکانی بە شان تەعبیر کردووە، چونکە وەکو شان ملکەچە بۆ بار، لە کاتێکدا دەبینین پیادە لەسەر شانی زەویدا ڕێدەکات کە بەرزترین شوێنیەتی، هەر بۆیەش چیایەکان بە شان تەفسیر کراوە، هەر وەکو چۆن شانی ئادەمیزاد بەرزترین شوێنیەتی.

گوتراوە: ئەوەش ئەوە دەردەخات کە ڕێکردن لەسەر تەختایی زۆر ئاسانترە.
کۆمەڵەیەك لە زانایانی تر فەرموویانە: بەڵکو (مناكب) تەنیشت و لێوارەکانە، هەر وەك چۆن شانی ئادەمیزاد لە تەنیشتەکانیەتی، بەڵام ئەوەی لەو بابەتە دەردەکەوێت، ئەوەیە مەبەست بە (مناكب) بەرزاییە، ئەو ڕووەش کە گیاندار بەسەریدا دەڕوات، ئەوە ڕووە بەرزیەکەیەتی، چونکە بەرزایی زەوی ڕووە ڕاخراوەکەیەتی، ڕۆیشتنیش هەر لەسەر ڕووە ڕاخراوەکەیەتی، تەعبیر کردنیشی بە شان زۆر جوانە لەبەر ئەوەی زانرا کە ملکەچە بۆ ڕۆیشتن بەسەر پشتیدا.

پاشان خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرمانیان پێ دەکات لەو ڕزق و ڕۆزیە بخۆن کە لە زەوی فەراهەمی هێناوە، چونکە زەوی بۆ ملکەچ کردوونە و ڕێگا و بانیشی بۆ ساز کردوون، تاکو لەسەری هاتووچۆ بکەن، بۆ پشوودان و حەسانەوەش خانووی بۆ ڕەخساندوون، خۆراکیشی بۆ دانیشتوانی بۆ گیانەوران ئامادە کردووە لەسەری.

پاشان خوای گەورە هەر لەو ئایەتەدا خەڵکی ئاگادار دەکاتەوە کە دەفەرمووێ: ﴿وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ﴾ (الملك:١٥)، واتە: هەر چەندە خۆتان بە دنیاوە خەریك بکەن ئەوە هەر دەگەڕێنەوە لای من.

لێرەدا خوای گەورە ئاگاداریان دەکاتەوە کە ئەم خۆشی و ماڵ و سامانە لە زەویدا بەردەوام نامێنێت تا سەر، بەڵکو ئەو مرۆڤە وەك ڕێبوارێك هاتۆتە دنیا، جا کەواتە کارێکی ژیرانە نیە مرۆڤ ئەم دنیایە بکات بە مەنزڵگای خۆی و بیکات بە شوێنێکی جێگیر و شوێنی مانەوە، بەڵکو مرۆڤمان بۆیە هێناوەتە دنیا تا تێشوو کۆ

بکاتەوە بۆ قیامـەتی، ئـەو قیامەتـەی کـە بەڕاستی شـوێنی ژیانی نـەبڕاوەی هـەتا هەتاییە، ئەم دنیایەش ڕێگای پیا ڕۆیشتنە نەك دانیشتن و مانەوە.

ئائەم ئایەتـە بەڵگەیـە لەسـەر، پەروەردگاریـەتی و یەکتاپەرسـتی و دەسـەڵات و حیکمەت و بەزەیی خوای گەورە، ئەم ئایەتە مرۆڤ ئاگادار و هۆشیار دەکاتەوە تـا ڕوو نەکاتە دنیا و بیکات بە مۆڵگەی نەبراوە، بەڵکو هانمان دەدات کە پەلـە بکـەین بۆ گەیشتن بە بە هەشتی نەبڕاوە.

ئـەم ئایەتـە ئـەم خاڵانەشـی لـە خـۆ گرتـووە، یەکتاپەرسـتی، بیرخـستنەوەی بەخشـشەکانی خـوا، هانـدانی مـرۆڤ لەسـەر چـاکە کـردن بـۆ بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەندی خوا، خۆ ئامـادەکردن بـۆ گەیـشتن بـە خزمـەتی خـوا، ڕوون کردنـەوەی ئەوەی زەوی کاتێکی بەسەردادێت دەپێچرێتەوە وەکو ئەوەی کە نەبووبێت، ئینجا دوای مردنی مرۆڤەکان دووبارە زیندوویان دەکاتەوە بۆ لێپرسینەوە.

# ڕوون کردنەوەی سورەتی ( الفاتحه )

کە کامەرانیو سەربەرزی مرۆڤی لە خۆگرتووە

مرۆڤ دوو هێزی هەیە کە ئەو دوو هێزە مرۆڤ لە گیانداری تر جیای دەکاتـــەوە:

- قوة علمية نظرية: هێزی زانست و زانیاری، کە بەم هێزە جیهان بینی و چاو ڕۆشن دەبێت.
- قـوة عمليـة اراديـة: هێـزی توانـا (ارادة)ە کـە بـەم هێـزە دەتوانێـت هـەموو شتێکی چاك یان خراپ ئەنجام بدات.

جا هێزی زانیاری (العلمية)ە بە پێنج خاڵ چنگ دەکەوێت:

یەکەم: بە ناسینی پەروەردگاری چنگی دەکەوێت.

دووەم: بە ناسینی ناو و سیفاتی خوا چنگی دەکەوێت.

سێیەم: بە ناسینی ئەو ڕێگایەی دەیگەیەنێتە ئامان چنگی دەکەوێت.

چوارەم: بە ناسینی دڵ و دەروونی خۆی چنگی دەکەوێت.

پێنجەم: بە ناسینی کەم و کوڕیەکانی خۆی چنگی دەکەوێت.

ئا بەو پێنج خاڵە هێزی جیهان بینینی(العلمية)ەی چـنگ دەکـەوێت، هەرکەسـێك ئەم خاڵانەی هەموو تیا کۆبووبێتەوە ئەوە کامەرانترین و زاناترین کەسە.

هێـزی (ارادة)ش مـرۆڤ کاتێـك چـنگی دەکـەوێت، ئەگـەر ڕەچـاوی سـنوورەکانی خـوای گـەورە بکـات و هەڵـسێت بـە ئەنجامـدانی بـە نیـەتێکی پـاك و بـەو شـێوەی فەرمانی پێ کراوە، ڕەچاو نەکردنی ئەمانەش نەگەیشتنیەتی بە مەبەست.

ئـەم دووهێـزەش مـرۆڤ چـنگی ناکـەوێت ئەگـەر بـە یارمـەتی خـوا نـەبێت، مـرۆڤ پێویستی بە ڕێنموویی خوا هەیە تـاکو ڕێگـای ڕاسـتی پێشانبدا ئـەو ڕێگایـەی خـوا خۆشەویستانی لەسەر جێگر کردووە، مـرۆڤ پێویـستی بـە یارمـەتی خـوا هەیـە، کـە بەردەوامی بکات لەسەر ئەم ڕێگایە تاکو لانەدات لێی، چونکە دەرچوونی لـەم ڕێگـا ڕاسـتەدا یـان بـە تێکـچوون و خـراپ بـوونی هێـزی زانـستیەتی کـە نـەفام و گـومڕا

دەبێـت، یـان بـە تێکـچوون و خـراپ بـوونی هێـزی کارکردنیـەتی کـە کـاری وا ئەنجامدەدات تووشی تووڕەیی خوا دەبێت.

جا مرۆڤ ئاسوودە و کامەران نابێت تاکو ئەم خاڵانـەی تیـا نێتـەجێ کـە باسمـان کرد، سورەتی (الفاتحة)ش ئەم خاڵانەی زۆر بە جوانی و ڕێکی ڕیـز بەنـدکردووە کـە خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ (الفاتحـة:١ـ٢ـ٣)، ئـەم ئایەتانـە بنـچینەی یەکـەمی لـە خۆگرتـووە، کـە ناسـینی پـەروەردگارە و ناسـینی نـاو و سـیفاتەکانی خوایـە، بنـچینەی نـاوە جوانـەکانی خـواش، ئـەم ناوانـەن وا لـەم سـورەتەدا باسـکراون، کـە نـاوی (الله) و (الرب)و (الرحمن)ە، چونکە نـاوی (الله) سـیفەتی (الالوهیـة)واتـە: یەکتاپەرسـتی لـە خۆگرتـووە، نـاوی (الـرب)یـش سـیفەتی (الربوبیـة)واتـە: پەروەردگاریـەتی لـە خۆگرتووە، ناوی (الرحمن)یش سیفەتی (الاحسان) و (الجود) و (البر)واتـە: چاکە و چاکەکاری لە خۆ گرتووە، ناوەکانی خواش هەر ئەو سێ مانایە کۆیان دەکاتەوە.

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ (الفاتحة:٤، ئەم ئایەتەش ناسینی ئـەو ڕێگایـەی لـە خۆگرتووە کە گەیشتنە بە ڕەزامەندی خوای گەورە، گەیشتن بە ڕەزامەندی خـواش بەو کارانە دەکرێت خوا پێی ڕازیە و پێی خۆشە، ئەمەش بە یارمەتی خـوا دەبێـت، تاکو لەسەر بەندایەتیدا بەردەوامی بکات و سەرفرازی بکات.

﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ (الفاتحة:٥)، ئەم ئایەتەش ئەوەی لـە خـۆ گرتـووە، کـە کامەرانی مرۆڤ تەنها لەوە دایە بەردەوام بێـت لەسـەر ڕێگـای ڕاسـتی ئیـسلام، هـیچ ڕێگایەکیش نیە بۆ بەردەوام بوون لەسەر ئیسلام، جگـە لـە ڕێنمـوونی پـەروەردگار نەبێت، هەر وەك چۆن بەندە بە یارمـەتی خـوا سـەرفراز دەبێـت لـە بەندایـەتی، بـە هەمان شێوەش بەندە بە ڕێنموونی خوا بەردەوام دەبێت لەسەر ئیسلام.

﴿غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ (الفاتحـــة:٦)، ئـــەم ئایەتـــەش ئـــەو دوو ڕێگایەمان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە کـە ڕێگـای سـەرگەردانیە و مـرۆڤ لـە ڕێگـای ڕاسـتی

ئیسلام لادەدات و سەرگەردان و سەر لێشێواو دەبێت، جا لادان لە خواناسی و بیروباوەڕ سەردەکێشێت بۆ گوماڕایی و سەرگەردانی، لادانیش لە بەندایەتی و ملکەچ نەکردن بۆ خوا، سەردەکێشێت بۆ توڕە بوون و سزای خوا.

کەوابوو: سەرەتای سوڕەتەکە ڕەحمەتی خوای لە خۆ گرتووە، ناوەڕاستەکەشی هیدایەت و ڕێنموویی لە خۆگرتووە، کۆتاییەکەشی بەخششی و نیعمەتی خوای لە خۆ گرتووە.

جا مرۆڤ بە ئەندازەی هیدایەتەکەیەتی بەخششی خوای بەر دەکەوێت، بەشی لە هیدایەتی خواش بە ئەندازەی وەرگرتنی رەحمەتەکەیەتی، کەواتە هەموو بنچینەکان دەگەڕێتەوە سەر بەخشش و ڕەحمەتی خوا، بەخشش و ڕەحمەتی خواش پەیوەستە بە (ربوبیة)تی خوای گەورە، پەروەردگاریش دەبێت سیفەتی رەحمەت و بەخشینی هەبێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر (الالوهیة)ی ڕاستەقینەی خوای گەورە، ئەگەر چی کەللە ڕەقان دان بەمە ناهێن، موشریکەکانیش لەم ڕاستیە لادەدەن. جا هەر کاتێك مانای سورەتی (فاتحة)ی زانی و کاری پێکرد و تێکەڵی بوو، ئەوە کامەران دەبێت بەوەی بەندایەتیەکەی تامێکی تایبەتی دەبێت، وەك ئەو کەسانەی پلەیان پێ بەرز بووە لە خەڵکی تر.

# نـاسینی خوا

لە ڕێگای تێڕوانینی دروست کراوەکانیدا چنگ دەکەوێت

لە قورئاندا خوای پەروەردگار بانگی بەندەکانی دەکات و ڕوونی دەکاتەوە کە بە دوو ڕێگا دەگەن بە ناسینی خوا:

یەکەم: تێڕوانین و ووردبوونەوە لە دروست کراوەکانی خوا.

دووەم: تێڕوانین و ووردبوونەوە لە قورئانی پیـرۆز.

یەکەمیان بەڵگــە و نیشانەی بینراوی خـوایە، دووەمیشیان بەڵگـە و نیشانەی بیستراوی خوایە، بەشی یەکەم لەو ئایەتەدا دەردەکەوێت کە خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (البقرة:١٦٤).

واتــە: بەڕاستی لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئاڵوگۆڕی شەو و ڕۆژدا، لەو کەشتیانەی کە دەگەڕێت بەدەریادا و بـە هۆیـەوە سـوود بەخـەڵکی دەگەیـەنن، لەو ئاوەی کە خوا لە ئاسمانەوە دەیبارێنێت و ئینجا بە هۆیـەوە زەوی پـێ زینـدوو دەکاتەوە دوای ووشك بوون و مردنی، هەروەها جۆرەها زیندەوەر و گیانلەبەر و مار و مێرووی لەسەر ڕووکاری زەویدا بڵاو کردۆتەوە و گۆڕاندن و هاتووچۆ پێکردنی باو شەماڵ و ڕاگیر کردنی هەورەکان لە نێوان ئاسمان و زەویدا، ئا ئەمانە هەر هـەمووی بەڵگە و نیشانەی بەهێزن بۆ ئەوانەی کە عەقڵ و بیرو هۆشیان دەخەنە کار و بیر لە دەسەڵاتی بێ سنووری خوا دەکەنەوە.

خـوای گـەورە دەفــەرمووێ: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ (ال عمران:١٩٠)، واتـە: بەڕاسـتی لـە دروسـت کردنـی ئاسمانەکان و زەوی ئـاڵووگۆڕکردنی شـەو و ڕۆژدا، بەڵگـە و نیـشانەی زۆر هـەن بـۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند.

ئایـەت لەسـەر ئـەم بابەتـەوە زۆرە لـە قورئانـدا، بەشـی دووەم لـەو ئایەتـەدا دەردەکەوێت کە خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ﴾ (النـساء:٨٢)، واتـە: ئایا ووردنابنەوە لەم قورئانـــە.

دەفـــــەرمووێ: ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ (ص:٢٩)، واتـە: ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە دامانبەزاندووە بۆ تۆ، بـۆ ئـەوەی لـە ووردەکاری ئایەتەکان ووردبنەوە.

بە هەمان شێوە ئایەت زۆرە لەم بارەیەوە.

کارتێکراوەکـان بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی کاریـان تیـاکراوە، کارەکـانیش بەڵگـەن لەسەر سیفەتی کارکارەکە، چونکە کارتێکراو بەڵگەیە لەسەر کاری کارکەر، ئەمەش مەشخەڵە بۆ بوون و دەسەڵات و ویست و زانستی خوای گەورە، چـونکە مەحاڵـە لـە نەبونەوە پەیدا بووبن، یـان لـە بوونەوەرێکـەوە بـەڵام بـێ توانـا و زانـست و ئـیرادە بێت.

پاشـان هـەرچ تایبەتمەندیـەك لـەم کـارتێکراوەدا هـەبێت ئـەوە بەڵگەیـە لەسـەر دەسـەڵات و ویـستی خـوای گـەورە، کەواتــە خەسـڵەتی چاکسازی و سوپاسـکرا و حیکمەت لەم دروستکراوانەدا، بەڵگەیە لەسەر حیکمەتی خوا.

خەسـڵەتی خێـر و بەخـشین و چـاکە لـەم دروسـتکراوانەدا، بەڵگەیـە لەسـەر ڕەحمەتی بێ پایانی خوا.

خەسڵەتی هێز و تۆڵـە و سزا لەم دروستکراوانەدا، بەڵگەیە لەسەر تووڕەی خوا.

خەسڵەتی بەخشندەیی و یارمەتی و دۆسـتایەتی لـەم دروسـتکراوانەدا، بەڵگەیـە لەسەر خۆشەویستی خوا.

خەسڵەتی دەست پێکی گەشەکردن وزیادکردن و بەرەو تەواو چوون لەم دروستکراوانەدا، بەڵگەیە لەسەر هاتنی ڕۆژی قیامەت.

ڕووەك و گیاندار، زیندووکردنەوە و هەڵقوڵاندنی ئاوەڕۆکان، بەڵگەن لەسەر زیندووبوونەوەی مرۆڤەکان لە ڕۆژی قیامەت.

شوێنەواری خەسڵەتی بەخشش و ڕەحمەت لەسەر دروستکراوەکانی بەڵگەیە لەسەر ڕاستی پێغەمبەران.

خەسڵەتی بێ کەم و کوڕی لەم دروستکراوانەیدا، بەڵگەیە لەسەر کەماڵی و بێ کەم و کوڕی خوای گەورە.

دروست کراوەکانی خوا بەڵگە و نیشانەی ڕوون و ئاشکران لەسەر سیفاتەکانی خوا و ڕاستی ئەو پێغەمبەرانەی کە ڕەوانی کردوون، جا ئەو دروستکراوانەش بەڵگەن لەسەر ڕاستی قورئان.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾ (فصلت:٥٣)، واتە: ئێمە بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی بوونەوەردا لە خودی خۆشیاندا، تاکو بۆیان ڕوون بێتەوە و بزانن کە قورئان حەقە.

خوای گەورە لێرەدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەم بەڵگانەیان نیشاندەدات، تاکو بۆیان ڕوون بێتەوە قورئان ڕاستە و ژیانەوەی مرۆڤی تیایە.

بەڵێ: ئایەتەکانی قورئان و ئایەتەکانی بوونەوەر هەمووی شاهێدن لەسەر یەکتایی خودا، خوای گەورەش شاهێدە بە ئایەتەکانی لەسەر پێغەمبەرایەتی محمدﷺ، هەر وەکو هێندێ لە خواناسان فەرموویانە: چۆن داوای بەڵگە لەسەر شتێك دەکەم کە بۆ خۆی بەڵگەیە لەسەر هەموو شتێك!!

داوای چ بەڵگەیەك دەکەی لەسەری لە کاتێکدا کە بوونی گەورەترین بەڵگەیە.

هەر بۆیەش پێغەمبەران بەگەلەکەی خۆیان دەفەرموو: ﴿أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ ﴾ (ابراهيم:١٠)، واتە: ئایا گومان لە خوای گەورە هەیە؟ لە کاتێکدا خوای گەورە لە هەموو شتێك ئاشکراترە کە هەموو شتێك بەو دەناسرێت.

## شەرحی حەدیسی (( اللَّهُمَّ إنِّی عبدُكَ، ابنُ عبدِكَ، ابنُ أمتِكَ ))

لە "المسند" و "صحیح ابي حاتم"دا حەدیسی (عبدالله)ی کوڕی (مسعود)هاتووە کە دەفـەرمووێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفـەرمووێ: (( مَا أَصَابَ عبداً هَمٌّ ولاَ حَزَنٌ فَقَالَ: اللَّهُمَّ إنِّي عَبْدُكَ، ابْنُ عَبْدِكَ، ابْنُ أَمَتِكَ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرآنَ رَبِيعَ قَلْبِي، وَنُورَ صَدْرِي، وَجَلاَءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي و غَمِّي، إلاَّ أَذْهَبَ اللَّهُ هَمَّهُ وَحُزْنَهُ، وَأَبْدَلَهُ مَكَانَهُ فَرَجاً. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ نَتَعَلَّمُهَنَ؟ قَالَ: بَلَى، يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهَن أَنْ يَتَعَلَّمَهَن ))[1].

واتـە: هەر بەندەیەك تووشی ناخۆشی و خەفـەت بێت ئەگـەر بڵێت: خوایـە من بەندەی تۆم، کوڕی بەنـدەی تـۆم، کـوڕی کـەنیزەك و کۆیلـەی تـۆم، نێوچـەوانم بـە دەسـت تۆیـە، حـووکم و بڕیـارت بـە سـەرمدا ڕابـردووە، بڕیارەکانیـشت بەسـەرمدا دادپەروەرانەیـە، خودایـە داوات لێدەکـەم و لێـت دەپاڕێمـەوە بـە هـەموو نـاوە جوانەکانت کە ناوت پێ لـە خۆت ناوە، یـان لـە قورئانـدا ناردۆتتـە خـوارەوە، یـان فێـری کەسـێکت کـردووە لـە دروسـتکراوەکانت، یـان لـە زانـستی پـەنهانی خـۆت حەشارت داوە کە قورئان بکەیتە بە هـاری دڵـم، و نـووری سـنگم و ڕەوێنـەوەی دڵ تەنگیم و لابەری غەم و خەفەتم، هەر کەسێك ئەو نزایە بکـات ئـەوە خـوای گـەورە غەم و خەفەتەکـەی لادەبـا و بـۆی دەگۆڕێـت بـە خۆشـی ـکاتێك هـاوەڵان ئەمـەیان بیستـ فەرموویان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ خـەڵکی فێـری ئـەم نزایـە بکـەین؟! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵی، هەر کەسێك گوێ بیستی بوو، پێویستە خەڵکی تری لێ فێربکات.

---

(١) صحيح: رواه أحمد في مسند (٣٧١٢)، ابن حبان في صحيحه (٩٧٢)، الحاكم في المستدرك (١٨٧٧)، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: السلسلة الصحيحة للشيخ الألباني (٣٨٢/١).

ئەم حەدیسە بە نرخە، خواناسی و یەکتاپەرستی و ملکەچی لە خۆ گرتووە، لەو خاڵە بە، کە نرخانەی ئەم حەدیسە لە خۆی گرتووە، ئەوەیە کە ئەو کەسەی بەم شێوەیە نزاکەی دەردەبڕێت: "إِنِّي عَبْدُكَ، ابْنُ عَبْدِكَ، ابْنُ أَمَتِكَ"واتـە: خودایە من بەندەی تۆم، کوڕی بەندەی تۆم، کوڕی کەنیزەك و کۆیلەی تۆم.

ئا ئەم دەستەواژەیە باوکانی و دایکانی تاکو (ادم) و (حواء) لە خۆ دەگرێت، ئەمەش نیشانەی دەربڕینی زەلیلی خۆیەتی، لەبەر دەستی خوای گەورە، بەوەی کە باوك و باپیرانی هەمووی بەندەی ئەون، بەندەش هیچ شوێن و مۆلگەیەکی نیە، جگە لە مولگەی گەورەکەی نەبێت، ئەگەر بێتو گەورەکەی فەرامۆشی بکات، ئەوە ڕیسوا دەبێت و کەس دالدەی نادات و کەسیش بەزەیی پێیا نایەتەوە و بێ چارە دەبێت، جا بۆیە دان دەهێنێ و دەڵێت: بە ئەندازەی چاو تروکانێکیش من بێ تۆ سەرگەردانم، کەس دالدەم نادات، جگە لە گەورەکەم نەبێت کە من بەندەی ئەوم.

بەڵێ: ئەمە دانهێنانە بەوەی پەروەردە کراوە و فەرمان پێ کراوە، بەڵکو بە پێی فەرمانی خوا کار دەکات، نەك بە هەوەسی خۆی، لە ڕاستیدا ئەمە حاڵی کۆیلە نیە، بەڵکو حاڵی پادشا و ئازادەکانە، بەڵام بەندۆکە ڕەفتاریان بە پێی بەندایەتیە، ئا ئەوانە بەندەن بۆ بەندایەتی خوا پاڵدراوەتە لای خوای گەورە، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ ﴾ (الحجر:٤٢)، واتـە: ـ خوای گەورە بە شەیتان دەفەرموێت ـ بێگومان بەندە ڕاستەقینەکانی من تۆ هیچ دەسەلاتت بەسەریاندا نیە.

دەفــــەرمووێ: ﴿ وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ ﴾ (الفرقـــان:٦٣)، واتـە:بەندەکانی خودای میهرەبان ئەوانەن لەسەر زەویدا بەهێمنی و لەسەر خۆی دەڕۆن.

جگە لەمانەش بەندەی (الربوبية) و دەسەلاتی خوان، پاڵدانیشیان بۆ لای خوا وەکو پاڵدانی هەموو خانوویەکە بۆ لای خاوەنەکەی، پاڵدانی ئەمانەش بۆ لای وەکو پاڵدانی (البيت الحرام)ە بۆ لای خوا، وەکو پاڵدانی حوشترەکە و بەهەشتە بۆ لای،

پاڵـدانی پێغەمبـەرە بـۆ لای کـە دەفـــەرمووێ: ﴿وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا﴾ (البقرة:٢٣)، واتـە: ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لەو قورئانـەی دامانبەزاندۆتـە سەر بەندەکەمان.

هەروەها دەفـەرمووێ: ﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ﴾ (الاسراء:١)، واتـە: پـاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی شەوڕۆی بە بەندەکەی کرد.

لـە ئایـەتێکی تـر دەفـەرمووێ: ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ﴾ (الجـن:١٩)، واتـــە: کاتێك بەندەی ئێمە هەڵساوە و داوای کرد.

# مانای (العبودیـة) بەندایەتی

کە مرۆڤ دەڵێت: "إِنِّـی عَبْـدُكَ" دەبێـت ئـەم خاڵانـەی لـی بێتـە جـێ: ملکەچـی و زەلیلـی و گەڕانـەوە و گـوێ ڕایـەڵی کردنـی گەورەکـەی بێـت کـە خـوای گەورەیـە، خۆپاراستن لەو شتانەی قەدەغەی کردووە، پەنا تەنها بۆ خوا ببات، داوای یارمـەتی تـەنها لـەو بکـات، تـەوەکولی تـەنها لەسـەر ئـەو بێـت، پـەنا تـەنها بـەو بگرێـت، خۆشەویستی و ترس و ئومێدی بە کەسی تر نەبێت جگە لەو، هـەروەها مانـای وایـە کە من لە هەموو ڕوویەکەوە بەندەی ڕاستەقینەی تۆم، بە گچکەی وگەورەی و مردن و ژیان و گوێ ڕایـەڵی و تاوانبـاری و لـە خۆشـی و ناخۆشـی بـەڕۆح و دڵ و زمـان و ئەندامەکان هەر بەندەی تۆم.

ئەم ڕستەیە (أني عبدك) ئەو مانایەشی تیایـە: مـاڵ و گیـانی مـن گـشتی مـوڵکی تۆیـە، چـونکە کۆیلـە هـەر شـتێکی هـەبێت ئـەوە هـی خـۆی نیـە، بـەڵکو هـی گەورەکەیەتی.

ئەو مانایەشی لە خۆگرتووە: خوایە ئـەو هـەموو بەخـشش و نیعمەتـەی کـە مـن تیایدام هەمووی بەخشش و نیعمەتی تۆیە لەسەر منی بەندە.

ئەو مانایەشی لە خۆگرتووە: من بەبێ فەرمانی تۆ هەڵسوکەوت ناکەم لە گیـان و ماڵم، هەروەك چۆن کۆیلە هـیچ کارێـك ئـەنجام نـادات بـەبێ مۆڵـەتی گەورەکـەی، ـ بەهەمان شێوەش ـ من توانای هیچم نیە بۆ خۆم نە گێڕانەوەی زەرەر، نـە هێنـانی سوود، نە بەردەوام بوونی ژیان نە مردن نە زیندووبوونـەوە ! ! جـا ئەگـەر ئەمانـەی هەموو تیا هاتەجێ ئائەوە بەندەی ڕاستەقینەیە.

پاشان کە دەڵێت: ((ناصـيَتي بيَـدكَ)) واتـە: تـۆ خـاوەنی مـنی چـۆنت بوێـت وا ڕەفتارم پێ دەکەیت، من خودی خۆم هیچم لە دەست نایەت، چۆن خۆی هیـچی لـە دەست دێت، کە خۆی لە ژێر دەستی پەروەردگار و گەورەکەیدا بێـت، نێـو چـەوانی

بەدەستی ئەو بێت، دڵی لە ژێر پەنجەکانی ئەودا بێت؟! مـردن و ژیـان و خۆشـی و ناخۆشی و چاکی و خراپی هەمووی لە دەستی خودای گەورە دابێت، بەندە هیچ لـە مانـەی لـە دەسـت نیـە، کـەوابوو لـە کۆیلـەش بێهێزتـرە کـە لـەژێر دەسـتی گەورەکەیدایە، چونکە ئەو نێوچەوانی بە دەستی پاشایەکی بەهێزە، چۆنی بوێت وا رەفتاری پیێ دەکات.

جا هەر کاتێك مرۆڤ ئەوەی هێنایە پێش چاوی خۆی کە نێوچەوانی ئەو و هەموو خەڵکی تریش تەنها بەدەستی خوایە چۆنی بوێت وا ڕەفتاریان پـێ دەکات، ئـەوا دڵنیا دەبێت و لە کەس ناترسێت، تکاش لە کەس ناکات، بـۆ کەسیش داناهێنێت، چونکە دەزانێـت هەموویان یەك بەڕێوەبەرو یەك هەڵسوڕێنەریان هەیە، هەر کەسێ ئەمە بێنێتە پێش چاوی خۆی ئەوا ملکەچی خوا دەبێت، بەهەمان شێوەش ئەگـەر خەڵکی ئەمەیان لەبەر چاو بێت ئـەوا هـەرگیز ملکەچـی ناکـەن بۆکـەس، ئـەو کات دەبێتە کەسێکی خواناس و ملکەچ و پشت دەبەستێت تەنها لەسەر خوا.

هەر بۆیـە (هـود) بـە گەلەکـەی دەفـەرموو: ﴿ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم مَّا مِن دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ (هود: ٥٦)، واتـە: مـن پـشتم بە خودا بەستووە و پشتیوانیم هـەر بەوە، کە پـەروەردگاری مـن و پـەروەردگاری ئێوەشـە، هـیچ گیانلەبـەرێك نیـە کـە جلـەوی بەدەسـت خـودای گـەورەوە نـەبێت، بێگومان پەروەردگارم لەسەر بەرنامە و ڕێبازێکی راست و دروستە.

کە دەڵێت: ((ماضٍ فِيّ حُكْمُكَ، عَدْلٌ فِيّ قَضَاؤك)) ئەم ڕستەیە دوو مانای لە خـۆ گرتووە.

یەکەم: بڕینەوەی بڕیاری خودایە بەرانبەر بەندەی خۆی.

دووەم: لە خۆگرتنی سـوپاس کـردن و دادپـەروەری خـوا، هـەر خـواش خـاوەنی مولك و سوپاسە، ئا ئەمە مانای ووتەکەی پێغەمبـەر (هـود)ە کـە دەیفـەرموو: ﴿مَّا مِن دَابَّةٍ إِلَّا هُوَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهَا ﴾ (هود:٥٦)، واتـە: هیچ گیانلەبەرێك نیە کە جلـەوی بەدەست خودای گەورەوە نەبێت.

پاشـان دەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ (هـود: ٥٦)، واتـــە: لەگـەڵ

ئـەوەش پادشـاو بەدەسـەڵات و هەڵسووڕێنەری بەندەکانیـەتی، لەسـەر ڕێگایـەکی ڕاستەو دادپەروەرانەیە.

بەڵێ: خوای گەورە دادپـەروەرە بەرانبـەریان لـە فەرمایشتەکانی و کارەکانی و بڕیارەکـانی و قــەدەری و فەرمانــەکان و قەدەغـەکراوەکانی و پاداشــت و ســزایی، هەواڵەکانی هـەر هـەمووی ڕاسـتە، بریارەکـانی هـەر هـەمووی دادپەروەرانەیـە، ئـەو کارانەی فەرمانی داوە بە کردنی هـەمووی سوود بەخـشە، ئـەو کارانـەی قەدەغـەی کردووە هەمووی بێ سـوودە، پاداشـت دانـەوەی کەسـێك، کـە شـیاوی پاداشـتە لـە فەزڵ و گەورەیی خۆیـەتی، سـزادانی کەسـێکیش کـە شـیاوی سـزایە لـە حیکمـەتی خۆیەتی.

جا پێغەمبەر ﷺ لەم حەدیسەدا (الحکم) و (القـضاء) ی لێك جیـا کردۆتـەوە، ووشەی ڕابردوو (ماضي) ی بۆ (القضاء) بە کارهێناوە، داپەروەریشی (العدلَ) ی بۆ (القـضاء) بـەکارهێناوە، چـونکە بڕیـار و حـوکمی خـودای گـەورە بڕیـاری (الـدیني الـشرعي) لـەخۆ دەگرێـت، بڕیـاری (الکـوني القـدري)یـش لـە خۆدەگرێـت، هـەردوو جۆرەکەش بەسەر بەندە سەپێنراوە و بەندە لەژێری دایە، جا حەز بکـات یـان حـەز نەکات، ئەوە بڕیاری بەسـەر دراوە، بـەڵکو بڕیـاری (الکـوني) بـە سـەریدایە هـەرگیز ناتوانێـت لێی لادات، بەڵام بڕیاری (الشرعي) بەسەریدا دەتوانێت لێی لادات.

کەواتە (القضاء) برینەوەی شتە، ئەمەش دوای بڕیار لە بارەی ئەو شتەوە دێت، کە دەفـەرمووێ: ((عَدْلٌ فِي قَضَاؤُكَ)) واتـە: ئەو بڕیارەی داوتـە بەسـەر بەندەکـەت دادپەروەرانەیە بۆ بەندەکەت.

بەڵام بڕیار دان بە ویـستی خـودای گەورەیـە، حـەز بکـات جـێ بـەجێی دەکـات، حـەزیش نـەکات جـێ بـەجێی ناکـات، ئەگـەر بێـت و بڕیارەکـە پەیوەسـت بێـت بـە ئاینەوە، ئەوە بڕاوەتەوە بەسەر بەندەدا، بـەڵام ئەگـەر بێتـو بڕیارەکـە پەیوەسـت بێت بە بوونەوەرەوە ئەگەر خودای گـەورە بیبڕێتـەوە ئـەوا جـێ بـەجێی دەکـات، ئەگەر نەشیبڕێتەوە لێی لادەبا، خـودای گـەورە چ بڕیـارێکی بوێـت دەیـدات، بـەڵام جگە لە خوای گەورە هەر کەسێکی تـر بڕیـار بـدات توانـای ئـەوەی نیە بڕیارەکـەی

بەجێ بگەیەنێت، خودای گەورە بڕیار دەدات و جێ بەجێشی دەکات.

کە دەفەرمووێ: ((عَدْلٌ فِي قَضَاؤكَ)) ئەوە هەموو ئەو کارانە دەگرێتەوە کە خودا بڕیاری داوە بەسەر بەندە، لە ساغی و نەخۆشی، لە دەوڵەمەندی و فەقیری، خۆشی و ناخۆشی، ژیان و مردن، سزادان و سزا نەدان... هتد.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ﴾ (الشوری:٣٠)، واتە: هەر بەڵاو نەهامەتیەکتان بەسەر داهاتبێت، ئەوە دەرەنجامی ئەو کارو کردەوانەیە کە بەئارەزووی خۆتان ئەنجامتان داوە.

دەفەرمووێ: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ﴾ (الشوری: ٤٨)، واتە: ئەگەر بەڵا و ناخۆشیان تووش بێت، ئەوە بەهۆی کارو کردەوە نەگریسەکانیانەوەیە، بەڕاستی مرۆڤ سپڵەیە!!

خودای گەورە هەر بڕیارێکی دابێت بەسەر بەندەکانیدا، ئەوە زۆر دادپەروەرانە نەبووە، ئەگەر پرسیار کرا و گوترا: کەسێك تاوانێك ئەکات - یان پیاوێك دەکوژێتەوە بە (قضاء و قدر)ی خودایە! باشە ئەگەر ئەوە بە (قضاء و قدر)ی خودایە! بۆ دەبێت خوا سزای بدات، کەوابێت ئەوە دادپەروەری چی تیایە؟! لە وەلامیدا گوتراوە: ئەمە پرسیارێکی گرنگە، ستەم (الظلم) لەلای (أهل السنة)ەدا دانانی شتێکە لە شوێنێك کە ئەم شوێنە شیاوی ئەو شتە نەبێت، وەکو سزادانی بەندەیەکی گوێڕایەڵ کە هیچ گوناهی نەبێت، ئەمەش دوورە لە خوای دادپەروەر، خوای گەورە لە زۆر شوێنی قورئاندا خۆی بەدوور گرتووە لەم کارانە، ئەگەر بیەوێت کەسێکیش گومڕا بکات، ئەوە لە دادپەروەری خۆیەتی، چونکە کەسێك گومڕا دەکات کە شیاو بێت پێی، چۆن ستەم دەکات لە کاتێکدا یەك لە ناوە جوانەکانی دادپەروەرە! خوایگەورە هەموو کار و فەرمانەکانی دادپەروەرانەیە و بەجێیە، لە دادپەروەری خودای گەورە ئەوەیە کە ڕێگای ڕاستی بۆ خەڵکی ڕۆشن کردۆتەوە، پێغەمبەرانی بۆ ناردوون، قورئانی بۆ ناردوون، خراپەی بۆ روون کردۆتنەوە، ڕێگای گەیشتن بەهیدایەتی بۆئاسان کردوون، بە هۆی بیستن و بینین و

ژێرییەوە، ئا ئەمانە هەر هەمووی لە دادپـەروەری خـودای گەورەوەیـە، ئـەو کەسـە سەرفراز دەکات، کە حەز لە سەرفرازی دەکاو شیاوی سەرفرازیە، ئەمەش لەفەزڵ و بەخششی خـوای گەورەوەیـە، ئـەم کەسـەش گـومڕا دەکـات کـە خـۆی حـەزی لـە گومڕاییەو شیاوی سەرفرازی نیە، بەخشش و فەزڵی خۆشی پێ نابەخشێت، ئەمەش لە دادپەروەری خۆیەتی.

## گومڕایی و سەرگەردانی مرۆڤ دوو جۆرە:

یەکەم: خوای گەورە بۆیە ئەو بەندەی گـومڕا کـردووە، وەکـو سـزادانێك چـونکە پـشتی لـە دیـنی خـوا کـردوە و ڕووی کردۆتـە دوژمنـانی خـوا و گوێڕایـەڵی ئـەوان دەکات، یاد و ستایشی خوای فەرامۆش کردووە و بیری چووە، کەوابوو ئـەم مرۆڤـە شیاوە کە خوا گومڕا و سەرگەردانی بکات.

دووەم: خوای گەورە نایەوێت هەر لە سـەرەتاوە ئـەو مرۆڤـە سـەر کەشـە گـومڕا بکات، بەڵام کە بەدیکرد ئـەم مرۆڤـە ڕێـز لـە بەخـششی هیدایـەت نـاگرێ و شـیاوی سەرفرازی نیە، خۆشی بە بەختەوەری هیدایەت نایـەت و سـوپاس و ستایـشی خـوا ناکات لەسەری، بۆیەش خوا هیدایەتی نادات و سەرگەردانی دەکات، چونکە شـیاوی نیە، هەر وەك خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوا أَهَٰؤُلَاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّن بَيْنِنَا ۗ أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ﴾ (الانعـــــام: ٥٣)، واتـە: ئێمە هێندێکیان بە هێندێکاین تاقی دەکەینەوە تاکو بـێ بـاوەڕان بلـێن: ئایـا ئەوانە خوا ڕێزی لێناون لـە ناوماندا؟! ـ ئـەی ئێمـە شیاوی ڕێـز نـین ــ ئایا خـوا نازانێت کێ سوپاس گوزارە.

لەئایەتێکی تر دەفـەرمووێ: ﴿وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴾ (الانفـال: ٢٣)، واتـە: ئەگەر خودا خێری تیا بەدی بکردنایە، ئەوە وای لێدەکردن کـە حـەق و ڕاستی ببیستن.

کەواتە ئەگەر خوای گەورە کەسێکی گومراکرد، ئەوە لە دادپەروەری خۆیەتی - چونکە ئەو مرۆڤە شیاوی هیدایەت نیەو شیاوی گومڕاییە - هەروەکو چۆن وای کردووە مار و دووپشك و سەگی هار ژەهراویی و کوژێنەربن، بە هەمان شێوەش کە ئەمەش هەر لە دادپەروەری خۆیەتی.

بە درێژی باسی ئەم بابەتەم کردووە لەو کتێبە گەورەیەی کە باسی ((القضاء و القدر)) دەکات[1].

(١) مەبەستی کتێبی ( شفاء العليل في مسائل القضاء والقدر والحكمة والتعليل).

## (التوسل) پاڕانەوە بە ناو و سیفاتەکانی خودا

کە دەفەرمووێ: ((أسألُكَ بِكُلِ اِسمٍ...)) تا کۆتایی، ئەمە (توسل)ە بە هەموو ناوە جوانەکانی خوا، ئەو ناوانەی بەندە پێی گەیشتووە و دەیزانێت، ئەو ناوانەش کە پێی نەگەیشتووە و نایزانێت..

ئەم (التَوَسُل)ە بە ناوە جوانەکانی خوا زۆر لای خوای گەورە خۆشەویستە، چونکە پارانەوەیە بەکار و سیفاتەکانی، کە مانای ناوە جوانەکانی تیایە.

### قورئان ڕووناکی و بەهاری دڵان

پێغەمبەرﷺ کە دەفەرمووێ: ((أنْ تَجْعَلَ القُرآنَ رَبِيعَ قَلْبِي وَنُورَ صَدْرِي))
(ربیع) واتە: ئەو بارانەی کە زەوی دەژێنێتەوە. جا پێغەمبەرﷺ قورئانی شوبهاندووە بەم بارانە، چونکە ئەم قورئانە ژیانی دڵی پێوە بەندە.

پێغەمبەرﷺ لەم حەدیسەدا ئاو کە ژیانی پێ چەنگ دەکەوێت، نوریش کە ڕووناکی ژیانی پێ چەنگ دەکەوێت پێکەوەی کۆکردۆتەوە، هەر وەك خوای گەورەش پێکەوەی کۆکردۆتەوە کە دەفەرمووێ: ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌۢ بِقَدَرِهَا فَٱحْتَمَلَ ٱلسَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا ۚ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِى ٱلنَّارِ ٱبْتِغَآءَ حِلْيَةٍ﴾ (الرعد: ١٧)، واتە: خوای گەورە لە ئاسمانەوە بارانی باراندوە، بە ئەندازەی ئەو دۆڵ و شیوە، جا بەهۆی ئەم بارانەوە پڕ دەبن - ئینجا لافاو دروست دەبێت - ئەو لافاوەش کەف و کوڵی بەرزی هەڵگرتوە، لەسەر ڕووی ئەو کانزایانەش کە ئاگری تێبەردەدەن و دەیتوێننەوە بە ئاگر بۆ دروست کردنی خشڵ یان بۆ پێویستی تر کەف وکوڵ دروست دەبێت، وەکو کەفی سەر ئاوەکە.

هەروەها فەرمووێ: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّآ أَضَآءَتْ مَا حَوْلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمْ﴾ (البقرە:١٧)، واتە: نموونەی ئەوانە وەکو کەسێك وایە، کە ئاگرێك دابگیرسێنێت، کەچی کاتێك ئاگرەکە هەڵگیرسا و دەوروبەری خۆی ڕۆشن

کردەوە، خوا ڕووناکیەکەیان لیٚ بکوژێنێتەوە.

لەئایـەتێکی تــر دەفــەرمووێ: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ (النور:٣٥)، واتــە: خـوای گەورە نور و ڕووناکی ئاسمانەکان و زەویە، نموونـەی نورەکەشی وەك تاقێك وایـە کە چرایەکی تێدابێت، چرایەکەش لـە نـاو شووشـەیەك دابێـت، شووشـەکەش وەك هەساریەکی پرشنگدار وابێت، کە داگیرساوە لە ڕۆنی بەفەڕی زەیتوون، نە ڕووی لـە ڕۆژهەڵاتە نە ڕووی لە ڕۆژئاوایە، ڕۆنەکەشی خەریکـە خـۆی دابگیرسـێت و ڕوونـاکی بداتـەوە، ئەگەرچـی ئـاگریش نـەیگاتیٚ، ئـەم قورئانـە نـوری وەحیـە لەسـەر نـوری فیترەت، خوای گەورەش ڕێنمایی ئەو کەسانە دەکات کە دەیەوێت و شایستەن بـۆ نورەکەی، خوای گەورە نموونە دێنێتەوە بۆ خەڵکی ـ تاکو تێبگەن ـ خوای گـەورە زانایا بە هەموو شتێك.

پاشان دەفــەرمووێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزۡجِي سَحَابٗا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيۡنَهُۥ ثُمَّ يَجۡعَلُهُۥ رُكَامٗا فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ يَخۡرُجُ مِنۡ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٖ فِيهَا مِنۢ بَرَدٖ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصۡرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُۖ يَكَادُ سَنَا بَرۡقِهِۦ يَذۡهَبُ بِٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾(النور: ٤٣) واتـە: ئایا نابینیت کـە خـوا شـنەی هـەورەکان بـە ئاسمانـدا دەبـات بـەڕێوە؟! دوایـی پەیوەسـتیان دەکـات بەیەکەوە، ئینجا کەلەکەیان دەکات لەسەر یەك کە دەبینیت لە توێی ئەو هەورانەوە کە وەکو کێو وان باران و تەزرە دەبارێنێت، جا خوا خێـر و بەرەکـەت دەبەخـشێت بە هەرکەسێك کە بیەوێـت، هـەر کەسـیش کـە خـوا بیـەوێت لێـی دوور دەخاتـەوە، خەریکە برووسکەکەی بینایی چاوان بەرێت.

فەرموودەکەی ڕابردوو ئەم دوعایەی لە خۆ گرتووە کە دڵـی زینـدوو بکاتـەوە بـە بەهاری قورئان و دڵی پیٚ ڕۆشن بکاتەوە.

خـــوای گــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ﴾ الانعام: ١٢٢)، واتــە: ئایا ئـەو کەسەی کە مردوو بوو، چونکە بێ باوەڕ بووە ئینجا بـەهۆی ئیمانـەوە، زینـدوومان کـردەوە، نـور و ڕووناکیمـان بـۆ سـاز کـرد لـە ژیانیـدا کـە قورئانـە لـەناو خەڵکیـدا پێدەڕوات هەڵسوکەوتی پێ دەکات، وەکو ئەو کەسە وایە کـە لـە نـاو تاریکایەکانـدا گیری خواردوە لێی دەرناچێت؟!

چونکە سینگی مرۆڤ فـراوانترە لـە دڵـی کـە دڵ لـە نـاو سینگ دایـە، بۆیـە ئـەو ڕووناکیەی ناو سینگی مرۆڤەکە دڵیشی ڕوناك دەکاتـەوە، لەبـەر ئـەو ڕوناکیـەی لـە سنگی دایە دڵـیش ڕونـاك دەکاتـەوە، لـە هـەمان کاتیـشدا دەبیـنین زینـدوو بـوونی ئەندامەکانیش پەیوەستە بە ئێدانی دڵەوە، کـەوابوو دڵ ژیـان بـە هـەموو جەسـتەی دەبەخشێ.

هەر بۆیەش دەبینین پێغەمبـەرﷺ داوای ژیـانی دڵ دەکـات، بـە هـۆی ئیمـان و قورئانەوە کە وەك باران وایە بۆ ژیان.

چونکـە (الحزن) و (الهـم) و (الغـم) دڵ دەمرێنن و ڕوونـاکی نـاهێڵن لـە نـاو دڵـدا، دەبیـنین پێغەمبـەرﷺ داوای کـردووە بـە قورئـان تیمـاری بکـات و ئـەم دەردانـە لابەرێت، لەبەر ئەوەی قورئان باشترین دەرمانە بۆ ئەم دەردانە، بەڵام تیمـارکردن و لابردنی (الحزن) و (الهم) و (الغم) بە قورئان نەبێت هەرگیز لاناچێت، چـونکە ئەگـەر بێت بەهۆکاری تر بیەوێت ئەو دەردانەی لێ دوور بکەوێتەوە، وەکو ئـەوەی بیـەوێت (الحـزن) و (الهـم) و (الغـم)کـەی بـە پلەوپایـە و خێـزان و منـداڵ و مـەتاعی دونیـا نەیهێڵێت، ئەوە بێگومان بە کـاتی ئـەو دەردانـەی لێ لا دەچێت، بـەڵام بـە نـەمانی مەتاعەکانی دنیا غەم و نیگەرانیەکەی بۆ دێتەوە.

## جیاوازی مانای (الحزن) و (الهم) و (الغم):

ئەم سیانە پەیوەستە بەو کارە ناخۆشانەی کە دڵ پێی ناخۆشە..(الحـزن): بەو ڕووداوو شتە ناخۆشانە دەگوترێ کە ڕوویاندابێت، ئەوە پێی دەگووترێت: (الحـزن)، (الهـــم): بـەو ڕوودا و شـتە ناخۆشـانە دەگـوترێ کـە خـەیاڵات بـن و هێـشتا ڕوویاننـەدابێت، ئـەوە پێـی دەگووترێـت: (الهـــم)، (الغـــم): بـەو ڕووداوو شـتە ناخۆشـانە دەگـوترێ کـە ئامـادەبن و ئێـستا ڕووبـدەن، ئـەوە پێـی دەگووترێـت: (الغـم).

## دڵ مەنزڵگای خواناسی و خۆشەویستیە

فـراوانترین و بەشـکۆترین و بـەڕێزترین و بـەرزترین و پڕشـنگدارترین و پـاکترین دروست کراوی خودا، عەرشی خوای گەورەیـە، هـەر بۆیـەش گونجاوە بـۆ بارەگـای خوای گەورە، بەهەمان شێوەش هەر شتێك لە عەرشـەوە نزیکـە، ئـەوە زۆر پـاك و بەڕێز و پرشنگدارترە لەو شتانەی کە لە عەرشەوە دوورن.

بۆیە بەهەشتی (الفردوس) خۆشترین و بەرزترین و بەشکۆترین و پرشـنگدارترینی بەهەشتەکانە، چونکە لە عەرشەوە نزیکـە کـە سـەقفی (الفـردوس) عەرشـی خـودای گەورەیە.

هـەر شـتێکیش دوربێـت لـە عەرشـەوە، ئـەوە زۆر تاریـك و تەنگـە، بۆیـە (اسـفل السافلین) لە دۆزەخ خراپترین و تەنگترین شوێنە.

بەڵـێ: خوای گەورە دڵی مرۆڤی کـردوە بـە مۆڵگـە بـۆ خۆشەویـستی و ناسـین و کارکردن بۆ خۆی، ناسـینی و خۆشەویـستی خـوا نموونـەی بەرزیـە لـە دڵـی مرۆڤـی بڕوادار خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ (النحل:٦٠)، واتـە: ئەوانەی کە بڕوایان بە قیامەت نیـە، نموونـەی کـاری خراپـەن، خـوای گـەورەش نموونـەی بەرزیـە و خـاوەنی هـەموو

سیفاتێکی بەرزو بڵند و پیرۆزە، خوای گەورە (ٱلْعَزِيزُ) و (ٱلْحَكِيمُ)ە.

هـەروەها دەفـەرمووێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ (الروم:٢٧)، واتـە: هـەر خوای گەورە بەدیهێنراوەکانی بەدی دەهێنێت، پاشان دیسان دروستیان دەکاتەوە، ئەو کارەش بۆ خوا زۆر ئاسانە، نموونەی بـەرز و بڵنـدی هـەر شایستەی خوایـە لـە ئاسمانەکان و زەویدا، خوای گەورە (العزیز) و (الحکیم)ە.

هـەروەها دەفـەرمووێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ﴾ (الشوری: ١١)، واتـە: هـیچ شتێك لە خوای گەورە ناچێت.

ئەمـە نموونـەی دڵـی بـڕواداره کـە وەك عەرشـێك بۆتـە مۆڵگـەی خواناسـی و خۆشەویستی، لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە دڵ لەئەسڵدا پـاکترین شـوێنە، چـونکە ئەگەر دڵ لە هەموو شـتێك پـاکتر و بێگـەردتر وشـیاوتر نەبوایـە، ئـەوە هـەر گیـز ناسینی و خۆشەویستی خوای جێ نەدەبووە.

بەڵام ئەگەر دڵی مرۆڤ پەیوەست بوو بە دنیاوە ئـەوە ئـەو دڵـە تـەنگ دەبێـت و تاریك دەبێ و هەرگیز کامەران و سەرفراز نابێت.

## دڵ دوو جۆرە:

*ـ دڵێکیان عەرشی خوای گەورەیە کە دڵێکی زیندووە و پڕە لـە نـوور کامـەرانی و خۆشی و ئاسوودەیی و شتی چاکە.

*ـ دڵێکیشیان عەرشی شەیتانە کە دڵێکـی مـردووە و تـەنگ و تاریـك و غـەمگین و خەفەتبار و بێ تاقەتە، کـە بـەردەوام غـەمبارە بەرانبـەر ئـەو کارانـەی لـە دەسـتی چووە، بەردەوام بیردەکاتەوە لەو کارانەی کە دێت، بەردەوام دڵتەنگە لـەو ژیانـەی کە تیایدایە، پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێ: ((اذا دَخَلَ النُّورُ الْقَلْبَ، انْفَسَحَ وَ انْشَرَحَ، قَـالُوا: فَمَا عَلَامَةُ ذلِكَ يَا رَسُولِ اللهِ؟ قَـالَ: الإِنَابَـةُ الـى الـدارِ الخُلُـودِ، وَ التَّجَـافِي عَـنِ الـدّارِ الْغُرُورِ،

وَالإِسْتِعْدَادِ لِلْمَوْتِ قَبْلَ نُزُولِـهِ))[1].

واتـە: هـەرکاتێك نـووری ئیمـان چـووە نـاو دڵێـك، ئـەوکات ئـەو دڵـە کامـەران و ئاسوودە دەبێت، ـ هـاوەڵانیش ــ گووتیـان ئـەی پێغەمبـەری خـودا نیـشانەی ئـەو نوورو ئیمانە چییە کە دەچێتە ناو دڵ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نیشانەکەی ئەوەیە مرۆڤ ڕوبکاتە ماڵی هەتا هەتایی و کارکردنە بۆی کە بەهەشتە، پـشت هەڵکردنـە لـە دنیاو خەریك نەبوونە پێیەوە، خۆ ئامادەکردنە بۆ مردن پێش ئەوەی بیگاتێ.

ئەو نوورەی دەچێتە دڵـەوە، نـووری خواناسـی و ئیمانـە، جـا بۆیـە دڵەکـە بـەم نوورە کامەران و ئاسوودە دەبێت، بەڵام ئەگەر نووری خواناسی و ئیمان نـەبێت دڵ ڕۆشن نەکاتەوە، ئەوە ئەو دڵە هەر تاریك و تەنگـە.

(١) ضعیف: بڕوانـە: (الوابل الصیب)ی (ابن القیم) (ل:١٢٢).

# ووردبەوە لە قورئان

**هەناسەی شادی و ئارامی دەچێژی**

موسڵمانی ئازیز: وورد بـەوە لـە قورئـانی پـیرۆز و تێـی بفکـرە، ئـەوکات هەست دەکەی و دەبینی پادشایەك هەیە کە هەموو شتێك لە ژێر دەسەڵاتی ئەو دایە، هـەر ئەو خاوەنی هەموو شتێکە، هەموو کارێکی ستایش کراو لەوەوەیە، جڵـەوی هـەموو شتێك بەدەست ئەو دایە، گەڕانەوەش هـەر بۆلای ئـەوە، جێگیرە لەسـەر کورسـی دەسەڵاتیدا، هیچ شتێك لەژێر دەسەڵات و نیشتمانی ئەودا شاراوەنیە، بـەڵکو زانـا و بە ئاگایە بە چرپەی ناو دڵی مرۆڤەکان بە ئاگا و دانایە بەهـەموو کـارێکی پـەنهان و ئاشکرایان، بە تەنها نیشتمانەکەی دەبات بەڕێوە، ئەم پادشا بەدەسەڵاتە کە خوای گەورەیە، دەبیسیێ و دەبینیێ، دەبەخشیێ و دەگرێتەوە، مرۆڤ لەسەر چاکە پاداشـت دەکات و لەسەر خراپەش سزادەدات، کەسێك کە شیاوی ڕێز بێت بەڕێزی دەکات لە لای خەڵك، کەسێکیش کە شیاوی ڕێز نەبێت بێ ڕێزی دەکـات، بەدیهێنـەرە و ڕۆزی دەریشە، دەمرێنیێ و دەژیێنێت، تەقدیر دەکا و قەزاش دەکات بەڕێوەبەریشە.

هەموو کارێك لە خزمەت ئەوەوە نازل دەبێت، هەموو کـارێکیش بـەرز دەبێتـەوە بۆ خزمەت جەنابی، هەر گەردیلەیـەك کـە دەجولێـت بـە فـەرمانی ئـەوە، هـەر گـەڵا دارێك کە هەڵدەوەرێت خوای گەورە زاناو بە ئاگایە لیێ ی.

موسڵمانی بەڕێز: وورد بـەوە لـە قورئـانی پـیرۆز بڕوانـە کـە چۆن خـوای گـەورە ستایش و سوپاس و ڕێـزداری خـۆی دەکـات، بڕوانــە چۆن بەنـدەکانی ئامۆژگـاری دەکات بۆ ئەو کارانەی سەرفرازی و کامەرانی ئەوانی تیایە، هانیان دەدات ئـەنجامی بدەن، ئاگاداریشیان دەکاتەوە لەو کارانە کە سەرگەردانی ئەوانی تیادایە، خۆی بـە بەندەکانی دەناسێنێت بە ناو و سیفاتەکانی، بەخـشش و نیعمەتـەکانی خـۆی بـیری بەندەکانی دێنێتەوە تاکو خۆشیان بوێت، فەرمانی واجباتیان پێدەکات، ئاگاداریان

دەکاتـەوە لـە سزای خۆی، بۆیـان ڕوون دەکاتـەوە ئەگـەر گوێڕایـەڵی بکـەن ئـەوە بەهەشتی بۆ ئامادەکردوون، بـەڵام ئەگـەر بـێ فـەرمانی بکـەن ئـەوە دۆزەخـی بۆ ئامادەکردوون، چارەنووسی پیاو چاکان و پیاو خراپانیشی بۆ ڕوون کردوونەتـەوە کـە هەرلایـەکیان چارەنووسـی خـۆی هەیـە، ستایـشی کـارو کـردەوە چـاکەکانی دۆستەکانی کردووە، سەرزەنشتی کارو کردەوە خراپەکانی دۆژمنەکانی کردووە.

نموونـە دێنێتەوە بۆ بەنـدەکانی تـاکو بـە ئاسـانی تێبگـەن، بەڵگـە و نیـشانەی جۆراو جۆریشیان بۆ دێنێتەوە، بە جوانترین شێوەش وەڵامـی گومـانی دوژمنـەکانی دەداتەوە، ڕاستگۆ بە ڕاست دادەنێت، درۆزنـیش بـە درۆ دادەنێـت، فـەرموودەکانی هـەر هـەمووی ڕاسـتە، هـەر ڕاسـتیش دەفـەرمووێ، ڕێپیـشاندەری ڕێگـای ڕاسـتە، بەنـدەکانی بـانگ دەکـات تـاکو کـاری چـاکە ئـەنجام بـدەن بـەڵکو پاداشـتیان بـە بەهەشت بداتەوە، باسی خۆشی و بەخششەکانی بەهەشت دەکـات، تـاکو کـاری بۆ بکەن، بەندەکانی ئاگادار دەکاتەوە لە دۆزەخ، باسی ئێش و ئـازار و ناخۆشـیەکانی دۆزەخیش دەکات، تاکو خۆیانی لێ بپارێزن بۆ بەنـدەکانی ڕوون دەکاتـەوە کـە لـە هـەموو کارێکـدا ئاتـاجی ئـەون، بـەڵکو بـە ئەنـدازەی چـاو تروکـانێکیش بـێ ئـەو سەرگەردانن، ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە دەوڵەمەندە و پێویستی و ئاتاجی بە هـیچ دروست کراوێکدا نیە، بەڵکو هەموو شتێك پێویستی و ئاتاجی بەوە، هـەر کەسێك شتێکی چاکەی بێتە ڕێ ئەگەر بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێت ئـەوە لـە فـەزڵ و بەخشـشی خـوای گەورەیـە، هـەر کەسـێکیش ناخۆشـیەکی بێتـە ڕێ ئەگـەر بـە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێت ئەوە لە حیکمەت و دادپەروەری خوای گەورەیە.

بڕوانـە خـوای گـەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا زۆر بـە لـە تیفانـەوە سەرزەنـشتی خۆشەویستەکانی خـۆی دەکـات، لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە هەڵخلیسکان و هەڵـەکانیان دەبوورێت و عوزریان لێ قبوڵ دەکات، بەزەیی پیایانا دێتەوە و سـەریان دەخـات و ڕزگاریان دەکات لە تەنگ و ناخۆشیەکاندا، بە وەفایە بەرانبـەر بە پـەیمانـەکانی لـە ئاسـت بەنـدەکانی، هـەر ئـەو زاتـە پادشـای ڕاستەقینەیانە و سـەرخەریانە بەسـەر

دوژمنەکانیاندا، ئەو زاتە چاکترین پادشا و چاکترین سەرخەرە بۆ بەندە.

هەر کاتێك دڵ لە قورئانی پیرۆز ورد بۆوە بۆی ڕوون بۆوە پادشایەکی گەورە و بە ڕەحم و سەخی و جوان هەیە ئەمەش سیفاتەکانیەتی ئەوکات چۆن خۆشی ناوێت! بەڵکو پەلە دەکات بۆ نزیك بوونەوە لەم زاتە، هەموو سات و کاتەکان لە گوێڕایەڵی ئەودا دەبەخشێ، خۆشەویستی و ڕەزامەندی خوایی زۆر لا بەنرخ دەبێ و پێش خۆشەویستی و ڕەزامەندی هەموو شتێکی تری دێخێت، ئەگەر حەقیقەتی ئەم زاتەی بۆ ڕوون بۆوە ئەوکات چۆن شادمان و زمان پاراو نابێت بە یادی خوا، چۆن خۆشەویستی و ئیشتیاقی ئەو زاتە نابێت، لە کاتێکدا زکر و یادی ئەو زاتە خۆراك و دەرمان و هێزیەتی بە شێوەیەك ئەگەر بێتوو ساتێك بێ ئەو زاتە بێت ئەوا سەرگەردان دەبێت و سوود لە ئاسوودەیی ژیان وەرناگرێت؟!

# دڵت بە چی پڕ دەکـــەی؟!

ئەگەر بتەوێت هەرشتێك لـە شـوێنێك دابنێیـت، دەبێـت دژەکـەی لابـەری، ئەمـە چۆن لە خودی مادەدا هەیە بەهەمان شێوەش لە بیر و باوەڕدا بەدی دەکرێت.

هەرکاتێك دڵ پر بوو لە خۆشەویستی و بیر و باوەری پـوچ، ئـەوە هـیچ شـوێنێك نامێنێت بۆ بیر و باوەڕی ڕاستەقینە و خۆشەویـستی خـودا، هـەر وەك چـۆن زمـانی مرۆڤێك بەردەوام قسەی بـێ کـەلك و بـێ سـوود بکـات، ئـەوە پێـی ناکرێـت قـسەی بەسوود بکات تاکو وازنەهێنێت لە قسەی بێ سوود.

هەروەها ئەندامەکانی مرۆڤ ئەگەر سەرقاڵ بن بـە غـەیری بەندایـەتی خـوا، ئـەوە ناتوانێت سەرقاڵ بێت بە بەندایـەتی خـوا تـاکو واز نـەهێنێت لـە غـەیری بەندایـەتی خوا.

هەروەها ئەگەر دڵێك سەرقاڵ بێت بە غەیری خۆشەویستی و هۆگری و ئیشتیاقی خوا، ئەوکات ئەو دڵە ناتوانێت سەرقاڵ بێت بە خۆشەویتسی و ئیشتیاق بۆ گەیشتن بە خوا تاکو دڵی چۆڵ نەکات لەم کارە زەرەر مەندانە.

هەروەها زمان و ئەندامەکانی مرۆڤ ناتوانن خزمەت و زکر و ملکەچـی خـوا بکـەن تاکو وازنێنن لە خزمەتکردن و زکر و ملکەچی غەیری خوا.

هەرکاتێك مرۆڤ دڵی سـەرقاڵ بـوو بـە دروسـت کراوەکـانی خـوا و بەزانـستی بـێ سوود، ئەوە هیچ شوێنێك نامێنێت بۆ سـەرقاڵ بـوون بـە بەندایـەتی خـواو ناسـینی ناوو سیفات و شەرعی خوا.

نهێنی ئەمەش ئەوەیە: کە گوێ گرتنی دڵ وەکو گوێ گرتنی گوێچکە وایـە، هـەر کـاتێ دڵ گـوێ بگـرێ بـۆ غـەیری فـەرموودەی خـوا، ئـەوکات هێـزی گـوێ گـرتنی نامێنێت و سوود لە فەرموودەی خوا وەرناگرێت، هەر کاتێك دڵ وێردی کەسێکی تـر بکات جگە لە خوا، ئەوکات ناتوانێت وێردی خوای گەورە بکات.

لە حەدیسی (صحیح)دا هاتووە پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێ: ((لأنْ يَمتَلِيءَ جَوفُ أحَدِكُمْ قَيْحَا حَتى يُرِيَهُ خَيرٌ لَهُ مِنْ أنْ يَمْتلِيءَ شِعْرَا))(١)، واتـە: سینەی یەکێك لە ئێوە پڕ بێت لە کێم تـاکو سینەکانی پـڕ دەبێـت لـە کـیم زۆر چاکترە بـۆی لـەوەی کـە سینەی پڕ بکات لە شیعر.

پێغەمبەرﷺ ڕوونی دەکاتەوە کە دڵ و هزری مرۆڤ پڕ دەبێت لەشیعر و گومـان و ئەندێشە و چیرۆك و پێکەنین و زانستی بێ سوود و چەندانی تـریش، جـا کاتێـك دڵ پـڕ بـوو لـەم شـتانە، ئـەوکات ئایەتـەکانی قورئـان و زانـستی بـە سـوود دێـت بـۆ نیشتنەوە لەسەر ڕووپەری دڵی، بەڵام دەبینێت هیچ شوێنێك نەماوە بۆ نیشتنەوەی بۆیە ڕوودەکاتە لایەکی تر، هەر وەك چۆن ئامۆژگاری مرۆڤێك بکەی کە دڵی پڕ بێت لە پێچەوانەی ئەم ئامۆژگاریانە بە جۆرێـك بـواری دەرچوونیـشیان نـەبێت، ئـەوکات ئەو دڵـە ئەو ئامۆژگاریانە وەرناگرێت و ئامۆژگاریەکان جێگایان نابێتەوە لەو دڵەدا.

---

(١) صحيح: رواه البخاري (١٠/٤٥٣)، مسلم (٢٢٥٧)، الترمذي (٢٨٥٥).

# تەفسیری (الهاكم التكاپـــر)

خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ ۝٢ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ۝٣ ثُمَّ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ۝٤ كَلَّا لَوۡ تَعۡلَمُونَ عِلۡمَ ٱلۡيَقِينِ ۝٥ لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ۝٦ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ۝٧ ثُمَّ لَتُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ۝٨﴾(سورة التكاثر) واتـە: گاڵتە و گەپ و سەروەت و سامانی دنیا ئێوەی بێ ئاگا كردووە، تا ئەو كاتەی كە دەمرن و دەبرێتە گۆرستان، واز بهێنن لەمەودوا تێدەگەن و دەزانن! دیسانەوە دەڵێم: واز بهێنن! وانیە كە خۆتان ئەیزانن ئەگەر ئەنجامی خۆتان بزانیایە بەڕاستی ئەوە وا بێ ئاگانەدەبوون، بێگومان دۆزەخ ئەبینن، دووبارە بەچاوی سەرتان دۆزەخ ئەبینن، پاشان لەو ڕۆژەدا پرسیاری هەموو ناز و نیعمەتێكتان لێ دەكرێتەوە.

ئا ئەم سوورەتە پەیمانی خوای لـە خـۆ گرتـووە، سەرزەنـشتی خواشـی لـە خـۆ گرتووە، ئامۆژگاری ناو ئەو سوورەتە بەسە بۆ كەسێك كـە هۆشمەنـد بێـت، خـوای گەورە كە دەفەرمووێ: (ألهاكم) واتـە: بەشێوەیەكی وا ماڵی دنیا سەرقاڵی كـردووە كە هیچ پاساوی بۆ نیە.

سەرقاڵ بوون بەگاڵتە وگەپ ئەگەر بە دڵەوە بێت، ئەوە لۆمـەی لەسـەرە، بـەڵام ئەگەر بە دڵەوە نەبێت، ئەوكات لۆمەی لەسەر نیـە، چـونكە جۆرێكـە لـەبیر چـوون، هەر وەك پێغەمبەر ﷺ لەبارەی پۆشاكەكەیەوە فـەرمووی: ((إنهـا ألهتنـی آنفـا عـن صلاتی))[(١)]، واتـە: بەراستی ئەمە لە نوێژەكەم سەرقاڵی كردم.

دەگووترێ: (لها بشيء) واتـە: سەرقاڵ بووە بەو شتە.

هەروەها دەگووترێ: (لها عنـه) واتــە: پـشتی لـێ هەڵكـرد.جـا ووشـەی (اللـهو) پەیوەستە بە دڵەوە بۆ دڵ بەكار دێت واتـە: بە دڵ سەرقاڵ بێت بە شتێك، ووشـەی

---

(١) صحيح: رواه البخاري(٤٠٦/١و ٤٠٧)، ابو داود (٩١٤)، النسائي (٧٣/٢)، احمد (٣٧/٦و٤٦).

(اللعب)یش پەیوەستە بە ئەندامەکانی لاشەوە بۆ جەستە بەکار دێت واتە: بە ئەندامەکانی سەرقاڵ بێت بە شتێك، هەر بۆیەش لە زۆر شوێنان ئەم دوانە پێکەوە کۆ دەکرێنەوە وەك دەگوترێ: (اللهو و اللعب)، خوای گەورەش لێرەدا جوانی فەرمووە: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾ (سورة التكاثر).

دەبینین (أَلْهَىٰكُمُ)ی بە کارهێناوە کە زۆر رەوانترە لەوەی بگووترایە: (شغلکم) چونکە (شغل) واتە: سەرقاڵ بوون بە شتێك بەڵام دڵ بێ ئاگا نیە لە کاتی سەرقاڵیەکە، (اللهو) بێ ئاگای و پشت لێ هەڵکردنیشە.

(ٱلتَّكَاثُرُ) لەسەر سیغەی (تفاعل)ە لە (الكثرة)وە هاتووە واتە: زۆر و بۆری.

هەر شتێك لە بەندە زۆر بێت جگە لە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی و ئەو شتانەی سوودمەندە بۆ قیامەتی، ئەوە دەچێتە ژێر ڕکێفی ئەم زۆریەوە، زۆری لە هەموو شتێکدا هەیە وەك: زۆری ماڵ و منداڵ و پلەو پایە و ئافرەت و زانست و زۆر وتن و زۆری کتێب و نووسین و لێکۆڵینەوە.

(ٱلتَّكَاثُرُ) زۆری، ئەوەیە کە مرۆڤ داوا بکات زۆرتری هەبێت لە خەڵکی تر، ئەمەش پەسندنیە و لۆمەی لێ کراوە، مەگەر بۆ شتێك بێت کە پێی لەخوا نزیك بێتەوە، ئەوکات داوا کردنی زۆر، دەبێتە پەلەکردن بۆ خێر و چاکە، لە (صحیح المسلم)دا هاتووە پێغەمبەر ﷺ سورەتی ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾ی دەخوێند، پاشان فەرمووی: ئادەمیزاد هەر هەڵپە و هاواریەتی بۆ ماڵ و دەڵێ: ماڵەکەم واو ماڵەکەم وا: ئایا پێم ناڵێی ئەم ماڵەی تۆ کامەی هی تۆیە، جگە لەوەی کە دەیکەی بەخێر و لە پێش خۆتەوە بە ڕێی دەکەی بۆ قیامەت، یان دەیخۆی و لە ناوی دەبەی لە پێش مردنتا، یا لە بەری دەکەیت تاکو کۆن دەبێ و دەدرێت[1].

---

(١) صحیح: رواه مسلم (٢٩٥٨)، الترمذی (٣٣٥١)، النسائی (٦/٢٣٨).

# چەند ئامۆژگاریەکی زێڕین

* هەر کەسێك سوود لـە چاوی وەرنـەگرێت، سوود لـە گوێیـشی وەر ناگرێـت، واتـە: ئەگەر مرۆڤ بە چاو ئـەو هـەموو بەڵگـە جوانانـەی، کـە خـودا خوڵقاندوویـەتی دەیبینێت سوود وەرنەگرێت، ئەوکات هەر چەندی لەگەڵ بڵێ ی گوێیـشی سـوودی پێناگەیەنێت.

* پەردە و نهێنیەك لە نێـوان خـودا و بەنـدەدا هەیـە، پـەردە و نهێنیـەکیش لـە نێوان بەندە و خەڵکیدا هەیە، جا هەر کاتێك بەندە ئەو پەردە و نهێنیـەی هەڵدرانـد کە لە نێـوان خـۆی و خـوادا هەیـە، ئـەوا خـوای گـەورەش نهێنیـەکانی ئـەو لـە نێـو خەڵکی ئاشکرا دەکات.

*مرۆڤ پەروەردگارێکی هەیە ڕۆژێك دێت هەر بە خزمەتی دەگات، خانوویەکیشی هەیە بۆ ئەوەی تیایـدا بحەسێتەوە ــ کە بەهەشـتە ــ ، کەواتـە پێویـستە لەسـەر مرۆڤی ژیر پەروەردگاری لـە خـۆی ڕازی بکـات پـێش ئـەوەی بیگـاتێ، ماڵەکەشـی ببرازێنێتەوە پێش ئەوەی بگوازێتەوە بۆی ـ واتە: پێش ئەوەی بمرێت ـ .

*بەفیڕۆدانی کات زۆر خراپتر و ترسناکترە لـە مـردن، چونکـە بـەفیڕۆدانی کـات مرۆڤ دادەبڕێنێت لـە کـاری چاکە کـردن بـۆ گەیـشتن بـە دوا ڕۆژ و خزمـەت خـوای گەورە، بەڵام مردن مرۆڤ دادەبڕێنێت لە دنیا و هاوەڵانی.

*دنیا لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئەوەندە ناهێنێت یەك کاتژمێر غـەم و خەفـەتی لێ بخۆی، چ جای ئەوەی هەر هەموو تەمەنت سەرف بکەی لە غەمی دنیادا؟!

* ئەو ئارەزوات و خۆشیانەی ئەمڕۆ ئەنجامی دەدەی بـەیانی ناخۆشـی و سـزای بەدوادا دێت، خۆگرتنەوە لە ئارەزوات توشبوونی ناخۆشی بە هۆیەوە ئەمڕۆ بـەیانی خۆشی پاداشتی بەدواوە دادێت.

*گەورەترین قازانج لە دنیادا ئەوەیە کە هەموو کاتێکی خۆت خەریك بکەی بەو شتەی کە لە دوارۆژدا سوودت پێ دەگەیەنێ.

*ئەو کەسە کەی ژیرە کە بەهەشت و ئەوەی لە ناویدایە دەفرۆشێت بە کاتژمێرێك ڕابواردنی دنیا؟ مرۆڤە خواناس و چاکەکان دەمردن و دەردەچوون لە دنیا لە دوو شت هەرگیز تێر نەدەبوو:

١ ـ گریـــان بۆ نەفسی خۆی.
٢ ـ سوپاس کردنی خوای گەورە.

*ئەگەر لە کەسێك یان مەخلوقێك بترسی ئەوە لێی هەڵدێی، بەڵام خوای گەورە ئەگەر لێی بترسی ئەوە دڵخۆش دەبی پێی و لێی نزیك دەبیتەوە.

*ئەگەر زانست بەبێ کار پێکردنی سوودی هەبوایە، ئەوە خوای گەورە لۆمەی جوولەکە و گاورەکانی نەدەکرد، ئەگەر کردەوەش بەبێ (إخلاص) سوودی هەبوایە، ئەوە خوای گەورە لۆمەی منافیقەکانی نەدەکرد، کەواتە: زانست دەبێت کردەوەی لەگەڵدابێت، کردەوەش دەبێت (إخلاص)ی لەگەڵدابێت.

*مەهێڵە خەیاڵاتی خراپ بەدڵت دابێ، ئەگەر هێشتت، چونکە ئەم خەیاڵاتانە لە دڵدا دەبێتە بیرکردنەوە، ئەو بیرکردنەوەیە لە دڵتدا لابەرە، ئەگەر لای نەبەیت دەبێتە ئارەزوات ، دڵی خۆت پاك کەرەوە لەو ئارەزواتانە، ئەگەر وانەکەی دەبێتە (عزيمة) واتە: هێز و کارکردن بۆ بەجێ هێنانی، ئەگەر ئەویش لا نەبەی دەبێتە (فعل) کار و ئەنجام دەدرێت، ئەگەر فریای نەکەوی بۆ ئەوەی ئەو کارە قێزەوەنە لابەری بە پێچەوانەکەی، دەبێت بە (عادة) خوو، ئەوکات لابردنی و دەربازبوون لێی زۆر ئاستەم دەبێت.

التقوى سێ پلەی هەیە:

یەکەم: خۆپاراستن لەو شتانەی کە حەرامن (المحرمـات).

دووەم: خۆپاراستن لەو شتانەی کە پەسەند نین (المكروهات).

سێیەم: خۆپاراستن لەو شتانەی کە حەلاڵن بەلام پێویست نین و زیادەڕۆییە (الفضوليات).

جا بەشی یەکەم ژیان بە مرۆڤ دەبەخشێت، بەشی دووەم هێز و لەش ساغی بە مرۆڤ دەبەخشێت، بەشی سێیەم خۆشی و کامەرانی و شادمانی بە مرۆڤ دەبەخشێت.

کەسی بەهەشتی بەردەوام ناخۆشی بۆ پێش دێت، کەسی دۆزەخیش بەردەوام خۆشی و ئارەزواتی بۆ پێش دێت.

ئادەم کەویستی بە سایەی ئەو دارەی کە خواردی لە بەهەشتا بمێنێتەوە، کەچی پێچەوانە بوو، بەڵکو دەرکردنی بەدوا داهات، (یوسف)یش کاتێك ویستی بە سایەی ئەو دوو کەسەی کە خەونەکەی بۆ راڤەکردن لە بەندیخانە بێتە دەرێ، کەچی چەند ساڵێك لە بەندیخانەدا مایەوە، واتە: تۆ وادەزانی بەرژەوەندی تۆ لە شتێکدا هەیە کەچی وانیە.

هەرکاتێك (قدر)ێك بەسەر مرۆڤدا هات مرۆڤەکەش پێی ناخۆش بوو، ئەوە شەش حیکمەتی بۆ ڕوون دەبێتەوە:

یەکەم: یەکتاپەرستی خوای بۆ ڕۆشن و ڕوون دەبێتەوە کە خوای گەورە و یستوویەتی ئاوابێت کە تەقدیری کردەوە و دروستی کردووە، هەر شتێك خوا بیەوێت دەبێت، هەر شتێکیش خوا نەیەوێت نابێت.

دووەم: دادپەروەری خوای بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بڕیارێکی دادپەروەرانەی بە سەرداوە.

سێیەم: ڕەحمەتی خوای بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ڕەحمەتی خوای گەورە لەم قەدەرەدا باڵی کێشاوە بەسەر تووڕەیەکەیدا.

چوارەم: حیکمەتی خوای بۆ روون دەبێتەوە کە حیکمەتی خوای گەورە وای ویستوە بە خۆڕایی و بێ هوودە تەقدیری نەکردووە.

پینجەم: کەمتەرخەمی خۆی بۆ دەردەکەوێت بەرانبەر بە سوپاس و ستایشی خوا کە خوای گەورە شیاوی ستایشە لە هەموو شتێکدا.

شەشەم: بەندەیی خۆی بۆ دەردەکەوێت دەزانێت کە ئەو بەندەی خوای گەورەیە لە هەموو روویەکەوە، گەورەکەی فەرمانی بەسەردا دەدات، چونکە بەندەی خۆیەتی، چۆنی بوێت هەڵسوکەوتی پێ دەکات لە فەرمانە قەدەریەکانیدا، هەر وەك چۆن کە هەڵسوکەوتی پێ دەکات لە فەرمانە ئایینیەکاندا.

سەرفراز نەبوون، تێك چوونی بۆچوون، ڕاستی لێ وون بوون، دڵ وێران بوون، نەمانی زیکر، کات بەفیرۆدان، نامۆی نێوان بەندە و پەروەردگاری، گیر نەبوونی دوعا، دڵ ڕەقی، نەمانی بەرەکەت لە تەمەن و ڕزقدا، بێ بەشبوون لە زانستی بە سوود، سەرشۆری، گاڵتە پێکردنی لە لایەن دوژمنانیەوە، دڵ تەنگی، توش بوون بە برادەری خراپ کە دڵی بۆگەن دەکەن و کاتی بە فیرۆ دەدەن، غەمگینی و خەفەت باری، بێ کامەرانی و ژیان ناخۆشی... هتد.

ئەمانە هەر هەمووی لە گوناهو بێ ئاگای لە یاد و زیکری خوا پەیدا دەبێت، هەر وەك چۆن کشتوکاڵ لە ئاو پەیدا دەبێت، سوتانیش لە ئاگر پەیدا دەبێت، بەڵام پێچەوانەی ئەوانە لە بەندایەتی و ملکەچی بۆ خوا پەیدا دەبێت.

# کەمتەرخەمی بەرانبەر خودا

سەرفرازی بۆ ئەو کەسەی دان بە کەمتەرخەمی خۆی دەنێت بەرانبەر بە پەروەردگاری لە کاروکردەوە و عەیبی نەفسی.

سەرفرازی بۆ ئەو کەسەی دان دەنێت کە کەمتەرخەمی کردووە بەرانبەر بە مافەکانی خوا و لە هەلسوکەوتی بەرانبەر بە خوا.

جا کاتێك خوای گەورە سزای دەدات لەسەر گوناهەکانی، دەزانێت ئەو سزادانە لە دادپەروەری خوایە، بەڵام کە سزای نادات لەسەر تاوانەکانی دەزانێت، ئەم سزا نەدانەی لە فەزڵ و بەخششی خوایە، ئەگینا ئەو شیاوی سزایە.

کاتێکیش کارێکی چاکە ئەنجام دەدات وا دەبینێت ئەمە لە خواوەیە و بەخششی خوایە، ئینجا ئەگەر خوای گەورە ئەم کارە چاکەی لێ وەرگرت ئەوە بە بەخششێکی تری خوای دادەنێت، بەڵام ئەگەر کارەکەی ڕەت کراوە ئەوکات، وا دادەنێت ئەو کارەی ئەو ئەنجامی داوە شیاوی وەرگرتن نیە، هەر کاتێکیش کارێکی خراپی ئەنجامدا وا دەبینێت خوا دەست بەرداری بوە و زەلیلی کردووە.

ئەمەش لە دادپەروەری خوای گەورەوەیە بەرانبەر بەودا، لەم کارەیدا ستەمکاری نەفسی خۆی دەردەبڕێت و ئاتاجی خۆی دەردەبڕێت بەرانبەر بە خوا، جا ئەگەر خوای گەورە لێی خۆش بوو، ئەوە لە چاکە و بەخشش و کەرەمی خۆیەتی.

نهێنی ئەمەش لەوەدایە کە ئەو پەروەردگاری بە چاکەکار و بەخشندە دەزانێت، خۆشی بە خراپەکار و کەمتەرخەم دادەنێت، وا دادەنێت کە هەر کارێك دڵ خۆشی دەکا و چاکبێت ئەوە لە فەزڵ و چاکەی خوای گەورەیە، هەر کارێکیش دڵ تەنگی بکاو خراپبێت، ئەوە تاوانی خۆیەتی و لە دادپەروەری خوای گەورەیە.

# باسی غیـــرەت

غیرەتــی سوپاســکراو بەرانبــەر خــودا، ئەوەیــە مــرۆڤ غیرەتــی هــەبێت بــۆ خۆشەویستی خوا بە جۆرێك کە کەسـی لەگەڵدا نـەکات بـە هاوبـەش، یـان غیرەتـی هەبێت لەسەر ئەوەی کەس نە توانێت کارەکانی لـێ گەنـدەڵ بکـات، یـان غیرەتـی هەبێت لەسەر کردەوەکانی هیچی بۆ غەیری خوا نەبێت، یان غیرەتی هەبێت لەسـەر ئەوەی کارێکی وا نەکات خوا پێی ناخۆش بێت لە ریا و خۆبایی بوون، یان غیرەتـی هەبێ لەسەر ئەوەی بەخششەکانی خوای لە پێش چاوبێت.

بــەکورتی ئەوەیــە: غیرەتێکــی وای هــەبێت کــەوا بخوازێــت کــار و گوفتــار و کردەوەکانی، هەر هەمووی بۆ خوا بێت، هەروەها غیرەتیشی لەسـەر ئـەوە هـەبێت کـە کاتـەکانی تـەنها لـە ڕەزامەنـدی خـودا سـەرف بکـات، ئەمـە غیرەتـی بەندەیـە بەرانبەر بەخوا لەسەر ئەوکارانەی ئەنجامی دەدات بۆ ڕەزامەندی خودا.

بەڵام غیرەتی خودا ئەوەیە پەسەندی ناکات ڕوو لە خۆشەویـستی ئـەو وەرگێـڕن بۆ خۆشەویستی غەیری ئەو و هاوبەشی بکەن لە خۆشەویستی، هەر بۆیـەش خـوای گەورە لەبەر بەرزی غیرەتی خراپەی حەرام کردووە، چونکە دروست کراوەکانی هەر هەموویان بەندۆکە و کەنیزکەی ئەون.

# چەند ئامۆژگاریەکی زێڕین

هەرکەسێك ڕێزی خودای لە دڵ دابێت و بێ فـەرمانی نـەکات، خـوای گـەورەش بەڕێزی دەکات  لە ناو دڵی خەڵکی.

ئەگـەر تـۆوی خواناسـی لـە زەویـی دڵـدا چـێنرا، ئـەوە خۆشەویـستی خـوا وەك درەخت لە دڵدا دەڕوێت، جا کاتێك ئەم درەختە پتەو بـوو، ئـەوە بـەری ملکەچـی و بەندایـەتی دەدات، بـەردەوام ئـەم درەختـە ﴿تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينِۭ بِإِذْنِ رَبِّهَاۗ﴾ (إبـراهيم: ٢٥)، واتــە: هـەموو کـات و دەمێـك بـەروو بـوومی خـۆی دەبەخـشێت بـە فەرمانی پەروەردگاری.

یەکەمجار خوای گەورە داوا لە مرۆڤ دەکات کە لێرەوە دەس پێبکـات : ﴿ٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾ (الاحزاب: ٤١). واتـە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە زۆر یادی خوا بکـەن لـە بـەیانیان و ئێـواران تەسـبیحات و ستایشی خوا بکەن.

پاشـان کـە ئەمـەیان کـرد دەکەونـە پلـەی ناوەڕاسـت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ﴾ (الاحــزاب: ٤٣)، واتـــە: خـــوای گەورە خۆی سڵاوات و ڕەحمەتی خۆیتان هەمیشە و بـەردەوام بەسـەردا دەبـارێنێ، هەروەها مەلائیکەتەکانی داوای لێخۆشبوونتان بۆ دەکەن، بۆ ئەوەی لە تاریکیـەکان دەرتان بکات و بتانخاتە ناو نوور و ڕووناکیەوە.

دوای ئەوەی ئەم پلەشیان بڕی دەکەونە پلـەی کۆتـایی ئـەویش ئەوەیـە خـوای گەورە دەفــەرمووێ: ﴿تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌۚ﴾ (الاحـزاب: ٤٤)، واتــە: ئـەو ڕۆژە کە بە دیداری  خوا شاد دەبن، بە سەلام کردن پێشوازیان لێ دەکرێ.

فیترەتی مرۆڤ وەك زەویەکی نەرم وایە چی تیا بچێنی قبوڵی دەکات، ئەگەر درەختی ئیمان و تەقوای تیا بچێنی ئەوکات بەردەوام شیرنایەتی دەبەخشێ، بەڵام ئەگەر دەرختی نەفامی و نەزانی تیا بچێنی ئەوکات هەموو بەرەکەی تاڵ دەبێت.

بڕوانە بۆ ئەم نموونەیە: پەرستش و بەندایەتی و گەشەکردنی و زیاد کردنی، وەك نموونەی ناوك وایە کاتێك دەیڕوێنیت، دەبێت بە درەخت، پاشان ئەم درەختە بەروو بووم دەدات، ئینجا کە دەیخۆیت ناوکەکە دەڕوێنیەوە، بەم جۆرە هەر جارێك بەروو بوومەکە دەخورێت ناوکەکە دەڕوێنرێتەوە، بەهەمان شێوە گوناهیش ئاوایە، ئەگەر بێت و کەسێکی ژیر بیربکاتەوە لەو نموونە یە تێدەگات، ئەوەش بزانە هەر کاتێك چاکەیەك ئەنجام دەدەی لە پاداشتی ئەو چاکەیە چاکەیەکی تری بەدوادا دێت، هەر کاتێکیش خراپەیەك ئەنجام دەدەی لە سزای ئەو خراپەیە خراپەیەکی تری بەدوادا دێت.

سەیر لەوەدانیە کە تۆ وەك بەندەیەك خودا دەپەرستی و ملکەچی بۆ دەکەیت و لە فەرمانەکانی بێ تاقەت نابی چونکە تۆ ئاتاجی ئەو زاتەی، بەڵام سەیر لەوە دایە خودا کە پادشای هەموو جیهانە تۆی وەك بەندەی خۆی خۆش دەوێ و بە هەموو جۆرێك بەخششت لەگەڵدا دەکات بێ ئەوی ئاتاجی تۆی بەندە بێت.
کەوابێت: ئەوەندە سەربەرزیەت بەسە کە تۆ بەندەی ئەو زاتەی، ئەوەندە شانازیەش بەسە کە ئەو زاتە پەروەردگاری تۆ بێت.

خۆت بپارێزە لە گوناە چونکە گوناە مرۆڤ بێ ڕێز دەکات هەر وەك (ابلیس) کە لە ناو مەلائیکەتەکان بەڕێز بوو، بەڵام کە خوای گەورە پێی فەرموو: ﴿ٱسۡجُدُواْ﴾ (البقرە:٣٤). تەنها ئەو سوجدەی نەبرد بۆیە بێ ڕێز و زەبوون بوو.
خۆت بپارێزە لە گوناە چونکە دوات دەخات، هەر وەك خوای گەورە بە ئادەمی فەرموو: ﴿ٱسۡكُنۡ﴾ (البقرە:٣٥)، واتە: جێنشین بە لە بەهەشت. بەڵام بە هۆی گوناهەوە دەرکران لێیەوە.

ئای ئەمە چ ساتێك بوو کە هەزار ساڵ دڵتەنگی جێهێشت کە بەردەوام بە فرمێسکی پەشیمانی دێری خەفەت باری دەنووسێت و بە هەناسەی پەشیمانیەوە دەینێرێت تاکو ئیمزای (فتاب علیه)ی بۆ هات.

(ابلیس) زۆر دڵخۆش بوو بە دەرچوونی ئادەم لە بەهەشتدا، نەشی دەزانی دابەزینی ئادەم بەرز بوونەوی بەدوا دێت، دەبینین چەند جار خوای گەورە لە بارەی ئادەمەوە فەرموویەتی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ (البقرە:٣٠)، واتە: من جێنشینێك لەسەر زەویدا دروست دەکەم.

بەرانبەر بە تۆش ئەی (ابلیس) فەرموویەتی: ﴿قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ﴾ (الاسراء:٦٣)، واتە: برۆ چی دەکەی بکە، تۆ و ئەوەی شوێنی تۆش دەکەوێت، دۆزەخی پێ پڕ دەکەمەوە.

ئەوەی بەسەر ئادەمدا هات سەلماندنی بوونیەتی، دەبینین پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (( و الذي نفسي بيده لو لم تذنبوا لذهب الله بكم و لجاء بقوم يذنبون و يستغفرون فيغفر لهم ))[1]، واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر هەر هیچ گوناه نەکەن، ئەوە خوای گەورە لاتان دەبات گەلێکی تر دێنێت کە گوناه بکەن و داوای لێبووردن بکەن خواش لێیان دەبوورێت.

ئەی ئادەم دلگیر مەبە کە پێم فەرمووی: (لە بەهەشت دەرچۆ) چونکە من ئەو بەهەشتەم بۆ تۆ و نەوە چاکەکانی تۆ دروست کردوە.

ئەی ئادەم بێ تاقەت مەبە لەوەی هەڵەت کرد و پێت هەڵخلیسکا، چونکە دەردی خۆ بەگەورەزانینت فڕێ دا و جلکی ملکەچیت کردە بەر: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ

(١) صحيح: رواه مسلم (٢٧٤٩).

﴿لَكُمْۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾(البقرة:٢١٦)، واتـە: زۆر جار ئێوە شتێکتان پێ خۆش نیە کەچی خێری بۆ ئێوە تیایە، زۆر جاریش ئێوە شتێکتان پێ خۆشەو کەچی خێری بۆ ئێوە تیا نیـە، خـوای گـەورە دەزانێت خێر لەچی دایەو لـە چـی دانیە.

ئەی ئادەم تۆم لە بەهەشت دەرکرد وەنەبێت بۆ کەسێکی ترم دروست کردبێ، بەڵکو بۆ ئەوەیە تاکو بیپارێزنمەوە بۆت، بەندەکانم تێبکۆشن و کۆش بکەن بـۆ ئـەم شـوێنە: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفًا وَطَمَعًا ﴾ (السجده: ١٦)، واتـە: ڕاکیشان و حەسانەوەیان کەمە، بەڵکو زۆر خەریکی نوێژ و بەندایەتین، دەترسن لە پەروەردگاریان و لێ ی دەپاڕێنەوە بە ئومێدی ئـەوەی بەهەشتیان پـێ کەرم بکات.

سوێند بەخوا لـەکاتی گونـاه و بـێ فـەرمانی خـوا مرۆڤـی سـەربەرز هـیچ شـتێك سوودی پێناگەیەنێت، هەر وەك (ابليس) لـە نێـوان مەلائیکەتەکانـدا سـەربەرز بـوو، بـەڵام کـە خـوای گـەورە پێیـانی فـەرموو: سـوجدە بـەرن بـۆ ئـادەم هـەموویان سوجدەیان برد جگە لە (ابليس) نەبێت ئەو سوجدەی نـەبرد، بۆیـە سـەربەرزیەکەی سوودی پێ نەگەیاند.

لەکاتی گوناه و بێ فەرمانی خوا مرۆڤی بەڕێز هیچ شتێك سوودی پێناگەیەنێت، هەر وەك خوای گەورە ئادەمی فێرە هەموو شتێك کرد، چونکە بێ فەرمانی خـودای کرد ڕێزی زانستەکەی سوودی پێنەگەیاند.

لەکاتی گوناه و بێ فەرمانی خودا، مشت و مڕی مـرۆڤ بـێ سـوودە، هـەر وەك (ابليس) کاتێك بێ فەرمانی خوای کرد مشت و مڕی لەگـەڵ خـوای گـەورە دەکـرد و خوای گەورەش پێی فەرموو: ئەی ئیبلیس ئەوە چی نەیهێشت و نایـەڵێت سـوجدە بەریت بۆ ئـەو کەسـەی کـە بـە دوو دەسـتی خـۆم دروسـتم کـردووە؟! لـەکاتی بـێ فـەرمانی خـوا فـەخر و شـانازی مـرۆڤ سـوودی نیـە هـەر وەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي...﴾(الحجر:٢٩). کە ئەمە شـانازیە بـۆ ئـادەم، بەڵام لەکاتی بێ فەرمانیەکەی کرد ئەمە سوودی پێ نەگەیاند.

## ( علی )ی کوڕی ( ابی طالب ) ـ ( سلمان )ی کوڕی ( الاسلام )

ئەی (محمد) ﷺ تۆ (ابو طالب)ت دەوێت، ئێمەش (سلمان)مان دەوێت، (ابو طالب) ئەگەر پرسیار لە ناوی بکرێت دەڵێن: ناوی (عبد المناف)ە، گەر پرسیار لەرەچەڵەکی بکرێت نەوەی هۆزێکی ناودارە کە شانازی پێوەدەکرێت، گەر پرسیار لە سەروەت و سامانی بکرێت کابرایەکی دەوڵەمەندە و بە چەندان حوشتری هەیە.

بەڵام ئەگەر پرسیار لە ناوی (سلمان) بکرێت دەڵێن: ناوی بەندەی خوایە، ئەگەر پرسیار لە رەچەلەکی بکرێ دەڵێن: کوری ئیسلامە، ئەگەر پرسیار لە سەروەت و سامانی بکرێ دەڵێن: هەژاریە، ئەگەر پرسیار لە دانیشتنگە و مۆلگەی بکرێ دەڵێن: مزگەوتە، ئەگەر پرسیار لە پیشەی بکرێ دەڵێن: ئارامیە، ئەگەر پرسیار لە جل و بەرگی بکرێ دەڵێن: تەقوا و بێ فیزیە، ئەگەر پرسیار لە پێخەفی بکرێ دەڵێن: ئێشک گرتنە، ئەگەر پرسیار لە مەبەستی بکرێت دەڵێن: ڕەزامەندی خوایە، ئەگەر پرسیار لە رۆیشتنی بکرێ دەڵێن: بەرە و بەهەشتە، ئەگەر پرسیار لە ڕێ پیشاندەری بکرێ دەڵێن: پێشەوای مرۆڤایەتیە کە پێغەمبەرەﷺ.

# چەند ئامۆژگاریەکی زێڕین

○ ئاگاداربە گوناھ وەك برین وایە، جاری واش هەیە برین قوڵ دەبێت مرۆڤەکە دەکوژێت.

○ ئەگـەر عـەقڵت لـە ژێـر دەسـتی هـەوا و ئـارەزوات دەرچـوو، ئـەوکات وەك پادشای دەوڵەتی لێدێت لەسەر ئەندامەکانی لاشەت.

○ ئەگەر چوویە ژێر رکێفی ئارەزوت، ئەوە بزانە تەمەنت دۆڕاندووە.

○ ئەگەر چاوت بە نەزەرێکی حـەرام کـەوت، ئـەوە بزانـە پـێش هـاتی جەنگە ئاگادار بە لە ناوت دەبات، جا بۆیە چاوت بپۆشە لەو حەرامە.

○ مرۆڤ ئەگەر لە ناو دەریای ئارەزوات ڕۆبـچێت ئـەو تیـا دەچـێت، خـراپترین شت بۆ مەلەوان چاو کردنەوەیـە لـە نـاو ئـاودا، لـە نـاو دەریـای ئارەزواتیـشدا هـەر کاتێك چاوت کردەوە زیانت پیێ دەگات.

○ چەند جـار جووتیـار کێڵگـەی لێکردۆتـەوە وایزانیـوە پـیێ گەیـشتوە کەچـی پێنەگەیشتووە.

○ زووکە نەفسی خۆت بکڕەوە بە کاروبار و کـردەوەی چـاك، چـونکە ئێـستا بازاڕ کراوەیە۔ کە دنیایە۔ پارەشت لە دەست دایە ۔ کە توانای بەندایەتیە۔

○ مرۆڤ دەبۆرژیێ و خەوی ئارەزوات دەیگرێت، بەڵام مـرۆڤ دەبێـت خـەوخۆش نەبێت، چونکە ئێشککرەکانی شار بانگ دەکەن: بەیانی نزیك بووە.

مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە مرۆڤ بیێ ئاگا دەبیێ و تووشی ئارەزووات دەبێـت وەك چۆن مرۆڤ بۆ خەو دەبۆرژێت، بەڵام ڕۆنەچێت و زوو بەخەبـەر بێـت، چـونکە خـوای گەورە چەند پێغەمبەری بۆ ناردووە تـاکو ئاگـاداری بکەنـەوە لـەو ڕۆژەی دێـت کـە قیامەتە وەك ئێشککرەکەی شار کە بانگ دەکات: بەیانی نزیك بووە.

○ ڕووناکی عەقڵ دەدرەوشێتەوە لە نێو تاریکایی ئارەزوواتدا، جا مرۆڤـی ژێـر بە ڕووناکی عەقڵ کار و کردەوە چاکەکان دەدۆزێتەوە.

○ خۆت ڕزگارکـە لـەم دنیـا پـڕ لـە ئـارەزووات و ناخۆشـە، خـۆت ئامادەکـە و ڕووبکەرە ماڵێکی فراوان کە هەموو شتێکی تیایـە نـە چـاو بینیویـەتی و نـە گـوێش

بیستوویەتی، ئا لەو بەهەشتەدا چی داوابکەی دەستت دەکەوێت، هەر شتێکیش لە لات خۆشەویست بێت هۆگرتە.

○ ئەی ئەو کەسەی نەفست فرۆشتووە بە هەوا و ئارەزووات، بەڕاستی بە نرخترین شتت فرۆشتوە بە پارەیەکی زۆر کەم، وەك ئەوە وایە کە ڕێزی کەل و پەلەکە نەزانێت، بەڵام ڕۆژی قیامەت بۆت ڕوون دەبێتەوە کە لەم کڕین و فرۆشتنەدا زەرەرمەند بویتە.. جا بزانە (لا الـه الا الله) کەل و پەلەکەیە، خوا کڕیارەکەیە، نرخەکەشی بەهەشتە، دەلالەکەش پێغەمبەرﷺ دەتوانیت بە بەشێکی زۆر کەمی ئەم دنیایە کە هەر هەمووی ڕێزی باڵە مێشولەیەکی نیە بەهەشت و ڕەزامەندی خودا بکڕین.

○ ئەی مرۆڤ ئاگاداربە و هێز بدە بەخۆت بێتاقەتی ڕووت تێنەکات تۆ دەزانی لەسەر ڕێگای کێی؟! تۆ لەسەر ڕێگایەك دەڕۆی کە ئادەم تیای ماندوو بوو، ڕێگایەك کە نوح لە پێناو گەیاندنی ئەم ڕێبازە ڕەنجی زۆری کێشا، ڕێگایەك (ابراهیم) لە پێناویدا فرێدرایە ناو ئاگر، ڕێگایەك (اسماعیل) لە پێناویدا گیانی خۆی لەسەر دەستی دانا تاکو باوکی وەك مەڕ سەری ببڕێت، ڕێگایەك کە (یوسف) لە پێناویدا فرۆشرا بە پارەیەکی کەم، چەند ساڵیش لە بەندیخانە مایەوە، ڕێگایەك (زکریا) لە پێناویدا بە مشار کرایە دوو لەت، ڕێگایەك (یحیى) لە پێناویدا سەربڕا، ڕێگایەك (ایوب) لە پێناویدا بە نەخۆشی تاقی کرایەوە، ڕێگایەك (داود) لە پیناویدا فرمێسکی زۆری ڕەشت، ڕێگایەك (عیسی) لە پێناویدا بێ هۆگری ڕێی کرد، ڕێگایەك (محمد)ﷺ لە پێناویدا ئازاری لەسەر چێژت، کەچی تۆش دەتەوێت ئەو ڕێگایە بە گاڵتە ببڕی.

○ فیترەی مرۆڤ وەك چرایەکی پرشنگدار وایە بۆ مرۆڤ، ئەو فیترەتە پاکە ڕێی چاکە بە مرۆڤ پیشاندەدات پێش ئەوەی شەرعی خواشی بۆ بێت.

○ (قس) کابرایەکی چاو ساغ بوو پێغەمبەریشی نەدیبوو، بەڵام (أبن أبي) کافر بوو کەچی نوێژیشی لەگەڵ پێغەمبەردا دەکرد لە مزگەوتدا.

○ زۆر کەس هەیە ئاوێکی زۆری لە بەردەستدایە کەچی خەریکە لە تێنا بخنکێ، ـ مەبەستی ئەوەیە زۆر کەس هەیە ئەم ئیسلامە پاکەی پێگەیشتوە، بەڵام وەری ناگرێت ـ .

○ لە زانستی خودا نووسرابوو دەبێت (موسی) ببێت بە پێغەمبەر، (آسیة)ش ئیمان بهێنێت، جا خوای گەورە وەك تەحەدایەك ئەو بێشکەی (موسی)ی تیابوو ڕەوانی کردە کۆشکی (فرعون) بۆ لای ئافرەتێك کە منداڵی نابێت.. ئای کە ئەم چیرۆکە پەند و ئامۆژگاری تیایە، بڕوانە کە (فرعون) لە ترسی پەیدابوونی (موسی) چەندین منداڵی کوڕی سەردەبری بە ئومێدی ئەوەی (موسی) یەکێك بێت لەوانە، کەچی زمانی قەدەری خوا دەیگوت: ئەی (فرعون) بۆ ئەوەی بێ دەسەڵاتی تۆ دەرکەوێت دەبێت (موسی) لە کۆشکەکەی تۆدا پەروەردە بکەین و گەورەی بکەین.

# خۆشەویستی بۆ پێغەمبەری خودا

(ذو البجادين)[1] منداڵێکی هەتیو بوو، مامی بەخێوی دەکرد، خۆی یەکلایی کردبۆوە بۆ پێغەمبەرﷺ بۆیە بیری لە ڕۆیشتن دەکرد تاکو کۆچ بکات بۆ خزمەتی پێغەمبەرﷺ، بەڵام تووشی نەخۆشی بوو بۆیە پێی نەکرا و دانیشت و چاوەڕوانی مامی دەکرد، کاتێك چاك بۆوە، ئارامی نەما لە ناخیەوە هاواری کرد:

الى كم حسبها تشكر المضيقا أثرها، ربما وجدت ضريقا

واتە: تاکو کەی خۆت بەندە کردووە، دەی هیمەت بکە بۆ ڕێگای دەربازبوون. بەمامی گوت: مامە زۆر دەمێکە چاوەڕوان بووم کە موسڵمان بیت، بەڵام هیچم لێ بەدی نەکردی.

لە وەڵامدا مامی پێی گوت: کورەتیو نەکا موسلمان بوبی.. سوێند بەخوا ئەگەر موسڵمان بوبیت، هەموو ئەو شتانەی کە پێم بە خشیویت لێت دەسێنمەوە، (ذو البجادين) کە ئەمەی بیست دەنگی خۆشەویستی بۆ پێغەمبەرﷺ لێ بەرز بۆوە و گووتی:

واللهی بینینی (محمد)ﷺ لەلام خۆشەویستترە لە هەموو دونیا و ئەوی لە دنیادا هەیە.

جا کاتێك خۆی ئامادەکرد بچێتە خزمەت پێغەمبەرﷺ مامی هەموو جل و بەرگەکانی لێ ساندەوە، بۆیە دایکی پۆشاکێکی بۆ هێنا وکردی بە دوو پارچە، یەکیانی وەکو بێجامە لە خوارێی پێچا ئەوەی تریشی وەکو قەمیس لە سەرەوەی ئاڵاند.

(١) ذو البجادين: ناوی (عبدالله) کوڕی (عبد نهم المزنی)بووە.

بەڵێ: ئەم لاوە بێ نازە بەخزمەت پێغەمبەرﷺ گەیشت کاتێکیش بانگی جیهاد ڕادرا بەتامەزرۆییەوە ڕازی بوو کە یەکێك بێت لـە کـاروانی جیهـاد، چونکە کەسـێك حەز لە شتێك بکات ڕێگای دووری تیا نابینێت.

جا کـە ئـەم هاوەڵـە بـێ نـازە شـەهید کـرا لـەکاتی لـە گـۆڕ نـانی پێغەمبـەرﷺ دەیفـەرموو: ((اللهم إني أمسيت عنه راضيا فأرضي عنه))[١]، واتــە: خودایـە مـن لێـی ڕازیمە، خودایە تۆش لێی ڕازیبە.

(أبن مسعود) کە گوێی لەم دوعایەی پێغەمبەر بووﷺ دەیگوت: (یا لیتني کنت صاحب القبر) واتـە: خۆزگە من لە شوێنی ئەو مردووە بامایە.

## چەند ئامۆژگاریەکی زێڕین

- ئەگەر مرۆڤ هێز بداتە خۆی، دەگاتە مەبەست و ئامانج.
- ئەو کەسەی بە ڕاست گۆیانە ڕێدەکات بەرەو خواناسـی کۆسـپی ڕێگـای بـۆ ئاسان دەبێت.
- لە ڕێگای دیندار و بەرەو خوا چوون مرۆڤ تووشـی چـەندین ناخۆشـی دێـت، تـاکو ڕاسـتگۆ و درۆزن لێـك جیـا بێتـەوە، جـا ئەگـەر مـرۆڤ گـوێی نەدایـە ئـەو ناخۆشیانە، ئەوە بۆی دەبێتە یاریدەدەرێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی.

---

(١) بڕوانــە: (الاصابە).

# نموونەی دنیا

دنیا وەك ئافرەتێکی بێ ڕەوشت و لەشفرۆش وایـە، کـە هـەر گیـز دانامرکێتـەوە لای مێردەکەی، بەڵکو هەر ڕۆژەی لەگەڵ پیاوێك ڕادەبوێرێت و تـاکو لـە خشتەیان بەرێت، بەهیچیش ڕازی نابێت جگە بێ ڕەوشت و لەشفرۆش، بـەڵام کـە شـوودەکات بۆ ئەوەیەتی خراپەکانی خۆی پێ داپۆشێ.

ئەی مرۆڤی ژیـر ئاگاداربـە، ڕۆیـشتن بـەرەو دنیـا وەك ڕۆیـشتنە لـە نـاو ئـاوێکی ترسناکی پڕ لە دڕندە، مەلەوانی کردن تیایدا، وەك ئـەوە وایـە مەلـەوانی بکـەی لـە ئاوێکی ترسناك و پر لە تمساح، ئەو شتانەی کە مرۆڤ دڵ خۆش دەکات لـە دنیـادا، هەمان شتە مـرۆڤ دڵ تـەنگ دەکـات، پەیـدابوونی ئـێش و ئـازار لـە دنیـادا، بـەهۆی خۆشیەکانەوە ئەو ئێش و ئازارە پەیدابووە، دڵ تەنگی لە دنیا بـە هـۆی دڵ خـۆش بوونە لە دنیادا.

ئارەزوەکانی دنیا هەمووی ڕازاوە و چاو ڕفێنن، بەڵام ئەو کەسـانەی بڕوایـان بـە (الغیب) هەیە، لە ئاستی ئەو ئارەزواتانەدا چاو دەنـوقێنن، کەچـی ئـەو کەسـەی لـە ئاستی ئارەزوەکاندا چاو ناپۆشێ دڵ تـەنگ و زەرەر مەنـدە، جـا خـوای گـەورە لـە بـارەی بڕوادارەکانـەوە دەفـــەرمووێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ (البقرە:٥)، واتـە: ئەوانـەی لەسـەر ڕێگـای ڕاسـتی پـەروەردگاریانن، هـەر ئـەوانیش سەرفراز و سەرکەوتوون.

بەڵام خوای گەورە لـەبارەی خراپەکانەوە دەفــەرمووێ: ﴿كُلُواْ وَتَمَتَّعُواْ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجۡرِمُونَ﴾ (المرسلات: ٤٦)، واتـە: بخۆن و کەمێك ڕابوێرن ، بەڕاستی ئێـوە تاوانبـار و تاوانکارن.

بەڵێ: خواناسان کە دەزانن مانەوە لە دنیادا بۆ ماوەیەکی کەمە، بۆیە ئارەزووی خۆیـان دەمـرێنن بـۆ ئـەوەی لـە دوا ڕۆژدا سـەرفرازبن، جـا لـە خـەوی بـێ ئاگـایی خەبەریان دەبێتەوە، ئەوە زۆر بە تامەزرۆییانـەوە ڕوو دەکەنـە خواناسـی، ئـەوکات ژیانی تاڵیان بە خواناسی شیرین دەبێت، ڕێگای دووریان پێ نزیك دەبێت.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿هَـٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ﴾ (الانبياء:١٠٣)، واتـە: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە کـاتی خـۆی بـە لێنتـان پێـدرابوو، ئێـوە ئیتر ڕزگارتان بوو لە تەنگانە و ناخۆشی.

# سەیرە.. بە ڕاستی سەیرە

سـەیرترین شـت ئەوەیـە کـە خـوا بناسـی کەچـی خۆشـت نـەوێت، گـوێ بیـستی بانگەوازی بیت کەچی وەڵامی نەدەیتـەوە، بزانـی مامەڵـەکردن لەگەڵیـدا قـازانجێکی زۆرت پێدەگەیەنێت، کەچی تۆ بڕۆیت مامەڵە لەگەڵ یـەکێکی تـردا بکـەی و واز لـەو بێنیت، سەیر لەوەدایە کە سزاو توڕەی خوا بزانیت، لەگـەڵ ئەوەشـدا خـۆت توشـی سزا و توڕەی خوا بکـەی، سـەیر لەوەدایـە کـە دەزانیـت تـاوان و گونـاه دڵ تـەنگ دەکات، کەچی واناکەی ملکەچی خوا بی تـاکو دڵ ئـارام بیـت، سـەیر لەوەدایـە کـە دەزانیت یادکردنی جگە لە خودا دڵ تەنگ دەکات، کەچی ڕوو ناکەیە یاد و و وتوێـژ لەگەڵ خوادا، سەیر لەوەدایە کە دەزانی دڵ پەیوەست بوون جگـە لـە خـوا ئـێش و ئازاری دڵی پێوە بەندە، کەچی ڕوو ناکەیە بارەگای خوا ملی بۆ کەچ بکەی.

بەڵکو لەوەش سەیر تر ئەوەیە کە تۆ دەزانی لە هەموو شتێکدا ئاتاجی خواییت، کەچی تۆ ڕووی لێ وەردەگێری و ڕووی تێناکەی، ئارەزووی ئەو شتانە دەکـەی کـە دوورت دەخاتەوە لە خوا.

# ئە نجام دەری حەرام

## مرۆڤ کە ڕوو دەکاتە حەرام لە دوو ڕێگاوەیە:

یەکەم: (سوء ظنه بربّه) واتــە: گومـانی خـراپ دەبـات بـە پـەروەردگاری، کـەوا دەزانێت گەر گوێ ڕایەڵی خوا بکات و واز لەو حەرامە بێنێت، ئەوکات ئەو شتەی لە دەست دەچێت، خواش چاکتر لەم حەرامەی پێ نابەخشێ.

دووەم: ئەو گومانە خراپە نابات بە پەروەردگاری، چونکە دەزانێت هـەر کەسـێك گوێ ڕایەڵی خوا بکـات، لەبـەر خـاتری خـوا واز لـە شـتێك بهێنێـت، ئـەوکات خـوای گەورە لەو شتەی چاکتر پێ دەبەخشێ، بەڵام ڕوو دەکاتە حەرامەکە چونکە لەسەر حەرام ئارامی پـێ ناگیرێـت و ئـارەزوو بەسـەریدا زاڵـــە و ئـارەزوو بەسـەر عەقڵێـدا زاڵـــە، جا مرۆڤی یەکەم کـە ڕوو دەکاتـە حـەرام لەبـەر نەزانینیـەتی، بـەڵام مرۆڤـی دووەم کە ڕوودەکاتە حەرام لەبەر کەم ژیریەتی.

(یحیی)ی کوڕی (معاذ) دەفەرمووێ: هەر کەسێك بە دڵی ئامـادەوە داوا لـە خـوا بکات، ئەوە خوای گەورە ڕەتی ناکاتەوە.

ابن قیم دەڵێت: منیش دەڵێم: ئەگەر بـە بـڕوا و ئومێـدێکی پتـەوەوە و بـەدڵێکی ئامادەوە نزا بکات ئەوە گیراو دەبێت.

# چەند ئامۆژگاریەکی زێڕین

ئەوانەی کە چاو ساغ و هۆشیارن، دەبیـنن قامچی دنیـا باڵی کێشاوە بەسـەر خەڵکەکـەدا، نەفامـەکانی خەڵەتاندنـەوە بـە خۆشـیەکانی، دەبیـنن شـەیتان بـاڵی کێشاوە بەسەر دڵەکاندا، دەبینن نەفسی خراپەکار بۆتە پادشای لاشەکان.

بۆیە ئەوانیش ڕوو دەکەنـە قـەڵای ملکەچـی و ڕووکردنـە خـودا، هـەر وەك چۆن کۆیلە کە ناچار دەکرێت ڕوو دەکاتە مۆڵگەی گەورەکەی.

ئارەزووەکانی دنیا وەك گاڵتە و گـەپ وایـە، جـا مرۆڤـی گەمـژە و نـەزان تـەنها سەیری ڕووکاری دنیا دەکات، بەڵام مرۆڤی ژیر و دانا دەزانێـت دوای ئـەم خۆشـیانە چی ڕوودەدات، بۆیە خۆیان لێ دەپارێزن.

چاو ساغان کاتێـك کـە دەسـتیان بـۆ ئـارەزوات بـرد بۆیـان دەرکـەوت کـە ئەمـە تەڵەیە، جا بۆیە بە ئاگاییەوە لێی باڵە فـڕێ بـوون، ئـەوکات لەمەبەسـت گەیـشتن و ڕێگای ڕاستیان گرتە بەر.

دوو ڕێوی بە تـەڵەوە دەبن، یەکێکیان بەوەی تر دەڵێت: کەی پێـك دەگەینـەوە؟ ئەوەی تریش دەڵێت: دوای دوو ڕۆژی تر لـە دەبـاغ خانـە پێـك دەگەینـەوە —واتـە: سەر دەبڕێن و کەوڵدەکرێن.

سوێند بە خوا ئـەو ڕۆژانـەی دێ و دەڕوا وەك خـەو وایـە، جـا هەوڵبـدەن تیایـدا سەرکەون.

ئەو ڕۆژانەی دنیا کە ڕۆیشتن وەك خەون بـوون، ئـەو ڕۆژانـەی مـاوە ئاگـات لێـی بێت، کاتیش لە نێوان ئەم دوانە بە فیڕۆ چووە.

ئـەو کەسـە چۆن سـەلامەت دەبێـت، کـە ژنێکـی هەیـە بـەزەیی پـێ نایەتـەوە، ڕۆڵەیەکی هەیە پاساوی بـۆ ناهێنێتـەوە، لـە دراوسـێکەی دڵنیـا نـەبێت، هاوڕێکـەی

ئامۆژگـاری نـەکات، شـەریکەکەی ڕاسـت گـۆ نـەبێت لەگەڵیـدا، دووژمنەکـەی سـڵ ناکاتــەوە لــە دووژمنایەتیـدا، نەفـسی خراپـەی هـانی بـدات، دونیـای ڕازاوە بـۆی ڕاخراوە، ئارەزووی سەرشێتی، تووڕەیی، ڕازاندنەوەی شـەیتان بـۆی، بـێ هێـزی کـە هێرشی بۆ دێنێـت... جـا ئەگـەر ڕووی کـردە خـوا ئـەوکات خـوای گـەورە یارمـەتی دەداو ئەو کارانەی هەر هەموو بۆ چارەسەر دەبێت، بەڵام ئەگەر ڕووی لەخوا نەبو و خوای گەورەش فەرامۆشی دەکا و سەرگەردان دەبێت.

# پشتکردنە قورئان و سوونەت

هـەر کاتێك خـەڵکی پـشتیان کـردە قورئـان و سـوونەت، حوکمیـان بـەم دووانـە نەکرد، بڕوایان وابوو کە پێویستیان بەم دووانە نیە، ڕووشیان کردە بۆچـوونی فـلان وفلان و قیاس و ئیستعان و ووتەی زانایان، ئەوکات تووشی سەرگەردانی دەبـن، دڵ تاریك دەبـن، هـزر گەنـدەڵ و عـەقل بۆگـەن دەبـن، تـا وای لـێ دێـت ئـەو کارانـە بەسەریاندا زاڵ دەبێت و کوێریـان دەکـات لـە ئاسـت ڕاسـتی، تـاکو وایـان لـێ دێـت گچکە و گەورە لەسەر ئەمە ڕادێن و بـە خراپـەی نـازانن، ئـەوکات دەوڵـەتێکیان بـۆ فەراهـەم دەێـت کـە بیدعـە شـوێنی سـوونەت دەگرێتـەوە، نـەفس شـوێنی عـەقل دەگرێتەوە، هـەواو ئـارەزوو شـوێنی ژیـری دەگرێتـەوە، گـومڕایی شـوێنی هیدایـەت دەگرێتـەوە، نەزانی شوێنی زانـین دەگرێتـەوە، ڕیـا شـوێنی ئـیخلاص دەگرێـتـەوە، ناحەق شوێنی حەق دەگرێتەوە، درۆ شوێنی ڕاستگۆیی دەگرێتـەوە، کەمتەرخـەمی لـە ئامۆژگـاری شـوێنی ئامۆژگـاری دەگرێتـــەوە، سـتەم شـوێنی دادپــەروەری دەگرێتەوە، تاوای لێ دێت ئەم شـتانە بـاڵ دەکێشتێت بەسـەر خەڵکیدا و دەبێتـە یاسای دەوڵەت، کە خـەڵکی ڕاپرسـی پـێ دەکـەن، جـا کـە بینیـت ئەمانـە زاڵ بـوو بەسەر دەوڵەتدا و ئاڵای شەکایەوە، ئەوکات سوێند بەخوا مردن خۆشترە لـە ژیـان، ژیانی ناو چیا چاکترە لە ژیانی شار، ژیان لەگەڵ دڕندە ئارامترە لەم ژیانە.

بەڵێ: بەهۆی ستەمی خراپەکارانەوە فەساد لە زەوی و دەریادا بـڵاو دەبێتـەوە، ئاسمان تاریك دەبێـت، زەوی گـوزەرانی تێـك دەچێت، خێـرو بەرەکـەت نامێنێـت، دڕندە لە بەین دەچێت، بە هۆی ستەمی خراپەکارانەوە ژیان تێك دەچێت، ڕوونـاکی ڕۆژ و تاریکی شەو لەبـەر ئـەم کـارە قێزەوەنانـە هـاواری لـێ هەڵدەسـتێ و دەسـت دەکات بە گریان، لەبەر زۆری کاری خراپە و بەدکاری مەلائیکـەتی پێـك گەیـشتوو و (کرام الکاتبون) سکاڵا دەکەن لەلای پەروەردگاریان.

سـوێند بـەخوا ئـەم خراپـە کاریـە وەك هـەورێکی ڕەش وایـە کـە ئاگادارمـان

دەکاتەوە، وا لافاوێکی پڕ لە سزا لە ڕێوەیە، ئاگادارمان دەکاتەوە بەو تاریکاییە کە سزای بەدواوەیە.

جا کەوابوو زووکەن خۆتان رزگار کەن لـەم لافـاوە بەتەوبەیـەکی ڕاسـتگۆیانە تـا کات ماوە و دەرگای تەوبە دانـەخراوە، ئێـوە وەك ئـەوە وانـە کـە لەبـەر دەرگایـەك ڕاوەستاون نزیکە دابخرێت، وەکو ئەوە وانە کە مامەڵەی (الرهن) تان کردوە کەچـی نزیکە کاتەکەی نەمێنێت، وەکو ئەوە وانە کە دووباڵتان هەبێت کەچی نزیکە لە کـار بکـــەون: ﴿وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾(الـــشعراء:٢٢٧)، واتـــــە: سەرئەنجام ئەوانەی ستەمیان کردووە دەزانن کە بە چ تێك شـکاوییەك ژێـرە و ژوور دەبن و تیا دەچن.

# چەند ئامۆژگاریەكی زێڕین

ئەمڕۆ نەفسی خۆت بكڕەوە ـ بەكاروو كـردەوەی چاكەـ چـونكە بـازار كراوەیـە، پارەش هەیە و چەنگ دەكەوێت، كەل و پەلیش هەیە و هەرزانە، چونكە ڕۆژێك دێت ئەم بازاڕە دادەخرێ و كەل و پەلیش نامێنێـت خـوای گـەورە دەفــەرمووێ:﴿ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّـالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ﴾ (الفرقان: ٢٧)، واتــە: ئەو ڕۆژە ستەمكار گـاز لـە هـەردوو دەستی خۆی دەدات لە پەشیمانیدا.

اذا انت لم ترحل بـزاد مـن التقـى وأبصرت يوم الحـشر مـن قـد تـزودا
نـدمت علـى أن لا تكـون كمثلـه وأنـك لم ترصـد كمـا كـان أرصـدا

واتــە: ئەگەر بەبێ توێشووی تەقوا گەشتی قیامـەت دەسـت پـێ بكـەی، جـا كـە حەشر كران دەبینی هەیە توێشووی پێیە، بۆیە تۆش ئەوكات پەشیمان دەبیەوە كە وەكو ئە و نەبووی.

كاركردنێك كە ئیخلاصـی لەگـەڵ نـەبێت و لەسـەر ڕێگـای پێغەمبـەرﷺ نـەبێت، وەكو گەشتیارێك وایە كە تورەگەیەكی پێبێ تورەگەكەی پڕ كردبێت لە خـۆڵ، ئـەم گەشتیارە هیچ سوود لەمە وەرناگرێت جگە لە ماندوو بوون.

ئەگەر دڵت پڕ بـوو لـە غـەم و خەفـەتی دنیـا، وە لـە خـۆراك پێدانیـشی كەمتـەر خەمیت كردبوو، كە ئیمان و زكر و یادی خوایە، ئـەوكات تـۆ وەكـو ئـەو گەشـتیارە وایت كە وڵاغەكەی بارێكی زۆری لێ بار دەكات، كەچی ئالیكی چاكی پێنەداوە، جـا ئەو وڵاغە چونكە تێرنەكراوە هەر كاتێك پەكی بكەوێت لە پەك دەكەوێت.

هەر كەسێك شیرینی ئیمان بزانێت، ئازاری ئارامگرتنی لەسەر سووك دەبێت.

هەر كەسێك شیرینی عافیەت وئیمان بزانێت، ئەوكات ئازاری ئـارامگرتنی لەسـەر سووك دەبێت.

گیرۆدەی داوی نەریت بووی، ئەگەر بێتوو هیمەت بدەیتە خۆت گومانی تیا نیە سەردەکەویت.

جیاوازی ئیمانداری ڕاستگۆ لەخەڵکی لەهیمەت بەرزیەکەی دایە، نەك لە ڕەنگ و ڕوویدا.

جیاوازی نێوان تۆ و ئیمانداری سەرفراز چیایەك لە ئارەزواتە، ئەوانە پێش ئارەزوات کەوتوونە، بەڵام تۆ دوای ئارەزوات کەوتویتە، کەواتە تۆش وابکە بەوان دەگەیت.

دنیا وەکو گۆرەپانی پێشبڕکێ وایە، کە خەڵکی بە پیادە و بە سوار پێشبڕکێ دەست پێ دەکەن، جا تۆزوخۆڵ لە گۆرەپانەکە بەرزدەبێتەوە بە جۆرێك گۆرەپانەکە پڕ دەبێت لە تۆز وخۆڵ، ئەوکات براوە تیایدا وون دەبێت، بەڵام لە پاشان کە تۆز و خۆڵەکە دامرکایەوە ئینجا دەزانن کێ براوەیە.

ئارەزوات وەك دەنکە گەنمێك وایە لە ژێر تەڵە دابێت، جا بیر بکەوە چۆن گیاندارێك بە تەڵەوە بێت سەردەبڕێت، تۆش ئەگەر بە تەڵەی ئارەزوات بی دەفەوتێی، ئەگەر وا بیربکەیەوە ئەوکات ئارامگرتنت زۆر لا ئاسان دەبێت.

ڕەزیل مرۆڤێکی فەقیرە، کەچی وەکو فەقیر لەسەر هەژاریەکەی پاداشت وەرناگرێت.

جگە لە گەورەکەت داوا لەکەس مەکە، چونکە کۆیلە لە کەسێکی تر داوا بکات جگە لە گەورەکەی بەسەریدا دەشکێتەوە.

مانەوە بە تەنها بۆ ئەوەی زکر و یادی خوا بکات هۆگری بە مرۆڤ دەبەخشێت.

واز بێنە لەوەی لێت جیادەبێتەوە، هۆگربە بەوەی کەلێت جیا نابێتەوە.

گۆشەگیری مرۆڤی نەزان گەندەڵیە، بەڵام گۆشەگیری مرۆڤی زانا خۆراکە بۆ هێزری.

ئەگەر عەقڵ و یەقین پێکەوە گۆشەگیر بوون، فکریش ئامادەبوو ئەوکات وتووێژ دەستپێدەکات.

ئەگەر دووژمنەکەت پێی گووتی گەمژە، وای پێ مەڵێوە ئەگینا ئەویش وا دەڵێتەوە.

کە بەزەییت بە نەفستدا دێتەوە نیشانەی ئەوەیە کە نەفست ناناسی، ئەگەر بە چاکی بتناسیبایا، ئەوە سەرزەنشتت دەکرد و یارمەتیت نەدەدا.

تووڕەیی خۆت بە زنجیرەی ئارامی ببەستەوە، چونکە تووڕەیی وەکو سەگ وایە، ئەگەر بەرتدا دەڕوات و پەلاماری خەڵك دەدات.

ئەگەر (قدر)ی خوا وابوو مرۆڤێك کامەران بێت، ئەوکات (قدر) تۆوی کامەرانی لە دڵی ئەم مرۆڤەدا دەچێنێت، پاشان بە ئاوی (ترغیب) و (ترهیب) ئاوی دەدات، پاشان چاودێری دەکاو ئێشك گرێکی زانستیشی بۆ دەگرێت، واتە: بەچاو ساغانە ڕێبکات، ئابەم شێوە بەڕێی دەکا.

ئەگەر لە گێژاوی تاریکایدا ئەستێرەی هیمەتت درەوشایەوە، پاشان مانگی عەزیمەتیش بە دوای ئەو داهات و درەوشایەوە، ئەوە دڵ بە نووری پەروەردگاری پرشنگدار دەبێت.

کاتێك شەو داهات خەو و بۆرژان باڵ دەکێشێت بەسەر خەڵکیدا، بەڵام ئەو سەربازانەی لە پێشەوەن، کە ئامادەن بۆ هێرش کردن، بەو شەوە خەویان لە چاو تۆراوە، جا لە خۆشیا بێت یا لە ترسا، کەچی سەربازە بێئاگاکان لە پرخەی خەودان، ئەگەر سەربازەکان بە جەرگ بەزانە تێیان کۆشا، سەردەکەون بەسەر سەربازە کەم تەرخەمەکان، کە بەیانیش دادێت غەنیمەتەکانیان دابەشدەکەن بەسەر خاوەن بەشەکان.

لە دەرگای ڕەحمەتی پەروەردگار بدە، ئەگەر دەریشی کردی بێ ئومێد و بێ تاقەت مەبە لەبەر دەرگاکە ڕاوەستە، سڵ مەکە لە نزا کردن و پاسا و هێنانەوە بۆ هەڵەکانت، ئەگەر چی چەند جارێکیش دووبارەی بکەیەوە، ئەگەر دەرگای نزا کرایەوە و نزای خەڵکی وەرگیرا هی تۆ وەرنەگیرا، هەر سڵ مەکە و بێ تاقەت مەبە، بەڵکو زیاتر بەردەوامبە، وەکو منداڵێك بە ملکەچی لە دەرگا بدە و دەستت پانکەوە و بڵێ ﴿وَتَصَدَّقْ عَلَيْنَآ﴾ (یوسف: ٨٨). واتە: خێرمان پێ بکە.

ئەگەر پۆشاکی تەقوات پۆشا، ئەوە بە ئامانجت دەگەی.
گوناهو تاوان ڕێگرە لە بەرەکەتی کاسبیدا.

هەر کەسێك ئەگەر بیەوێت قەدری چەندە لای خودا، بابڕوانێت خودا فەرمانی بە چی پێدەکات ئەویش بەچی سەرقاڵە.

ببە بە ڕۆڵـەی دوارۆژ، مەبـە بـە ڕۆڵـەی دنیـا، چـونکە منـداڵ شـوێنی دایکـی دەکەوێت.

دنیا وەك کەلەشێکی بۆگەن وایە، کـە شـێریش بـە کەلەشـی بۆگـەن ڕازی نیـە و نایخوا ئەی چۆن تۆ پێی ڕازی دەبی.

دنیـا خەیاڵـە، بـەڵام دوا ڕۆژ نیـشتمانی ڕاسـتەقینەیە، پێویـستیەکانیش لـە نیشتمانی ڕاستەقینە دەست دەکەوێت.

تێکەڵ بوون و دانیشتن لەگەڵ هاوڕێ و برادەر دوو جۆرە:
یەکەم: دادەنیشن و کۆدەبنەوە لەسەر شتی تڕوهات و کات بە فیڕۆدان، جا ئـەم جۆرەیان زیانی زیاترە لەسوودەکەی، چونکە هەرهیچ نەبێت دڵیان فەساد دەبێت و کاتیان بەفیڕۆ دەچێت.

دووەم: دادەنیشن و کۆدەبنەوە بـۆ یارمەتیـدانی یـەکتر لەسـەر ئـەو هۆکارانـەی مـرۆڤ بـەرەو بەهەشـت دەبـات، ئامۆژگـاری یـەکتری دەکـەن لەسـەر ڕێگـای ڕاسـتی ئیسلام بن و لەسەری بەردەوام بـن و ئـارامی لەسـەر بگـرن، ئـەم جۆرەیـان زۆر بـە سوودە، بەڵام جاری وا هەیە مرۆڤ لەم جۆرەیان تووشی ئەم سێ بەڵایە دەبێت:

ئەوەیە کە قسە بۆ یەکتری دەڕازێننەوە، کە ئەمـە بەڵایـە ئەگـەر کـاری لەگەڵـدا نەبێـت.
دانیشتنەکەیان دەبێتە قسەکردن لەسەر شتی تریش زیاد لە پێویست.
وای لێدێ ئەم دانیشتنە دەبێتە شتێکی عـادەتی، مـە بەسـتەکەی نامێنێـت، کـە خۆ ئامادەکردنە بۆ دوارۆژ.

## پوختەی قسان ئەوەیە:

تێکەڵبوون و دانیشتن لەگەڵ خەڵکیدا، یان ئەوەتە خۆراکە و ئاودانە بۆ (النفس الامارة)ە واتـە: زیانت پیێ دەگەیەنن.

یان خۆراکە و ئاودانە بۆ (النفس المطمئنة)ە واتـە: سودت پـێ دەگەیـەنن، جـا بەرهەمەکەی بە گوێرەی خۆراکە و ئاودانەکەیە، ئەگـەر خـۆراك و ئاودانەکـەی چـاك بوو ئەوکات بەروو بوومەکەشی چاك و بەسوود دەبێت، بەهەمان شـێوە روحـی پـاك چونکە ئامۆژگاری مەلائیکەن لە هزری خۆیدا دەچێنێت، ئەوە پاکە.

وە ڕۆحی پیسیش چونکە ئامۆژگاری شەیتان لە هزری خۆیـدا دەچـێنێت، ئـەوە پیسە، خوای گەورەش بە حیکمـەتی خـۆی وای دانـاوە پاکـەکان بـۆ پاکـەکان بـن، پیسەکانیش بۆ پیسەکان بن.

# ئاگات لە گەورەیی خودا بێت

هیچ شتێك لە بوونەوەردا نیە بە تەنها بە یەك (سبب) كاریگەر بێت، بەڵكو یەك (سبب) كارناكات، مەگەر بە پاڵپشتی (سبب)ێكی تر نەبێت، ڕێگری كاریگەرییەكەش نەمێنێت، ئەمە لەو (سبب)انەیە كە بەچاو بەدی دەكرێت، لەو (سبب)انەی كە نادیارە و مەعنەویە، وەك كاریگەری خۆر بۆ گیاندار و ڕووەك ئەمە لەسەر چەند (سبب)ی ترەوە وەستاوە، لە شوێنی وەرگرتن، چەند (سبب)ێك پاڵپشتی ئەم (سبب)ە دەكەن.

هەروەها منداڵ بوون پەیوەستە بە چەند (سبب)وە جگە لە جووت بوونەكە، بەهەمان شێوە هەموو (سبب) و (مسبب)یك بەم شێوەیە، جا ئەو دروست كراوانەی كە تۆ لێ ی دەترسی و داوای لێدەكەی بەشێكی كەمە لە (سبب) بە تەنها كاریگەری نیە جگە لە خوای گەورە و باڵا دەست نەبێت.

كەواتە ناگونجێت داوا و ترسان لە غەیری خوا بكەیت، ئەمە بەڵگەیەكی ڕۆشنە كە ترس و داوا كردن جگە لە خوای گەورە شتێكی پوچەڵە، ئەگەر گریمان ئەو (سبب)ە بە تەنها كاریگەرە، ئەوە دەكات (سبب)كە لە غەیری ئەوەوەیە لەو نیە، هیچ هێزێكی نیە كاری پێ بكات، چونكە هەر هێزو توانایەك هەبێت ئەوە تەنها بە خواوەیە هەر خودایە هەموو هێز و توانایەكی بەدەستە، ئا ئەو هێزو توانایەی كە مرۆڤ لێی دەترسێ و داوای دەكات لە ڕاستیدا بەدەستی خودایە.

چۆن لە كەسێك دەترسێت و داوای لێدەكات كە هیچ هێز و توانایەكی لە دەست نایەت، بەڵكو ترسان لە دروست كراوەكان و داوا لێكردنیان (سبب)ێكە بۆ بێ بەش بوون، و تووشی بەڵا هاتن بەوەی كە داوای دەكا و لێ ی دەترسێ، چونكە چەند لە كەسێك بترسێی جگە لە خوای گەورە ئەوە بە پێی ترسەكەت لەوكەسە، خودا ئەو

کەسەت بەسەردا زاڵ دەکات، بە پێی داواکردنت لە غەیری خـوای گـەورە ئـەوە بـێ بەش دەبی.

ئا ئەوە حاڵی خەڵکیە بە گشتی جا هەر شتێك خوای گەورە بیەوێت ببێـت ئـەوە هەر دەبێت، هەر شتێکیش خوای گەورە بیەوێت نەبێت ئەوە هەرگیز نابێت، ئەگـەر چی هەر هەموو خەڵکیش بۆی کۆك بن.

# یەکتا پەرستی مرۆڤ ڕزگار دەکات

یەکتاپەرستی ڕزگارکەر و پشتیوانە بۆ دووژمنـانی خـوا و بـۆ دۆسـتانی خـواش، دەبینین خوای گەورە دوژمنانی خـۆی لـە ناخۆشـی و نەهامەتیـەکانی دنیـادا ڕزگـار دەکـات ئەگـەر هانـا بـۆ یەکتاپەرسـتی ئـەو بـەرن ﴿ فَإِذَا رَكِبُواْ فِي ٱلْفُلْكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴾ (العنكبوت: ٦٥).

واتـە: هەرکاتێك ـ بێ باوەڕان ـ سواری کەشتی دەبن، کە مەترسی نـوقم بـوون و تیاچوون ڕوویان تێ دەکات، بە ملکەچی و بە دڵەوە هانـا و هـاوار بـۆ خـوا دەبـەن، بەڵام کاتێك خوای گەورە رزگاریان دەکات لەم ناخۆشییە، کە دەگەنە وشـکانی، لـە ڕێبازی یەکتاپەرستی دەترازێن و هاوبەشی بۆ خوا بڕیار دەدەن.

هــەروەها یەکتاپەرسـتی پـشتیوانیە بـۆ دۆسـتانی خـواش، لــە ناخۆشـی و نەهامەتیـەکانی دنیـا و قیامـەت ڕزگاریـان دەکـات. جـا بۆیـە پێغەمبـەر(یـونس) لـە ناوسکی حوتدا هانای بۆ ئەو یەکتاپەرستیە برد، خوای گەورەش لە ناو ئـەو هـەموو تاریکاییەدا ڕزگاری کرد..

دەبیـنین شـوێنکەوتوانی پێغەمبـەران کاتێـك هانایـان بـۆ یەکتاپەرسـتی بـردووە ڕزگاریـانبووە لـە سـزای کـافران لـە دنیـادا، وە ڕزگـار بوونـە لـە ناخۆشـیەکانی دواڕۆژیش، بەوەی کە خوای گەورە بەخششی زۆری بۆ ئامادەکردوون.

بەڵام (فرعون) لەوکاتەی خەریك بـوو لـە ناوبـچێ هانـای بـۆ یەکتاپەرسـتی هێنـا کەچی هاناکەی هیچ سوودی پێ نەگەیاند، چونکە ئیمان هێنان بۆ یارمەتیـدان هـیچ سوودی نیە، ئەمە سوونەتی خوایە لەسەر بەندەکانی.

جا بۆیە دوعای تەنگانە بە یەکتاپەرستی خودایە، وەك دوعاکەی (یونس) کـە لـە ناو سکی حوتەکەدا داوای پێ لە خوا کرد، دوعایەکی گیراوە.

گەورەترین و ناخۆشترین تەنگی لە شیرکەوە هەڵدەقوڵێت، ڕزگـاربوونیش لـەم ناخۆشیە بە یەکتاپەرستی دەبێت، بە ڕاستی هەر یەکتاپەرستیە جیگـای ئومێـد و مۆڵگە و قەڵا و هانای خەڵکیە.. و بالله التوفيق.

# چێــژ وەرگرتن

چێژ وەرگرتن و حەزلێبوون لە شتێك بە گوێرەی خۆشەویستیەکەتە بۆ ئەو شتە، جا بە گوێرەی خۆشەویستیەکەی هێز و بێ هێز دەبێت، هەرکاتێك خۆشەویستەکەی بۆ ئەو شتە پتەو و بەهێز بوو، ئەوە تامەزرۆی دەبێت و حەزدەکات زوو پێی بگات، مرۆڤیش کاتێك شتێکی خۆش دەوێت ئەگەر بیناسێ و زانستی پێی هەبێت، جا هەر کاتێك تەواو بیناسێ و زانستی پێی هەبێت زیاتر خۆشی دەوێت، هەر کەسێك ئیمانی بە خوا و ناو و سیفاتەکانی و دینی خوا هەبێت ئیشتیاق و خۆشەویستی بۆ خوا زیاتر دەبێت، حەز دەکات زوو بگات بەخزمەتی و بڕوانیتە ڕووی خوا و گوێ لە ووتەکانی ڕابگرێت.

جا هەر هەموو خۆشی و ئاسوودەی و کامەرانیەك جگە لەم خۆشیە وەك دڵۆپە ئاوێك وایە لە ناو دەریایەك، کەوابوو کەسێك هۆشی لەسەردا هەبێت چۆن خۆشیەکی کەم کە لە دوایدا ئازاری بەدوا دادێت دەگۆڕێتەوە بە خۆشیەکی گەورەی بەردەوامی نەبڕاوە؟!

بزانە: مرۆڤ بە گوێرەی ئەم دوو هێزە هەڵسوکەوت دەکات:

١ـ العلم: زانســت.

٢ـ الحب: خۆشەویستی.

چاکترین و بەسوود ترین زانستیش، زانستە بە خوا.. چاکترین و بەسوود ترین خۆشەویستیش، خۆشەویستی خوایە، خۆشترین تام و چێژیش لەم دووانەدایە کە باسمان کرد.. والله المستعان.

# ڕێگای گەیشتن بە ڕەزامەندی خودا

هەرکەسێك بیەوێت بە سەرفرازی بە خوا بگات و لە دوا ڕۆژیشدا کامەران بێت، دەبێت لە دوو شتان خۆی بەند بکات:

یەکەم: خۆی بەند بکات بۆ ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە خوا فەرمانی پێ کردووە، واتە: گوێڕایەڵی خوا بکات.

دووەم: خۆی بەند بکات لە ئەنجام نەدانی ئەو شتانەی کە خودا قەدەغەی کردووە، واتە: بێ فەرمانی خوا نەکات.

وەك ئەوەی زمانی بەند بکات و بیگرێتەوە لەو شتانەی کە سوودی پێ ناگەیەنێت، زمانی بەند بکات و تەڕی بکات بە وێردوو زکری خودا و ئەو شتانەی کە ئیمانی زیاد دەکات.

ئەندامەکانی بەند بکات لە گوناە و تاوان، ئەندامەکانی بەند بکات لەسەر کردنی واجبات و سوونەتەکان، بەم شێوەیە تاکو دەگاتە خوای گەورە با خۆی بەند بکات، ئەوکات خوای گەورەش ڕزگاری دەکات لەم بەندیخانەی دنیا و دەیخاتە خۆشترین و فراوانترین شوێن.

ئەوەش بزانە: هەرکاتێك مرۆڤ ئارامی نەگرت لەسەر بەندکردنی ئەم دووانە و ڕووی کردە ڕابواردن و ئارەزوان، ئەوە دوای ڕابواردنەکەی کە مرد و لە دنیا دەرچوو بەندکردنە ناخۆشەکەی بەدوادادێت ـ کە دۆزەخە ـ بەم شێوەیە هەر کەسێك کە دەمرێت و دەردەچێت لە دنیا یان ئەوەتا ڕزگاری دەبێت لە بەندیخانەی دنیا و بەرەو خۆشی بەهەشت دەڕوات، یان لە ڕابواردنی دنیا بەرەو بەندیخانەی دۆزەخ دەڕوات.. و باللە التوفیق.

# تەقوا و ڕەوشت جوانی دوو شتی زۆر بەرزن

(ابن عون) بانگی پیاوێکی کرد و پێی گووت: تەقوای خوا بکە، چونکە مرۆڤی بە تەقوا هەرگیز هەست بە وەحشەت و تەنهای ناکات.

(زید)ی کوڕی (أسلم) دەیفەرموو: هەر کەسێك تەقوای خوا بکات خەڵکی خۆشیان دەوێت، ئەگەرچی دووژمنیشی بن.

(الثوري) بە (لإبن ابی ذئب)ی دەفەرموو: ئەگەر تەقوای خوات کرد و لە خوا ترسای، ئەوە خەڵکی چ نیە، بەڵام ئەگەر لە خەڵکی ترسای ئەوە هیچ شتێك سوودت پێ ناگەیەنێت لای خوای گەورە.

(سلیمان)ی کوری (داود) دەفەرموێت: ئەوەمان پێدراوە لەوەی خەڵکی پێی دراوە و ئەوەش کە پێی نەدراوە، زانیومانە لەوەی خەڵکی دەیزانێت و نایزانێت، هیچ شتێکمان نەبینیوە لە تەقوای خوا چاکتر بێت لە پەنهایی و ئاشکرای، لە دادپەروەری لە تووڕەی و ڕەزامەندی، لە هەژاری و دەوڵەمەندی.

لە کتابی (الزهد)ی ئیمام أحمد هاتووە کە خوای گەورە دەفەرموێت (هەر مرۆڤێك جگە لە من رووبکاتە دروست کراوێك و پشتی پێ ببەستێ هۆیەکانی ئاسمانەکان و زەوی لێ دەگرمەوە، جا ئەگەر داوای شتێکم لێ بکات پێی نابەخشم، ئەگەر نزا بکات نزاکەی گیراو ناکەم، ئەگەر داوای لێبووردنم لێ بکات لێی نابوورم.. هەر مرۆڤێکیش ڕوو بکاتە من و پشتم پێ ببەستێ، ئەوە ڕزقی لە ئاسمانەکان و زەویدا زامن دەکەم، جا ئەگەر داوای شتێکم لێ بکات پێی دەبەخشم، ئەگەر نزا بکات نزاکەی گیراو دەکەم، ئەگەر داوای لێبووردنم لێ بکات لێی دەبوورم).

دەبینین پێغەمبەرﷺ تەقوا و ڕەوشت جوانی پێکەوە بەستۆتەوە، چونکە تەقوای خوا کردن نێوان بەندە خۆش دەکات لەگەڵ پەروەردگاری، ڕەوشتی جوانیش نێوان مرۆڤ خۆش دەکات لەگەڵ خەڵکی..

کەوابوو: تەقوای خوا کردن بەندە خۆشەویست دەکات لای خوا، ڕەوشتی جوانیش مرۆڤ خۆشەویست دەکات لای خەڵکی.

# چەند ئامۆژگاریەکی زێڕین

لە نێوان بەندە و خـوا و بەهەشـت ڕێگایـەك هەیـە کـە بـە دوو هـەنگاو دەبڕێـت: هـەنگاوێکیان دوورکەوتنەوەیـە لـە نەفـسی خـۆی، هەنگاوێکیـشیان لـە خەڵکیـە، هەنگاوی نەفسی دایـدەبڕێت لـە خـۆی و خـەڵکی، هـەنگاوی خـەڵکیش، کـە مردنـە. دەیگەیەنێت بە خوا، کەواتـە: تەنها ڕوو لەو شتانە بکە کە دەتگەیەنێت بە خوا.

بانگ بێژێك هاواری کرد هاوەڵان ﴿ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ﴾(الانبیـاء: ١). واتـــە: لێپرسینەوەی خەڵکی نزیك بۆتەوە.

دڵەکانیان لە ترسا راچلەکا، لە ترسان ئاو لە چاوانیان دەهات

دنیا بۆ ئیمامی (علي) ڕازاندرابۆوە، ئیمامی (علـي)یـش بـە دنیـای دەووت: (أنـت طالق ثلاثا لا رجعة لي فيك). واتـە: من تۆم تەلاقدا سێ بە سێ هیچ گەڕانەوەشـت بـۆ نیە.

نووری حەق زۆر ڕووناکترە لە نووری ڕۆژ.

ڕێگای بەرەو خوا چون چۆلە لەو کەسانەی کە گومانیان هەیە و شوێنی هەواو ئارەزوواتیان کەوتوون، بەڵکو ئەوانە لەسەر ڕێگای بەرەو خوا چوونن کە بڕوایەکی پتەویان بە ئیسلام هەیە و ئارامگرن لەسەریدا هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ﴾ (السجدە:٢٤). واتـە: کە ئارامگرتنیان کردە پیشەیان ئێمەش کردمانن بە پێشەوا، لەو کاتەی دڵنیایی و بڕوایەکی تەواویان هەبوو بە ئایەتەکانی ئێمە.

# بڕوای پتەو ڕزگارت دەکات

لـە کـاتی سـەرەمەرگدا شـەهادەی (لا الـه الا الله) کاریگـەری گـەورەی هەیـە بـۆ سڕینەوەی گونـاه و تـاوان، چـونکە لـە کـاتی سـەرەمەرگدا ئـەو مرۆڤـە بـە دڵـەوە دەڵێت: (لا اله الا الله) دەزانێت ماناکەشی چیە، لە کاتێـك ئـەم شـایەتیە دەدات کـە ئارەزوەکانی هەمووی مردوە و سەرکەشی نەماوە کاتێك خۆی بـە گـەورە دەزانـی و سەرکەشی دەکرد، ئیستاکە ملکەچە و خۆی بە زەلیـل و زەبـون دەزانێـت، چـونکە هیچ ئومێدی بە دونیا و ئارەزواتی دنیا نەماوە.

ئیـــستاکە وا لەبـــەر دەســـتی پـــەروەردگار و دروســـتکارو گەورەکـــەی زۆر بـــە ملکەچـییەوە وەسـتاوە بـە ئومێـدی ئـەوەی لێـی ببورێـت و ڕەحمـی پێبکـات، بـە بڕوایەکی پتەوەوە دوور لە هەموو شیرکێك ڕووی کردۆتە خودا، ئەو شتانەی هـەموو بەلاوە ناوە کە لە دونیا پێوەی سەرقاڵ بوو، ئیستاکە هـەموو غـەمی ئـەو شـوێنەیە کە بەرەو ڕووی دەڕوات کە نازانێت شوێنەکەی چۆنە.

جا بۆیە مرۆڤ لەو کاتەدا پڕ بە دڵـەوە ڕوو دەکاتـە خـوای گـەورە بـە دڵ و لاشـە تەسلیمی خوا دەبێت، بە دڵ و لاشەوە دەڵێت: (لا اله الا الله) کە دڵـی تـەنها خـوای گەورەی تیایە، دڵی خۆی پاك کردۆتەوە لە هەموو شتێکی تر.

بێگومان لەو کاتەدا دڵی پـاك کردۆتـەوە لـە دنیـا، ڕووی کردۆتـە پـەروەردگاری، ئاگری ئارەزواتی دامرکاندۆتەوە، ئومێدی بـە قیامەتـە و تـەنها ئـەوی لەبـەر چـاوە، دنیای پشت گوێ خستووە لە کاتێکدا ئـەو شـایەتی دانـە کـە بەدڵـەوە دەیلێـت دوا کاریـەتی ئـەم شـەهادەیە گوناهـەکانی لەسـەر دەسـڕێتەوە، بـەرەو پـەروەردگاری دەبات، چونکە بەشایەتی دانێکی دڵسۆزانە بە پەروەردگاری گەیشتوە، کـە بـەدڵ و لاشە ئەم شایەتیەی داوە.

جا ئەگەر بێتو لە کاتی سەلامەتیدا بەم شێوە ئەم شەهادەی لە دڵدا بایە، هەرگیز هۆگر و دڵخۆش نەدەبوو بە خۆشیەکانی دنیا، بەڵکو هەڵدەهات لە خەڵکی و ڕووی دەکردە خودا، هەر بەخوا دڵخۆش دەبوو.

بەڵام ئەو لە کاتی سەلامەتی بەو شێوەیە بڕوای پتەو نەبووە، بەڵکو ئەو لەگەڵ شەهادەی (لا اله الا الله) دڵی پڕ بوو لە ئارەزوات و خۆشویستنی دنیا، نەفسی پڕبووە لە خەیاڵات و شتی تر، ڕووی وەرگێڕاوە لە خوای گەورە، ئەگەر بێتو دڵی پاك بکردایەوە بەم شێوەیەی لەسەرە مەرگ دایە، ئەوکات گوزەرانێکی تری دەبوو جگە لەو ژیانە ئاژەڵیەی ئێستای. والله مستعان.

# کارەکانت بسپێرە خودا

ئەو کەسە چی بەدەستە کە نێو چەوانی خۆی بە دەستی خوایە، دڵی لە ژێر دوو پەنجەی خوایە چۆنی بوێت وا ئاڵوگۆڕی پێدەکات، ژیان و مردنی بە دەست خوایـە، باشـی و خراپـی بەدەسـت خوایـە، جوولـە و وەسـتان و کـارو گفتـاری بـە ویـست و فرمانی خوایە، هەر جوولەیـەك دەکـات بـە فـەرمانی ئـەوە، هـەر کارێـك دەکـات بـە ویستی ئەوە.

کە ئەمانە هەمووی بـە ویـستی خوایـە سوپاسـی دەوێـت، چـونکە ئەگـەر خـوای گەورە ئەو کارانەی بسپێرێتە خودی مرۆڤەکـە، مرۆڤەکـە بـێ هێـزە و ناتوانێـت ڕای پەڕێنێت، ئەوکات تووشی هەڵە و سەرگەردانی دەبێت، ئەگەر ئەو کارانـە بـسپێرێتە کەسێکی تریش جگە لە خودی مرۆڤەکە، دەکـات سـپاردوویەتیە کەسـێکی بـێ هێـز کە نەسوود و نەزەرەر و نە ژیان و نە مردن و نە زندووکردنەوەی لە دەستە، ئەگـەر خوای گەورەش فەرامۆشی بکردایە، ئەکاتە دووژمن بەسەریدا زاڵ دەبێت و دەیکـات بە دیلی خۆی.

جا بۆیەئەو بـە ئەنـدازەی چـاو تروکـانێکیش مـرۆڤ بـە بـێ خـوای گـەورە حـاڵی پەرێشانە، بەڵکو لەگـەڵ هـەموو هەناسـەیەکدا پێویـستی بـە خودایـە بـە ئەنـدازەی گەردیلەیەکیش بێ خوا سەرگەردانە، لە کاتێکدا کە بەردەوام ئاتاجی خودایەیکەچی لەگەڵ ئەوەشدا پشتی تێ دەکات و ڕووی لێ وەردەگێڕێت و بە گوناھ و تاوان خودا لە خۆی تووڕە دەکات، لە کاتێکدا لە هەموو ڕوویەکەوە ئاتاجی ئەوە.

# پشت بە خوا ببەستە، خوا فەرامۆشت ناکات

ئەی مرۆڤی بێ ئاگا تۆ خۆت سەرقاڵکە بەو کارانەی کە خوا فەرمانی پێ کردووی بیکەی، خۆت سەرقاڵ مەکە بە شتێك کە بۆت دابین کراوە و دانراوە، چونکە خوای گەورە دوو شتی بۆت بڕیوەتەوە:

✍ ـ ڕزق و ڕۆزی.

✍ ـ ئەجەل و مردن.

ئەم دووانە مرۆڤەکان بۆ یەکێکیان هەوڵ دەدن و لەوی تریشیان ڕادەکەن، کەوابوو پێویست ناکات مرۆڤ خۆی بۆ ئەم دوانە سەر قاڵ بکات، چونکە هەر کاتێك تەمەن مابێت، ئەوا ڕزق و ڕۆزی بەڕێوەیە بۆی، هەر کاتێکیش خوای گەورە بە حیکمەتی خۆی دەرگایەکت لێ دابخات، ئەوا بە ڕەحمەتی خۆی دەرگایەکت لێ دەکاتەوە.

وورد بەوە و بیر بکەوە لە حاڵی ئەو کۆرپەلەی ناو سکی دایك، کاتێك کە خوێنە، خوای گەورە لە یەك ڕێگاوە خۆراکی بۆ دەنێرێت کە ڕێگای ریخۆڵەکەیە، جا کە لە سکی دایکی دەرچوو، ئەو ڕێگایەی لێ دادەخرێت، کەچی دوو ڕێگای تری لێ دەکرێتەوە کە لەوێوە خۆراکی زۆر لەوەی پێشتری خۆشتر و پاکتری بۆ دێت کە شیرێکی پاك و بێ گەردە، جا کە تەمەنی شیرخواردنیشی تەواو دەبێت ئەو دوو ڕێگایەی لێ دادەخرێت، بەڵام چوار ڕێگای چاکتر لەوی پێشوتری لێ دەکرێتەوە، ئەویش دوو خۆراکە و دوو خواردنەوەیە، دوو خۆراکەکە گۆشتی گیاندار و ڕووەکە، دوو خواردنەوەکەش ئاوو شیر و شتە بە تام و لەزەتەکانی ترە، جا کە مردیش ئەم چوار ڕێگایەشی لێ دادەخرێت، بەڵام ئەگەر لە چاکە کاران بێت خوای گەورە هەشت ڕێگای بۆ دەکاتەوە، کە هەر هەشت دەرگای بەهەشتە ئەوکات بەکامیاندا حەزبکات دەچێتە ژوورەوە. بەم شێوەیە خوای گەورە لە دنیا هەر شتێك لە مرۆڤی

بڕوادار بستێنێتەوە، ئەوە لە و چاکتر و باشتری پێ دەبەخشێ، ئەمەش تەنها بۆ مرۆڤی بڕواداره. چونکە خوای گەوره شتێکی لێ دەستێنێتەوه بێ نرخ بێت و نرخی نەبێت لە بری ئەودا شتێکی بەسوود و بە نرختری پێ دەبەخشێ، بەڵام مرۆڤ چونکە چاکەی خۆی نازانێت، بەخشش و حیکمەت و بەزەیی خواش بە چاکی ناناسێت، نازانێت سوود لەو شتەی لێی سەندراوەتەوه چییە و ئەو شتەی بۆی ئامادەکراوه لەباتی ئەو چییە! بەڵکو ئەو حەز دەکات زوو شتەکەی بە دەست بکات ئەگەر بێ نرخیش بێت، حەز لە شتێك ناکات درەنگ بەدەستی بکات ئەگەر بە نرخیش بێت.

ئەگەر مرۆڤ بە دادپەروەرانە بڕوانێتە ئەو کارانەی خوای گەوره بۆی دەردەکەوێت کە خوای گەوره لە دنیادا هەر خۆشی و لە زەتێکی لێ بسێنێتەوە بۆ ئەوەیە تاکو چاکتری پێ ببەخشێت، هەر شتێکی لێ دەسێنێتەوه، ئەوە لەو چاکتری پێ دەبەخشێ، کاتێك تووشی نەهامەتی دەکات تاکو لێی ببورێت، کاتێك تاقی دەکاتەوه بۆ ئەوەی پاکی بکاتەوه، دەیمرێنێت تاکو زیندووی بکاتەوە و لەم دنیایەدا ڕزگاری بکات و بیگەیەنێتە ئامانج و بەخششی خۆی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةٗ لِّمَنۡ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوۡ أَرَادَ شُكُورٗا﴾ (الفرقان: ٦٢). واتە: خوای گەوره شەو و ڕۆژی بە شوێن یەکدا ڕێکهێخستوه، پەندە بۆ کەسێك کە دەیەوێت یادەوەری وەربگرێت و دەیەوێت سوپاس گوزاری ئەنجام بدات.

دەفەرموێ: ﴿فَأَبَىٰٓ ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورٗا﴾ (الإسراء: ٩٩). واتە: ستەمکاران هەر بڕیاری یاخی بوون و سەرکەشی و کوفریان داوه و هیچی تر.

# چەند ئامۆژگاریەکی زێڕین

هەر کەسێك بەڕاستی نەفسی خۆی ناسیبێت سەرقال دەبێت بە چاکردنی هەڵە و عەیبەکانی خۆی، عەیبی خەڵکی لە بیر دەکات، هەر کەسێکیش بەڕاستی پەروەردگاری خۆی ناسیبێت، سەرقالْ دەبێت بەوەی کە چۆن پەروەردگار لە خۆی ڕازی بکات و ببێت بە خۆشەویستی خودا، ئەوکات هەوا و ئارەزواتی لەبیر دەکات.

چاکترین کردەوە ئەوەیە بە ئیخلاصەوە بێت و دوور بێت لە خەڵکی و منەتیشی لەسەر نەکەی.

## زۆربەی خەڵکی لە سێ ڕێگاوە تووشی دۆزەخ دەبن:

١. لە ڕێگای گوومانەوە، کەوا لە مرۆڤ دەکات گومانی پەیاکات لە ئاینی خوا.

٢. لە ڕێگای ئارەزواتەوە، کەوا لە مرۆڤ دەکات ئارەزوات و ڕابواردن پێش ڕەزامەندی و گوێ ڕایەڵی خوابخات.

٣. لە ڕێگای توورەییەوە، کەوا لە مرۆڤ دەکات بەردەوام توورە بێت و خەڵکی ڕقیان لێ بێتەوە.

## خراپە کۆ دەبێتەوە لە سێ بنچینە:

١. الکبر: خۆ بەگەورەزانین، کە هەر خۆ بەگەورەزانین بوو وای لە ئیبلیس کرد تووشی نەفرەتی خوا بێت.

٢. الحرص: سووربون لەشت، لەسەر ئەو سووربونە بوو وای لە ئادەم کرد لە بەهەشت دەرکرا.

٣. الحسد: ئێرەیی یان حەسوودی، هەر حەسوودی بوو وای لە کوڕەکەی ئادەم کرد براکەی خۆی بکوژێت.

جا هەر کەسێك خۆی لەم سیانە بپارێزێت ئەوا لە شەڕ و خراپە بە دوور دەبێت، چونکە کوفر لە خۆبەگەورەزانیەوە سەرهەڵدەدات، گوناح وتاوانیش لە سوربوونەوە سەرهەڵدەدات، خراپە و ستەمیش لە حەسوودیەوە سەرهەڵدەدات.

خوای گەورە بە حیکمەتی خۆی ئەندامەکانی دەرەوە و ژوورەوی لاشەی مرۆڤـی هەر یەکە و بۆ شتێك دروست کردوە، چاوی کردووە بە ئامێرێك بۆ بینین، گوێچکەی کردووە بە ئامێرێك بۆ بیستن، لـووتی کـردوە بـە ئامێـرێك بـۆ بـۆن کـردن، زمـانی کردوە بە ئامێرێك بۆ قسەکردن، دەستی کردوە بە ئامێرێك بۆ کارکردن، قاچـەکانی کردوە بە ئامێرێك بۆ ڕۆیشتن، دڵی کـردوە بـە ئامێـرێك بـۆ ناسـینی یەکتاپەرسـتی، ڕۆحـی کـردوە بـە ئامێـرێك بـۆ خۆشەویـستی خـوا، عـەقڵی کـردوە بـە ئامێـرێك بـۆ بیرکردنەوە و ووردبوونەوە لە کاری دین و دنیا و هەلبژاردنی کاری چاکە و بەسوودو بەلاوە نانی کاری بێ سوود.

خەسارەت مەندترین کەس ئەوەیە کە سەرقاڵە بە هەوا و نەفسی خۆی ئاگای لـە خوا نیـە، لـەویش زەرەرمەنـدتر ئەوەیـە سـەرقاڵە بـە خـەڵکی و ئاگـای لـە نەفـسی خۆشی نەماوە، لە حەدیسی (أبي سـعید)هـاتووە دەفــەرمووێ: ((اذا أصـبح ابـن آدم فإن الاعضاء کلها تکفر اللسان، یقول: اتق الله، فانما نحن بك، فإن إستقمت اسـتقمنا، و إن أعوججـت اعوججنـا))[1]، واتـــە: کاتێــك ئــادەمیزاد بــەیانی دەکاتــەوە، هــەموو ئەندامەکانی لاشەی ملکەچی زمان دەبن، هەموو ئەندامەکانی لاشەی بە زمانی حـاڵ دەڵێن: ئەی زمان لەخوا بترسە، چونکە ئێمەپەیوەستین بەتۆوە، ئەگەر تۆ ڕاسـت و ڕاستگۆبیت ئەوکات ئێمـەش ڕاسـت دەبـین و کـاری چاکە ئـەنجام دەدەیـن، بـەڵام ئەگەر تۆ ڕاستگۆنەبی و چەوت و لەوێر بیت ئەوکات ئێمەش چەوت و لەوێردەبین.

گووتراوە مانای : (تکفر اللسان) واتـە: ئەندامەکان ملکەچی زمان دەبن.

---

(١) حسن: رواه الترمذی (٢٤٠٩)، ابن خزیمة فی صحیحه، البیهقی فی شعب الایمان.

هەر وەك ووشەی (تكفر) لە حەدیسێكی تریش هاتووە: (إن الصحابة لما دخلوا علـى النجاشـي لم يكفـروا لـه) واتـــە: هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ كاتێـك چـوونە كۆشكەكەی (نجاشي) ملیان كەچ نەكرد بۆ (نجاشي) و سوجدەیان بۆ نـەبرد، هـەر لەبەر ئەم ملكەچ نەكردنەبوو (عمرو)ی كوڕی (العاصي)، بە (نجاشـي) گـووت: (ايها الملك: انهم لا يكفرون لك) واتـە: ئەی پادشا، نابینی ئەوانە ملكەچی ناكـەن بـۆت؟! جا كە ئەندامەكانی لاشە ملكەچی زمان دەبێت، چونكە زمان پۆستە و تـەرجمانی دڵە و وێستگەیە لە نێوان دڵ و ئەندامەكان.

كە ئەندامەكانی لاشەش بە زمان دەڵێن: (إنما نحن بك) واتـە: ئێمـە بـە سایەی تۆوە ڕزگار دەبین و بەسایەی تۆشـەوە تـێ دەچـین، جـا بۆیـە دەڵـێن: (ئەگـەر تـۆ ڕاست و ڕاستگۆبیت ئەوكات ئێمەش ڕاست دەبین و كـاری چاكە ئـەنجام دەدەیـن، بـەڵام ئەگـەر تـۆ ڕاسـتگۆنەبی و چـەوت و لـەوێر بیـت، ئـەوكات ئێمـەش چـەوت و لەوێردەبین).

# کامەرانی دنیا و قیامەت

پێغەمبەرﷺ لەم فەرموودەیەدا، بەختەوەری دنیا و قیامەتی پێکەوە کۆ کردۆتەوە، کە دەفەرمووێ: ((فاتقوا الله و أجملوا في الطلب))[1]، واتە: تەقوای خوا بکە، لە دنیاش هەر شتێك دەکەی بە جوانی و پوختی ئەنجامی بدە.

مەبەست لەم حەدیسە ئەوەیە، بە تەقوای خواکردن مرۆڤ لە قیامەت ڕزگاری دەبێت و بەختەوەر دەبێت، لە دنیاش مرۆڤ ئاوا بێت کە بە پوختی کارەکانی ئەنجامبدات و نە زیادەڕۆی نە کەم تەرخەمی لە عیبادەتدا نەکات، ئەوکات لە دنیاشدا بەم کارانەی بە ختەوەر دەبێت.

جا بە تەقوای خودا مرۆڤ بە ختەوەری لە قیامەت بە دەست دێنێت، بە جوانی و پوختی ئەنجام دانی کارەکانیشی، ئارامی دڵ و لاشە سوور نەبوون لەسەر دنیا و ماندوو بوون و کەلەڕەقی و هەوڵدان و نەگبەتی، خۆشەویستی دنیا و هەوڵدان بۆ دنیا بە دەست دێنێت.

کەوابوو: هەر کەسێك لە خوا بترسێت و تەقوای خوا بکات سەرفراز دەبێت و دەگات بە خۆش و نیعمەتەکانی بەهەشت، هەر کەسێکیش کارەکانی بە جوانی و پوختی ئەنجام بدات لە دنیادا دەحەسێتەوە لە هەوڵدان بۆ دنیا و ڕزگاری دەبێت لە غەم و خەفەتی دنیا، شاعیر دەڵێت:

قـد نـادت الـدنيا علـى نفـسها   لـو كـان في ذا الخلـق مـن يـسمع

كـم واثـق بـالعيش أهلكتـه   و جامـع فرقـت مـا يجمـع

واتە: دنیا هاوار دەکات و دەڵێت: ئای لەوانەی کە دەبیستن، چەندین کەس

---

(١) صحيح: رواه ابو نعيم فى (الحلية:١٠/٢٧ ـ ٢٦).

لەوانەی کە بە دنیا دڵخۆش بوون بە فەتارەم بردوون، چەندین کەس کە سەروەت و سامانیان کۆ کردۆتەوە لە سامانەکانیان دام بڕاندوون.

## ئازاری قەرزداری و تاوان

پێغەمبەرﷺ زۆر لە نزاکانیدا خۆی دەپاراست لە گوناه و لە قـەرزداری، چـونکە مرۆڤـــی گوناهبـــار لـــە دوا ڕۆژدا زەرەرمەنـــدە، مرۆڤـــی قـــەرزداریش لـــە دنیـــادا زەرەرمەندە.

# تەفسیری ئایەتی ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا ﴾

خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ (العنكبوت: ٦٩)، واتـە: ئەوانەی کە لە پێناو ئێمـەدا و بۆ ڕەزامەنـدی ئێمە هەوڵ و کۆششیانداوە و خۆیان ماندوو کردووە، بێگومان ئا ئەوانە ڕێنمونی دەکەین بۆ ڕێگای ڕاستی خۆمان، بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ چاکەکارانە.

دەبیـنین خـوای گـەورە لێـرەدا هیدایـەتی بەسـتاوەتەوە بـە تێکۆشـان، هەرکەسێکیش هیدایەتێکی تەواو و پوخت درا بێت، ئەوە جیهادێکی زۆری کردوە، واجبترین و لە پێشترین جهادیش جیهادی نەفس و ئارەزوات و جیهادی شەیتان و جیهادی دنیایە.

جا هەرکەسێك لـە پێنـاوی خـودا هەڵسێت جیهاد بکات لەگەڵ ئـەم چوارەدا، ئەوکات خـوای گەورەش هیدایـەتی دەدات بـۆ سـەر ڕێگـای ڕەزامەنـدی خـۆی ئـەو ڕێگایەی دەیگەیەنێتە بەهەشت، هەر کەسێکیش واز بێنێت لە جیهاد و پشت گوێی بخات، ئەوە بە ئەندازەی کەمتەر خەمیەکەی هیدایەتی لە دەست دەچێت.

(الجنید) لە تەفـسیر ئـەم ئایەتـەدا دەفـەرمووێ: واتاکـەی ئەوەیـە ئەوانـەی لـە پێناوی ئێمەدا جیهاد لەگەڵ هەواو ئارەزووەکانیاندا دەکەن بە تـەوبـە و پەشیمانی، هیدایەتی سەر ڕێگای ئیخلاصیان دەدەین، ناگونجێت مرۆڤ جیهـاد لەگـەڵ دووژمـنی دەرەوەی بکـات تـاکو جیهـاد لەگـەڵ ئـەم دووژمنانـەی ژوورەوەی نـەکات، جـا هەرکاتێك سەرکەوت بەسەر دووژمنەکانی ناخی خۆیدا ـ کە باسمـان کـرد ـــ ئـەوە بەسەر دوژمنانی دەرەوەشیدا زاڵ دەبێت، هەرکاتێکیش دووژمنانی ناخی بەسەریدا زاڵ بن، دوژمنانی دەرەوەش بەسەریدا زاڵ دەبن.

# هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی زانست

هەوڵدان و تێكۆشان بۆ بەدەست هێنانی زانست پلەیەكی زۆر بەرزە و گەورەیـە، چـاكترین و بـە سـوودترین زانـستیش قورئـان و سـوونەتە و تێگەیـشتنێكی چـاك و دروستە لەم دووانە و زانست بەو شتانەی چەمكەكانی لەسەر نازڵ بووە.

خـراپترین زانـستیش كـە قوتـابی خـۆی پێـوە مانـدوو بكـات، زانـستی بابەتـە نامۆكانە، ئەو بابەتانەی كە لەلایەن خواوە نازڵ نەبووە، زانستێكی سەردەمیش نیە كە سوود بەخش بێت، یان خۆی ماندوو دەكات بۆ فێربوونی بابەتە ئیختلافیەكان — ڕوو ناكاتە فەرموودەی خـوا ــ بـەڵكو ڕوو دەكاتـە قـسەی فـلان و فـلان و شـوێنی دەكەوێت، بە هیچ جۆرێكیش هەوڵنادات ڕای ڕاست و دروست هەڵبژێرێت.

جا ئەمانـە زۆر كـەمن كـە سـوود لـەم زانـستەیان ببیـنن. پیرۆزتـرین و باشـترین كاریش، ئەو كارانەیە كە خوا پێی خۆشـە، چـونكە ئـەو كارانـە مـرۆڤ خۆشەویـست دەكات لەلای خواو ڕێكیشە لەگەڵ دین و دنیا.

خراپتیرین كاریش ئەو كارانەیە كە دینداری بە نـاوی شـتێكەوە دەكـات، جـا كـە بەندایەتی خوا دەكات بۆ مەبەستی خۆی دەیكات نەك بۆ خوا.

جۆری یەكەم: بەندایەتی خوا دەكات مەبەستی خـوای گەورەیە.

جۆری دووەم: بەندایەتی خوا دەكات مەبەستی شتێكی تری هەیە.

# حاڵی زانای بێ عەمەل

زانایانی بەدکار بەوتەکانیان خەڵکی بانگ دەکەن بۆ بەهەشت، بەکارەکانیشیان خەڵکی بانگ دەکەن بۆ دۆزەخ.

جا کە بە وتەکانیان دەڵێن: خەڵکینە ڕوو بکەنە بەهەشت، کار و کردەوەکانیان دەڵێن: خەڵکینە گوێیان لێ مەگرن، چونکە ئەگەر بێتو ڕاستگۆ بن خۆیان وەڵامی خۆیان دەدەنەوە، ئەوانە خۆیان چاو ساغ و ڕێپیشاندەری کاروانەکان پیشاندەدەن، بەڵام لە ڕاستیدا وەك چەتەیەك وان لەسەر ڕێی خەڵکی و سەرگەردانیان دەکەن.

# چەمکێ لە ژیانی پێغەمبەر

پێغەمبەر ﷺ کە دەرچوو لە ژێر باڵی دوژمن، چووە ژێر باڵی سەرکەوتن، لەگەڵ ئەم سەرکەوتنە ناوی لە هەموو کوچ و قوژبنێکدا بەرز بۆوە جا خەڵکی کە ڕوویان تێکرد سێ جۆر بوون:

یەکەم: ئیمانداران کە ئیمانیان بە خوا و پێغەمبەر هێنابوو.

دووەم: خۆیان تەسلیمی کردبوو.

سێیەم: لە ترسا هاتبوونە ژێر باڵی.

خوای گەورە ئارامگری لە کێڵگەی دڵان دەچێنێت: ﴿فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ﴾ (الاحقاف: ٣٥)، واتە: تۆش هەروەکو پێغەمبەرە لێ براو و نەبەزەکان، سووربە لەسەر کارەکەت و خۆڕاگربە.

پێغەمبەرﷺ لە کاتی فەتح کردنی (مکة)دا بەشێوەیەك چووە ناو (مکة) کە کەس پێش ئەو و دوای ئەویش بەم شێوە نەچۆتە (مکة)، هاوەڵان لە (المهاجر) و (الانصار) دەورەیاندابوو کە بە ملکەچییەوە ملی ڕێگایان گرتبۆوە بەر، هاوەڵان هەر کەسە کاری خۆی بۆ دیاری کرابوو، بە کۆمەل دەهاتنە ژوورەوە، مەلائیکەت بەسەریانەوە بوو، (جبریل) هامووشۆی دەکرد لە نێوان پێغەمبەرﷺ و خوای گەورەدا، حەرەمی بۆ پێغەمبەر ﷺ حەلاڵ کرد کە بۆ کەسی تر جگە لەو حەڵاڵی نەکردبوو.

کە ئەو ڕۆژە خۆشە بەراورد دەکرێت لەگەڵ ئەو ڕۆژەی ﴿وَإِذۡ يَمۡكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثۡبِتُوكَ أَوۡ يَقۡتُلُوكَ أَوۡ يُخۡرِجُوكَ﴾ (الانفال: ٣٠)، واتە: بێتەوە بیرت ئەوسا خودانەناسەکان ویستیان فێڵێکت لێ بکەن، یان بەندت کەن، یان بتکوژن، یان دەرتبکەن.

پێغەمبەریش ﷺ بەخۆی و هاوەڵەکەی کۆچی کرد بۆ (مدینة)، کەچی پێغەمبەر ﷺ بە سەرکەوتووی هاتەوە بۆ (مکة) بۆیە ملی کەچ کرد بۆ ئەو خوایەی کە سەربەرزی کرد بەسەر دوژمنەکانیدا، ئێستا بەسەری خستووە و کردوویەتی بە سەردار.

ئەوەش (بلال)ە دوای ئەو ڕۆژە تاڵانەی کە بەهۆی گوتنی (أحد... أحد)وە ڕاکێش دەکرا بەسەر ئەو زەویە گەرمەدا، کەچی ئێستا بەسەر (کعبة)دا سەرکەوتوەو بانگ دەدات، خەڵکیش لە هەموو کوچێکەوە ڕوویان تێدەکرد و پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئیسلامەوە، بەڵام پێشتر تاك تاك دەهاتن.

کە پێغەمبەر ﷺ سەرکەوتە سەر کورسی سەربەرزی و سەرکەوتن، لێی نەهاتە خوارەوە، پادشاکان هەموو ملیان بۆ کەچ کرد، هەندێکیان کلیلی شاریان تەسلیم کرد، هەندێکیان داوایان لێدەکرد وازیان لێ بێنێت و ئاشت بێتەوە لەگەڵیاندا، هەندێکیان ڕازی بوون کە (الجزیة)یان لێ بسێنێت، هێندێکیشیان خۆیان ئامادەی جەنگ کردبوو.

بەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەو پەیامەی کە ئەمانەت بوو لەسەر شانی ڕایگەیاند و سەرکەوتنی بە دەست هێنا، خوای گەورەش پێی ڕاگەیاند: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ۝٢ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ۝٣﴾ (الفتح:١ ـ ٣). واتە: ئەی محمد بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی دیارو ئاشکرامان بە تۆ بەخشی تا خودا خۆشبێت لە تاوانەکانی پێشتر و داهاتووت، تاکو نیعمەتی خۆی بە تەواوی بڕێژێت بە سەرتدا، تا هیدایەتت بدات بۆ شوێنکەوتنی ڕاسترین ڕێگا, هەروەها تا خودا بە سەر دوژمناندا سەرکەوتووت بکات بە سەرکەوتنێکی باڵا دەستانە.

ئینجا (جبریل) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ سەرپشکی کرد لە نێوان مردن و ژیان، پێغەمبەریش ﷺ خزمەت خوای هەڵبژارد، چونکە تامەزرۆی دیداری خوابوو،

هەر بۆیە بەهەشتیەکان بۆ پێشوازی رۆحی پیرۆزی خۆیان ڕازاندەوە نەك بەو شێوەیەی کە تەشریفی هێنایە (مدینة)، چونکە ئەگەر بێت و عەرشی خوا بۆ یەك لە شوێن کەوتوانی بکەوێتە هەژان، ئەی دەبێت بە گەیشتنی رۆحی پیرۆزی گەورەی دروست کراوان کە محمدە دەبێت چۆن بێت؟!

ئای لەوەی کە ڕوو لە پێغەمبەرﷺ ناکات، ئای لەوەی کە لە دەرگای پێغەمبەرﷺ ناوەستێت، لەمەودوا ڕۆژی حەشر دەزانی چی بەسەرا دێت: ﴿يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ﴾ (الطارق: ٩). واتە: ئا لەو ڕۆژەدا هەموو نهێنیەکان ئاشکرا دەکرێن.

# حاڵی لە خۆبای بووەکان

ئەی ئەو کەسەی کە مەغرور بویتە و دڵت بە دنیاوە بەندە، ئاگاداربە و بزانە کە (ابلیس)ی نەفرەتی لێ کرا و لەو پلەوپایە دەرکرا بەهۆی ئەوە بوو فەرمانی یەك سوجدەی پێکرا نەیبرد، ئادەمیش لە بەهەشت دەرکرا بەهۆی خواردنی لوقمەیەکەوەبوو، (قابیل)یش لە بەهەشت قەدەغەکرا بەهۆی ئەوەوە بوو کە دەستی سوورکرد بە خوێنی براکەی، بزانە کە فەرمان بە کوشتنی زینا کەر کراوە بەهۆی تامێکی کەمی حەرامەوەیە، بەهۆی یەك ووشە کە کەسێکی پێ لەکەدار بکرێ مرۆڤ جەلدەی لێ دەدرێت، یان بەهۆی خواردنی دڵۆپەیەك مەیەوە، بەهۆی دزینی سێ درهەم دەستی دەبڕێت، کەواتە گوناه بەکەم مەزانە نەکا بەهۆی گوناهێکەوە تووشی ئاگربیت: ﴿وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا﴾ (الشمس:١٥). واتە: خوای گەورەش ناترسێ لە پاشە ڕۆژی ئەم تۆلە لێ سەندنانەیان.

تاوان بەکەم مەزانە، ئافرەتێك بەهۆی پشیلەیەکەوە چووە دۆزەخ، جاری وا هەیە مرۆڤ قسەیەکی هەڵە دەکات گوێی پێنادا و بەکەمی دەزانێ، کەچی بەهۆی ئەو قسەیەوە بە ئەندازەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، جاری واش هەیە مرۆڤ چەندین ساڵ دەژی لەسەر بەندایەتی خوا، کەچی لە کۆتایی تەمەنیدا شتێکی وا دەکات کە کۆتای بەخراپە دێت و تووشی دۆزەخ دەبێت.

کەوابوو تەمەن کۆتاییەکەی مەرجە، کردەوەش کۆتاییەکەی حیسابە، هەر کەسێك لە نوێژدا پێش سەلام دانەوە دەستنوێژی بشکێ، ئەوە نوێژەکەی هەموو هەڵدەوەشێتەوە، هەر کەسێکیش پێش بانگ فتار بکاتەوە، ئەوە ڕۆژوەکەی بەفیرۆ دەڕوات، هەر کەسێکیش ئاخر شەڕ بێت کۆتای کردەوەکانی بەخراپە بێت کە بە پەروەردگاری دەگات کۆتاییەکەی بۆ دەژمێردرێت.

لە دنیادا هەر كارێك ئەنجام بدەی ڕۆژی قیامەت بەرۆكت دەگرنەوە، بـەڵام كـارە خراپەكانت تووشی ئازار و سزات دەكەن، بیر بكەوە چەند جار چاكەوخێر دەرگایان پێ گرتوویت دەرگات لێ داخستوون وتوتـە: لەمەودوائـەنجامی دەدەم یـان ڕەنگـە تەمەنم مابێت بۆ ئێستا بیكـەم یـان بەشـكو ئـەو شـتەم بۆ ببێـت ئینجـا ئـەنجامی دەدەم.

چۆن ئەو مرۆڤە سەرفراز دەبێت كە ئیمانێكی نەخۆشـی هەیـە، ئومێـدێكی زۆری بەدنیا هەیە، دڵی نەخۆشە و چارەسەریشی ناكات، ئارەزویـەكی سەركەشـی هەیـە، سەرگەردان و بێ ئاگایە، كوێرە بەرانبەر بە حاڵی خراپی خۆیدا، نوقم بووە لـە نـاو گێژاوی نەفامیدا، دڵ تـەنگ دەبێـت بـە پـەروەردگاری، دڵخـۆش و كامـەران دەبێـت بەخەڵكی، یادو باسی خەڵكی كامـەران و بـەهێزی دەكـات، یـاد و باسـی خـواش دڵ تەنگ و بێزاری دەكات، لە ڕواڵەتیدا بەشێكی كـەمی بـۆ خـوا دیـاری كـردوە، وەكـو كردنی نوێژی بێ گیان، بەڵام دڵ و ناخی هەموو بەستۆتەوە بەغەیری خوا.

# دروستکردنی قەڵەم و ئادەم

یەکەم دروستکراو کە خوای گەورە دروستی کردبێت قەڵەم بوو، تـاکو ئەنـدازەی هەموو شتێك بنووسێت پێش دروست کردنیان، ئادەمیشی لە کۆتای هەموو دروست کراوەکاندا دروست کردووە، ئەمەش چەندین پەند و حیکمەتی تێدایە:

یەکەم: سەرەتا دەبێت خانی دروست بکرێـت، ئینجـا دەبێـت لـە نـاوی جێنـشین بیت.

دووەم: لێرەدا ئادەم غایەت و مەبەستە کە ئاسمانەکان و زەوی و ڕۆژ و مـانگ و وشکانی و دەریایی لە پێناوی ئەودا فەراهەم هێناوە، هەر بۆیەش دەبێت لە کۆتایی بێت.

سـێیەم: وەسـتـای پـسپۆر و شـارەزا کـارە چـاك و بەنرخـەکانی لـە کۆتایـدا ئەنجامدەدا، هەر وەك چۆن ئیشە پێشەکیەکان لەسەرەتادا ئەنجامدەدا.

چـوارەم: دەروونـی مـرۆڤ وایـە چـاوەڕوانی ئـەو شـتانە دەکـات، کـە دەسـت پێدەکرێت تا بزانێت کۆتاییەکە بە کـویٚ دەگـات، هـەر بۆیـەش دەبیـنین (موسـی) کاتێك بە ساحرەکانی فەرموو: ﴿أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ﴾ (یونس: ٨٠). واتـە: ئادەی چیتان هەیە فرێی بدەن و بیخەنە ڕوو! !

جا کە خەڵکی ئەم کارانەی ئەوانیان بینی، چاوەڕوانی کارەکـانی تریـان دەکـرد کە (موسی) ئەنجامی دەدات.

پێنجەم: خوای گەورە چاکترین پـەرتووك و پێغەمبـەرانی دوا خـستوە بـۆ ئـاخیر زەمان، وای کردوە ئەوانەی کۆتـایی دێـن بەسـوودتربێت لەوانـەی یەکـەم، دەبیـنین لەسەرەتادا چەند جـار (جبریـل) بـە پێغەمبـەری فـەرموو (إقـرأ) پێغەمبـەریش ﷺ دەیفەرموو: (وما أنا بقاريء) واتـە: من خوێندەواریم نیە، کەچی خـوای گـەورە لـە

کۆتایدا پێی فەرموو: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾(المائدة: ٣). واتـە: لـە ئیمـڕۆوە ئاینی ئیسلامم بۆ ئێوە تەواو کرد کە هەموو بوارێکی ژیانی لە خۆ گرتووە.

شەشەم: خوای گەورە لە ئادەمی کۆکردەوە بەوەی کـە لـە جیهـان هەیە، ئـەو جیهانی گچکەیە، ئەوەشی پێوەیە کە لە جیهانی گەورەدایە.

حەوتەم: ئادەم پوختەی بوونەوەرە، جا بۆیە وا گونجاوە کە دروست کردنـی لـە دوای هەموو دروست کراوەکان بێت.

هەشتەم: لەڕێز لێنانی خوا بۆ ئادەم، ئەوەیە کە هەموو پێویستی و ئاتاجیـەکی ژیانی بۆ فەراهەم هێناوە، کاتێك ئـادەم سـەری بـەرز کـردەوە بـینی ئەوانـە لـەلای ئامادەنە.

نۆیەم: خوای گەورە دەیویـست فـەزڵ و شـەڕەفی ئـادەم لەسـەر هـەموو دروسـت کراوەکانی تر دەربخات، جا بۆیە چەند شتێکی پێش ئەو دروست کرد، هەر بۆیـەش مەلائیکەتەکان فەرموویان: خوای گەورە هـەر شـتێك حـەز بکـات دروسـتی دەکـات، کەواتە هیچ دروست کراوێك لە ئێمە بەڕێزتر نیە.

کاتێـك خـوای گـەورە ئـادەمی دروسـتکرد، فـەرمانی بـە مەلائیکەتـەکان کـرد سوجدەی ڕێزی بۆ بەرن، بەم شێوە فەزڵ و ڕێزی ئادەم بەسـەر مەلائیکەتـەکان بە زانـست و زانیـاری دەرکـەوت، کـاتێکیش کـە ئـادەم تووشـی ئـەو گوناهـە بـوو، مەلائیکەتەکان گومانیان وابوو کە بەهۆی ئەم گوناهەوە ئەو ڕێزەی نامێنێت، جا کە تەوبەی کرد و ڕووی کردە پـەروەردگاری، مەلائیکەتـەکان بۆیـان دەرکـەوت کـە لـە دروستکراوەکانی خوای گەورە نهێنی هەیـە جگـە لـە خـۆی کەسـی تـر لـەم نهێنیـە نایزانێت.

دەیەم: خوای گـەورە بـە دروسـتکردنی قەڵـەم، ئـەم جیهانـەی دەسـتپێکرد، بـە دروسـتکردنی مـرۆڤیش کۆتـایی پێهێنـا، چـونکە قەڵـەم ئامرازێکـە بـۆ گـەیشتن بـە زانـست، بـەڵام مرۆڤەکـە زاناکەیـە، هـەر بۆیـەش خـوای گـەورە فـەزڵی ئـادەمی دا بەسەر مەلائیکەتەکان بەهۆی زانستەوە بوو.

بڕوانـە: خـوای گـەورە چـۆن پـێش دابەزانـدنی ئـادەم بـۆ زەوی عـوزری لـێ وەرگرتووە و فەزڵ و ڕێـزی بـۆ مەلائیکەتـەکان ئاشـکرا کـردووە، پـێش بـەدیهێنانی ناوی بردووە کە فەرموویەتی: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗ﴾ (البقرة:٣٠). واتــە: من جێ نشینێك لە زەویدا دروست دەکەم.

بڕوانـە کـە چـۆن نـاوی بـردووە بـە خەلیفـە پـێش دروسـتکردنی، عـوزری لـێ وەرگرتووە پێش دابەزینی، بـەوەی کـە دەری بڕیـوە بـەوەی (في الارض) واتــە: مـن جێ نشینێك لە زەویدا دروست دەکەم.

بەڵی ئەگەر کەسێك کەسێکی خۆش بووێت عوزری لێ وەردەگرێت پێش ئـەنجام دانی تاوانەکەی، جا کاتێك کـە بـەدیهێنا و وێنـەی کێـشا (٤٠) سـاڵ لەبـەر دەرگـای بەهەشت هێشتیەوە، چونکە حاڵی خۆشەویـست وایـە، کـاتێکیش کـە زەلیلـی کـرد تاکو لەو ڕۆژە لە خۆبایی نەبێت کە سووجدەی بۆ دەبرێت.

(ابلـیس) بـە تەنیـشت لاشـەکەیدا دەڕۆیـشت و زۆری پـێ سـەیر بـوو دەیگـووت: بێگومان دەبێت ئەمە بۆ مەبەستێك دروست کرابێت!

ئینجا لـە دەمـی دەچـووە ژوورەوە لـە پـشتیەوە دەردەچـوو دەیگـوت: ئەگـەر بەسەرتدا زاڵبم ئەوە بە هیلاکت دەبەم، بەڵام ئەگەر تـۆ بەسـەرمدا زاڵ بـووی ئـەوە بێ فەرمانیت دەکەم، نەشی دەزانی کە لەسەر دەستی ئەودا بە هیلاك دەچێت.

ئیبلیس کە دەیبینـی قـوڕە بەکـەمی دەزانـی، جـا کاتێـك خـوای گـەورە وێنـەی قوڕەکەی کێشا ئیبلیس حەسوودی پێ هات، کە ڕۆحـی بەبـەرا کـرد لـە حەسـوودیا وەخت بوو بمرێت، کاتێکیش بەڕێزی کردو سەربەرزی کرد لـە نـاو مەلائیکەتـەکان و دروستکراوەکانی عەرزکرد، مەلائیکەتەکان ووتیان: خودایە ئەوەنیە ئێمە بـە پاکـت ڕادەگرین و تەسبیحاتت دەکـەین، خـوای گـەورەش فـەرمووی: ئـەوەی مـن دەیـزانم ئێوە نایزانن، دەی ئەگەر دەیزانن ناوی ئەو شتانەم پێ بڵێن؟! جا چونکە هیـچیان پێ نەبوو سەریان شۆرکرد و دانیان هێنا.

هەر بۆیە لە ناو مەلائیکەتەکاندا بانگبێژی ڕێـزی ئـادەم بـەرزبۆوە و فـەرمووی: کڕنۆشـی ڕێـز بـەرن بـۆ ئـادەم، ئینجـا هـەموویان کڕنۆشـی ڕێزیـان بـۆ بـرد، تـەنها (ابلـیس) نـەبێت کـە لـە گۆشـەیەك وەسـتابوو کڕنۆشـی نـە بـرد، چـونکە پیـسە و

پیسیەکەشی ڕقـەکاری و دەمارگیریەکەیـدا ڕەنگـی داوەتـەوە، پیسیەکەی پـاك نابێتەوە چونکە تێکەڵ بووە لەگەڵ خودی خۆی، جا کاتێك ئادەم تـەواو دروستکرا گوترا: دەبێت بە کڕنۆش بۆ بردنی بڕازێندرێتەوە، قەدەر وابوو کە گوناهی بەسەردا بێت تاکو شوێنەواری بەندایەتی لە زەلیلی بەدی بکرێت.

ئـەی ئـادەم: ئەگـەر گوێمـان نـەدابا بـەو لوقمـەی کـە خـواردت، ئـەوکات حەسوودەکان دەیانگووت: چۆن ڕێـز لـە کەسێك دەگرێت کـە ڕام ناگرێت لەسـەر لوقمەیەك.

ئەی ئادەم: ئەگەر دانەبەزیبای لە بەهەشت ئێستاکە بە ڕێزەوە سەرنەدەکەوتی بۆ بەهەشت، نامـەی قبـوڵ بـوونی دووعاشـت بـۆ نـەدەهات کـە دەڵێـت: (هـل مـن سائل)واتـە: ئایا کـەس هەیـە نـزا بکـات نزاکـە قبـوڵ کـەم؟! ئەگـەر دانەبـەزیبای ئەوکات بۆنی دەمی ڕۆژووەوان ئاوا پیرۆز نەدەبوو، ئینجا ڕوون بـۆوە کـە خـواردنی ئەم لوقمەیە لە خراپەی ئادەمەوە نەبووە.

ئەی ئادەم: خۆشی پێکەنینت لە بەهەشت بۆ خۆت بوو، گریان و پەشیمانیشت لە دنیا بۆ ئێمە بوو.

بەردەوام ئەو خواردنەی کە ئادەم خـواردی دووبـارە دەبێتـەوە، بـە جۆرێـك کـە ئەم دەردە نەوەکانیشی گرتۆتەوە، جا بۆیە خوای زانا و میهرەبان لەسـەر دەسـتی پزیـشکانی بوونـەوەر دەرمـانی چارەسـەری بـۆ نـاردوون: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ﴾ (طه: ١٢٣). واتـە: ئەگەر هیدایەتی مـن بۆ ئێوە هات، ئەوەی شوێنی هیدایەتی من بکەوێت، نە گومڕا دەبێـت، نـە ناسـۆری دێتە ڕێی.

جـا پزیـشکەکە فـەرمانی پێـدەکات کـە خۆیـان بپـارێزن لـە قەدەغـەکراوەکان، فەرمان پێکراوەکانیش ئەنجام بدەن، جا ئەگـەر وای کـرد ئـەوە سـەلامەت دەبێـت. بـەڵام هـاوار بـۆ ئـەو کەسـەی هێـزی خـۆی ناپارێزیـت و ئـارام لەسـەر دەرمـان و عیلاجەکان ناگرێ، ئەوە بەرەو تیـا چـوون دەچێت، ئەگـەر قـەدەر یارمـەتی بدا و

تۆش پشتیوانی پزیشك بکەی لەوەی کە پارێزگاری خۆت بکەی، ئەوە سەرفراز دەبی، بەڵام ئارەزووات چاوی کوێر کردوون کە وادەزانن تەنها هەر ئەو ئارەزووانە هەیە و هیچی تر.

ئای کە چاو ساغی چەند باشە بۆ مرۆڤ، ناتوانێت کات ژمێرێك ئارام بگرێت، کەچی تەحەمولی بەردەوام زەلیلی دەکات، گەشت دەکا بەرەو ڕووی دنیا کەچی دنیا لەو هەڵدێ، دانیشتوە و گەشت ناکات بەرەو قیامەت کەچی ئەو بەرەو ڕووی دێت.

ئەگەر کەسێکت بینی شتی بە نرخ و نایاب بە شتی بێ کەڵك و بێ نرخ دەگۆڕێتەوە، بزانە ئەو کابرایە گێل و گەمژەیە.

# چەند ئامۆژگاریەکی زێڕین

ئادەم چونکە خواناسی ڕاستەقینە بوو، بۆیە خـوای گـەورە بـەهۆی گوناهەکـەی سەرگەردانی نەکرد.

خـوای گـەورە بـە نـەوەی ئـادەم دەفـەرمووێ: ئـەی نـەوەی ئـادەم ئەگـەر بـە گوناهێکی زۆرەوە بە ئەندازەی زەوی بەخزمەتم بگەی، هـیچ هاوبەشـێکت بـۆ بڕیـار نەدابم، ئەوکات منیش پڕ بە زەوی لێبووردنت بۆ ئامادە دەکەم.

کاتێـك خـوای گـەورە دەزانێـت کـە بەنـدە گوناهێـك دەکـات، مەبەسـتیشی بـێ فەرمانی ئەو نیە و ڕەخنەی نـەگرتووە لـە حیکمـەتی ئـەو، بـەڵکو هـەواو ئـارەزوات بەسەری زاڵ دەبێ و شەیتان بۆی دەڕازێنێتەوە، ئومێدیشی بـە لێبـووردنی خـواش هەیە.

ئەگـەر ئەنجامـدانی گونـاح نەبایـە ئـەوە ئـادەم لەبـەر لـە خۆبـاییبوون لـە بـەین دەچوو.

خۆت سەرقاڵ بکە بە خوا لە دنیا، دوای مردنت تەنها ئەوت بەسە.

سـەیر لـەوە دانیـە هـەژارێك چـاکەکارێکی خۆشـدەوێت، چـونکە چـاکەی لەگـەڵ کردووە، بەڵکو سەیر لەوەدایە چاکەکارەکە هەژارەکەی خۆشدەوێت.

# باسی قورئان

قورئان ووتەی خوای گەورەیە، جا خـوای گـەورە ئـەم قورئانـەی بـۆ بەنـدەكانی ڕۆشـن كردۆتـەوە بـە سـیفاتەكانی خـۆی، ئەگـەر بـەدڵێكی ئامـادە و دادپـەروەرانـە ووردبوویەوە لە قورئان، ئەوكات دەبینین خـوای گـەورە بـە هەیبـەت و گـەورەیی و شكۆداری خۆی ڕۆشنی دەكاتەوە، ئەوكات ئەو مرۆڤـە ملكـەچ دەكـات و ئـارەزواتی خۆی بۆ دەشكێنێت، خۆبەگەورەزانین لە نـاخی خـۆی ناهێڵێـت، هـەر وەك (خـوێ) چۆن لە ئاودا دەتوێتەوە.

جاری واش هەیە ئەم قورئانە بـە سـیفاتە جـوان و بـێ كـەم وكوڕیەكانی ڕۆشـن دەكاتەوە، ناو و سیفات و كارەكانیەتی كە بەڵگـەن لەسـەر بـێ كـەم و كـوڕی زاتـی خوای گەورە، ئا ئەوكات ئەو مرۆڤە بە گوێرەی ناسینی سیفاتە جـوان و بـێ كـەم و كوڕیەكانی خودا دڵی پڕ دەبێت لە خۆشەویستی ئـەو، ئەگـەر كەسـێكی تـر بیـەوێت ئەم خۆشەویستیە بگۆڕێت بە خۆشەویستی خۆی دڵی ڕازی نابێت.

هەر كاتێكیش قورئانی ڕۆشن كردەوە بە سیفاتی (الرحمة) و (البر) و (اللطـف) و (الاحسان)ی خۆی، هێزی ئومێد لە بەنـدە سـەر هەڵدەدات و ئومێـدی بـەخوا پتـەو دەبێت، تەماعی بۆ پەیادەبێت و ڕوو دەكاتە پەروەردگاری، جا ئەگەر مرۆڤ ئومێدی بۆ شتێك پەیدابوو كاری بۆ دەكات، هەر وەك جوتیار ئەگەر چاوی لە بـەروبوومێكی زۆر بێت ئومێدی پێ بێت زەویەكەی چاك دەكێلێت و خۆی پێ ماندو دەكات، بـەڵام ئەگەر بێ ئومێد بێ لە زەویەكەی لە كێلانی كەمتەرخەمی دەكات.

هــەر كــاتێكیش قورئــانی ڕۆشــن كــردەوە بــە ســیفاتی دادپــەروەری و تۆڵــە لێسەندنەوە و سزادانی بەنـدە بـە تـوڕەیی خـۆی، ئـەوە نەفـسی سـەركەش ملكـەچ دەبێت و سڵ دەكـات و پـشت هەڵدەكات لـە ئـارەزوات و گەمـەو گاڵتـە و حـەرام، جڵەوی نەفسی خۆی دەگرێ و ترس و بیم دایدەگرێت.

هەر کاتێکیش قورئانی ڕۆشن کردەوە بە فەرمان و قەدەغەکردن و پەیمان و ئامۆژگاری و ناردنی پێغەمبەران و کتێب و شەرع، هێزی گوێرایەڵی و ئامۆژگاری و بیرخستنەوە و بەڕاست زانین و ملکەچی و خۆ پاراستن لە قەدەغەکراوەکان لە مرۆڤدا سەرهەڵدەدات.

هەرکاتێکیش قورئانی ڕۆشن کردەوە بە باسکردنی سیفاتی بیستن و بینین و زانستی خۆی، ئەوکات هێزی شەرم لە بەندەدا سەر هەڵدەدات، کە شەرم دەکات خوای گەورە لەسەر شتێك ببینێت کە ئەو شتە حەرام بێت، شەرم دەکات خوای گەورە شتێکی لێ ببیستێ شتەکە حەرام بێت، دەترسێت لەو شتانەی کە لەدڵیدا پەنهانی داوە نەکات خوای گەورە سزای بدات، تاوەکو وای لێدێت هەموو جوولە و کارو کردەوەو گوفتارەکانی بە پێی شەرع دەبێت.

هەر کاتێك خوای گەورە قورئانی ڕۆشن کردەوە بەوەی هەلسورێنەری کاروباری خەڵکیە و ڕۆزیان دەدات و زیانیان لێ بە دوور دەخاتەوە و دۆستانی خۆی سەر دێخێت و دەیانپارێزێت و لەگەڵیاندایە، مرۆڤ کە ئەمەی بۆ ڕۆشن بۆوە تەوەکولی بە خوا دەبێت و ڕووی تێدەکات و بە هەموو کاروو بارەکانی خوا ڕازی دەبێت.

(التوكل) واتە: بەندە بێ دەسەلاتی خۆی دەردەبڕێت بەرانبەر بە خوا و ڕازی دەبێت بەو کارانەی کە خوا بۆی هەڵبژاردووە.

هەر کاتێکیش سیفاتی (العز) و (الكبرياء) بۆ مرۆڤ ڕۆشن بۆوە، ئەوکات ئەو مرۆڤە دڵی ئارام دەگرێ و ملکەچ دەبێت بۆ گەورەی خوا و خۆی بەکەم دەزانێت بەرانبەر بە (الكبرياء)ی خوا و دڵ و هەموو ئەندامەکانی لاشەی ملکەچی خوا دەکەن، ئەوکاتیش شلەژان وترس و پەشۆکانی لە دڵدا نامێنێت، بەڵکودڵ و زمان و هەموو ئەندامەکانی تریشی ئارام و ئاسودەی دایدەگرێت.

کۆی ئەوانە بگووترێ ئەوەیە:

مرۆڤ بە سیفاتی (الالوهية)ە خوا دەناسێت یان بە سیفاتی (الربوبية)ە خوا دەناسێت، مرۆڤ لە ڕێگەی ناسینی سیفاتی (الالوهية) خۆشەویستی خوای لە دڵ دەچەسپێت، بە جۆرێك تامەزرۆی ئەوە دەبێت بە خزمەتی بکات، هۆگر و دڵخۆش

دەبێت بە بەندایەتی کردنی خوا، پەلە دەکات و پێشبرکێ دەکات بۆ ئەوەی نزیک بێتەوە لە خوا، بەندایەتی زۆر دەکات تاکو خۆشەویست بێت لە لای خودا، بەردەوام وێرد و یادی خوای لەسەر زماندایە لە خەڵکی هەڵدێت ڕوو دەکاتە خوا، هەموو مرازی دەبێتە ڕەزامەندی خوای گەورە.

لە ڕێگای ناسینی سیفاتی (الربوبیة)ش مرۆڤ تەوەکولی لە دڵدا دەچەسپێت و ڕوو لە خوا دەکات و داوای یارمەتی لەو دەکات و هەر ملکەچی ئەو دەبێت، بێگومان مرۆڤ دەبێت (الربوبیة)ی خوا لە (الالوهیة)ی خوا بەدی بکات، (الالوهیة)ی خواش لە (الربوبیة)ی خوا بەدی بکات، واتە: کە (الربوبیة)ی بۆ ڕۆشن بۆوە ملکەچی (الالوهیة)یەش بێت، سوپاس و ستایشی خوا لە مولکی خوا بەدی بکات، عیزەتی خوا لە لێبووردنی خوا بەدی بکات، حیکمەتی خوا لە (قضاء و قدر)ی خوا بەدی بکات، نیعمەتی خوا لە تاقیکردنەوەکانی خوا کە بەسەری دێنێت بەدی بکات، بەخششی خوا لەو شتانە بەدی بکات کە لێی قەدەغە کردووە، چاکە و لوتف و ڕەحمەتی خوا لە هەڵسوڕێنەری کارەکانی خوا بەدی بکات، بەزەیی و چاکەی خوا لە لێخۆش بوونی خوا بەدی بکات.

بەڕاستی ئەگەر وردبینەوە ئەوە لە فەرمان و قەدەغەکراوەکانی خوا بەخشش و حیکمەتی خوا بەدی دەکرێت، لە ڕەزامەندی و تووڕەیی خوا عیزەتی خوا بەدی دەکرێت، ئارامی خوا لە پەلەنەکردن لە زادانی بەندەکانی بەدی دەکرێت، بەزەیی و بەخششی خوا لە وەرگرتنی نزای بەندەکانیدا بەدی دەکرێت، دەوڵەمەندی خوا لەوە بەدی دەکرێت کە ئاتاجی کەس نیە.

بەڵێ: ئەگەر بەدڵێکی ئامادە و دادپەروەرانە وردبوویەوە لە قورئان، ئەوکات بۆت ڕۆشن دەبێتەوە کە پادشایەك هەیە هەڵسوڕێنەری هەموو جیهانە و لەسەروی هەموو ئاسمانەکان دایە لەسەر (عرش)ی خۆی دەسەڵاتدارە و جێگیرە، کاروباری بەندەکانی بەڕێوە دەبات، فەرمان دەدا و قەدەغەدەکات، پێغەمبەران ڕەوانە دەکات، پەیام ڕەوانە دەکات، لەو کەسە ڕازی دەبێت کە چاکەسازە، لەو کەسەش

تووڕه دەبێت کە بەدکارە، بەپێی کاری بەندەکانی پاداشت و سزایان دەداتـەوە، دەبەخشێ و دەگرێتەوە، مرۆڤ بە عیزەت دەکا یان زەلیلی دەکات، بەندەکانی بەرز و نزم دەکا، لەسەروی هەر حەوت ئاسمانەکانەوە دەبیستێ، زانایە بەهەموو کارێکی پەنهان و ئاشکرادا، چی بوێت ئەنجامی دەدات، دوورە لە هەموو کەم و کوریەك هیچ شتێك جوولە ناکات تاکو گەردیلەیەکیش بێت مەگەر بە فـەرمانی ئـەو نـەبێت، هـەر گەڵایەك لە درەختێکەوە لێبێتەوە خوا بە ئاگایە لێی، هیچ شتێك سوود نابەخشێ و توانای سوودی نیە مەگەر بە فەرمانی ئەو نەبێت.

# كۆچكردنی پێغەمبەر بۆ مەدینە

پێغەمبەرﷺ كە بەیعەتی لە (أهل العقبة) وەرگرت فەرمانی بە هاوەڵەكانیدا كۆچ بكەن بۆ (مدینة)ە، جا (قریش) كە بەمەیان زانی و زانیان كە پێغەمبـەر و هـاوەڵانی زۆر بوونە و لەمەودوا دەیپارێزن و پـشتگیری لـێ دەكـەن، بـەم بۆنەیـەوە كەوتنـە بیركردنەوە بۆ چارەسەری ئەم كارە كە وەك كۆسپێك بوو لـە ناودڵیانـدا، ئـەوەبوو هێندێكیان وایان بە چاك دەزانی بەند بكرێت، هێندێكی تـر بـە چـاكیان دەزانـی لـە (مكة) دەربكرێت، بەڵام پاشان لەسەر ئەوە كۆك بوون كە بكوژرێت.

بۆیە لەئاسمانەوە ئەم هەواڵە درا بە پێغەمبەر و فەرمانی پێكرا كە جێگای خـۆی جێبێڵێـت، ئـەوەبوو لەگـەڵ (ابـو بكـر) كەوتنـە ڕێ بـۆ(مدینـة)، جـا كاتێـك دوور كەوتنەوە لە (مكة) (ابو بكر) ترسـی لێـی نیشت، چونكە دەترسا لـە پێـشەوە بـۆ پێغەمبەرﷺ بێن، بۆیە پێشی دەكەوت.. دەترسا لە پـشتەوە بێن بۆیـە لـە پـشتی دەڕۆی.. بـــەم شـــێوەیە دەچـــوە لای ڕاســـت و لای چـــەپی تـــاكو گەیـــشتنە ئەشكەوتەكە.

كە گەیشتنە ئەشكەوتەكە (ابو بكر) پـێش پێغەمبـەرﷺ چووە ژوورەوە، تـا چ شتێكی ترسناكی تیابێت ئەو تووش بێت نەك پێغەمبەر، خوای گەورەش درختێكـی لە وێدا بۆ ڕواندن كە پێشتر لەوێدا نەبوو تاكو ببێت بەسێبەر بۆ ئـەوان و ڕێگـاش لـە دووژمنەكانیان وون بكـات، جـاڵ جاڵۆكـەیێكیش هـات لەسـەر كونی ئەشـكەوتەكەدا هێلانـەی خـۆی دروسـتكرد، خـوای گـەورەش دوو كـۆتری نـارد لەســەر كـونی ئەشـكەوتەكە هێلانـەیان دامەزرانـد، تـاكو چـاوی ئـەو دوژمنانـە كـوێر بكـات كـە لەدوایاندا دەگەڕێن، ئەمە (معجزة)ی تیایە كە بەم سەربازە بـێ هێزانـە بـەرگری لـە دۆستانی خۆی دەكات، ئەو دووژمنانەی بە دوایـان كـەوتبون، هاتنـە سـەر دەرگـای ئەشكەوتەكە بە جۆرێكی ئاوا نزیك بوونەوە كە پێغەمبەر و (ابـو بكـر) گـوێ بیستی دەنگیان بوون، بۆیە (ابـو بكـر) تـرس لـێ نیـشت و گـووتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا

ئەگەر بێتو سەیری ژێر پێیـان بکـەن ئێمـە دەبیـنن، پێغەمبـەریش ﷺ دەیفـەرموو: ((ئەی (ابو بکر) گومانت چییە بە دوو کەس کە خوا سێیەمیانە؟)).

جا پێغەمبەر ﷺ بـینی (ابـو بکـر) زۆر پەرێشانە، ئـەوەش لەبـەر خـۆی نـەبوو، بەڵکو لەبەر پێغەمبەری بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دڵـی دەدایـەوە بـەم مژدەیـە: ﴿لَا تَحْـزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾ (التوبة: ٤٠). واتـە: ئـەی ـ ابـو بکـر ـ دڵگیر مەبە خـوا لەگەڵمانە.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموێ: ئێمە پێکـەوەین، بۆمـان دەردەکـەوێت کـە (ابو بکر) بەڕاستی پێکەوە بووە بە مانای کەلیمە، بەوەی دەبینین بە پێغەمبەر ﷺ گـوتراوە (رسـول الله)، بـە (ابـو بکـر)یـش گـوتراوە (صـاحب رسـول الله)، کـە پێغەمبەر ﷺ وەفاتیشی کرد، بە (ابو بکر)یان دەگوت: (خلیفة رسول الله) ـــ هـەر پێکەوە بوو لەگەڵیدا ـ بەڵام کاتێك (ابو بکر) وەفاتی کرد بـە کەسـی تـر نـەگووترا (خلیفة رسول الله) بەڵکو دەگووترا: (امیر المؤمنین).

بـەم شـێوەیە سـێ ڕۆژان لـە ئەشـکەوتەکەدا مانـەوە، پاشـان لـە ئەشـکەوتەکە دەرچوون و ڕێیان گرتە بەر بۆ (مدینة)ە، (قضاء و قـدر)ی خـواش بـە زمـانی حـاڵ دەیگووت: بێگومان بەشێوەیەکی ئاوا دەچیە (مدینة) کە نە پـێش تـۆ نـە دوای تـۆ کەس بەم شێوەیە نەچۆتە (مدینة)ە، ئینجا کە دەڕۆیشتن بـۆ (مدینـة)، لـە ڕێگـادا (سراقة)ە پێیان گەیشت، پێغەمبەر ﷺ بینی وا (سراقة) خەریکـە دەیانگـاتێ، نـزای کرد کە خـوا ڕزگاریـان بکـات، بۆیـە هـەردوو پێـی ئەسـپەکەی (سـراقة) بـە زەویـدا چەقی، (سراقة)ە کەزانی ئەمە نهێنیەکی تیایە ناتوانێت دەستیان بەسەردا بگرێـت، پێی گووتن: پارە و خۆراکتان ناوێت؟

پێغەمبەر ﷺ پارەی (سراقة)ی بۆ چیە لە کاتێکدا بە کۆڵ پارەی پێشکەش کـرا ڕەتی کردەوە، ئەی خۆراکی بۆ چیە لە کاتێکدا بـۆ خـۆی دەیفـەرموو: ((أبیت عنـد ربي یطعمني و یسقیني))(١). واتـە: من پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم دەدات.

---

(١) صحیح: رواه البخاري و مسلم.

بەڵێ: دیاری ئەم پێکەوەبوونە تەنها بە (ابو بکر) بەخشرا بوو بە کەسی تر نەبەخشرابوو، بڕوانە: (ابو بکر) دووەم کەس بوو کە موسڵمان بوو، دووەم کەسیش بوو دوای پێغەمبەرﷺ نەفسی خۆی بەخشی بە ئیسلام، لە زهد و تقوادا، دووەم کەسیش بووە لە دۆستایەتی کردنی پێغەمبەرﷺ، دووەم کەسیش بووە لە هەڵسوڕاندنی کاری موسڵمانان[1]، دووەم کەسیش بووە دوای پێغەمبەرﷺ بووە بە مشوورگێڕ، لە تەمەن دووەم کەس بووە بە تەمەنی پێغەمبەر بچێت، لە هۆی مردنی دووەم کەس بووە بەو هۆیەوە بمرێت کە پێغەمبەرﷺ پێی مرد، چونکە ئەو هۆیەی پێغەمبەرﷺ پێی وەفاتی کرد کاریگەری ژەهرەکە بوو (ابو بکر)یش هۆی وەفاتی ژەهر بوو[2].

(ابو بکر) کاتێك کە موسڵمان بوو چل هەزار درهەمی هەبوو هەر هەمووی لە پێناوی خوا بەخشی، لە کاتێکدا کە موسڵمانان زۆر ئاتاج بوون، بۆیە پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: ((مانفعني مال، ما تفعني مال ابي بكر)) واتە: ماڵ و دارایی کەس وەکو ماڵ و دارایی (ابو بکر) بە فریام نەکەوت.

بەڕاستی فەزڵی (ابو بکر) زیاتر بوو لە فەزلی بڕوادارنی ئەهلی فرعون، چونکە ئەهلی فرعون ئیمانی خۆیان دەرنەدەخست لە ترسان، بەڵام (ابو بکر) ئیمانی ڕاگەیاند و ئاشکرایکرد، فەزڵی (ابو بکر) زیاتر بوو لە فەزڵی بڕوادارنی ئەهلی یاسر، چونکە ئەهلی یاسر سەعاتێك جەنگان کەچی (ابو بکر) چەندین ساڵ جەنگا، هەر (ابو بکر)بوو کاتێك گوێ بیستی بانگەوازی: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ (البقرة: ٢٤٥) بوو، وەڵامی دایەوەو ماڵی بەخشی، بۆیە شیاو بوو، بەم هەمو مەدح و ستایشە﴿وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى ﴿١٧﴾ ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾﴾(الليل: ١٧ ـ ١٨).

---

(١) پێغەمبەرﷺ یەکەم کەس بووە کە کاری موسڵمانانی هەڵسوڕاندووە، دوای ئەو ابو بکر بووە، کە دەکات دووەم کەس بووە لە هەڵسوڕاندنی کاری موسڵمانان.

(٢) ئیمامی (الطبري) لە مێژووەکەی خۆیدا دەفەرموێ: دەڵێن هۆی مردنی ابو بکر ئەوەبوو کە جوولەکە ژەهریان بۆ کردۆتە ناو خواردنەکەی... ئەوەبوو ساڵێك بەو ژەهرەوە ناڵاندی دوای ساڵەکە وەفاتی کرد.

چەندین ئایەت و حەدیس باسی فـەزڵی (ابـو بكـر) دەكـات، (مهـاجر) و (أنـصار) هەموو پەیمانیان دایە (ابو بكر) لەسەر (خلافة).. جا ئەی ئـەو كەسـانەی ڕقتـان لـە (ابو بكر)ە هەركاتێك ناوی دێت دڵتان پڕ دەبێت لە ئاگر، هـەر كاتێـك باسـی فـەزڵی (ابو بكر) دەكرێت ئەوان گەمژەتر دەبن و لە خەفەتان بچوكتردەبنەوە، ئایا شیعەی بێ بڕاو كە جنێو بەو زاتە پاكە دەدەن ئەم ئایەتـەیان نەبیـستووە: ﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ﴾ (التوبة:٤٠)

ئەو پیاوە بەڕێزە كاتێك پێغەمبەرﷺ داوای لێ كرد موسڵمان بێت بـێ مـشتومڕ وەڵامی دایەوە و موسڵمان بوو، ڕێگای گرتە بەر بێ سڵ كردن، ئارامی گـرت لەسـەر ئەو ناخۆشیانەی بەسەریدا دەهات، ماڵی خۆی بەخشی بەبێ ترس.

كێ هاوڕێی پێغەمبەر بوو لـە گەنجایـەتی؟ كـێ بـوو یەكـەم كـەس لـە هـاوەڵانی پێغەمبەرﷺ كە ئیمانی هێنا؟ كێ بوو لـە (مجلس)دا كـە پێغەمبـەرﷺ پرسـیاری دەكـرد یەكـەم كـەس وەڵامـی دەدایـەوە؟ كـێ بـوو یەكـەم كـەس نوێـژی لەگـەڵ پێغەمبەرﷺ كرد؟ كێ بوو دواین نوێژی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بـوو؟ كـێ بـوو دوای مردنیش لە ناو گڵ لەگەڵیدا ڕاكشابوو؟ كەوابوو دراوسێی ڕاستەقینە بناسن.

(ابو بكر) ئەو پیاوە بوو كە بەرەنگاری هەڵگەڕاوەكان بۆوە لـە ڕۆژی (الـردة)دا، هەر كەسێك (ابـو بكـر)ی خـۆش بوێـت، بـە باسـكردنی فـەزڵی (ابـو بكـر) دڵخـۆش دەبێـت، كەسـێكیش ڕقـی لێ بێتـەوە كـە باسـی بكرێـت دڵ تـەنگ دەبێـت وەكـو شیعەكان كە بەوان بێت لەو كۆڕەی باسی (ابو بكر)ی لێ دەكرێت هـەڵێن، بـەڵام بـۆ كوێ دەڕۆن، كە باسی فەزڵی (ابو بكر)ی لێ نـەكرێت؟ (ابـو بكـر) بـە مـاڵ و نـەفس بەرگری لە پێغەمبەرﷺ دەكرد، (ابو بكر) لە ژیانیدا هەردەم لەگەڵ پێغەمبـەرﷺ دابووە، كاتێك كە مردیش هەر لە تەنیشت گۆڕی ئەودا نێژرا و لەگەڵ ئەو دابوو، بـە ڕاستی فەزڵ و گەورەیی (ابو بكر) گەلێك زۆرە.

بەڵام سەیر لەوە دایە! ئەو كەسەی كە چاوی بە خۆر هەڵنایەت دەیـەوێت بـەری خۆر بە بێژینگ بگرێت.

کاتێـك چـوونە نـاو ئەشـکەوتەکە (ابـو بکـر)ﷺ ترسـی لـیٚ نیـشتبوو نـەوەك پێغەمبـەرﷺ شـتێکی بەسـەرا بێـت، بۆیـە پێغەمبـەرﷺ پیٚـی دەفـەرموو: (چ گومانێك دەبەیت بە دوو کەس کە خوا سێ یەمیانە).

کە(ابو بکر) زانی ئەمە وەحیە دڵی ئارام بۆوە، بانگی سەر کەوتنیش لـە هـەموو شارێکا بڵاو بۆوە (ثاني اثنين اذهما في الغار).

سوێند بەخوا خۆشویستنی (ابو بکر)ﷺ شتێکی پاك و چاکە، ڕق لێبوونەوەشـی شـتێکی گەنـدەڵ و خراپـە، چـونکە (ابـو بکـر)ﷺ بـەڕێزترین و چـاکترین هـاوەڵی پێغەمبەری خوا بووە، بەڵگەش لەسەر ئەمە زۆرە.

سوێند بە خوا کە (ابو بکر)مان خۆش دەوێت لەبەر هەواو ئارەزووی خۆمان نیە، هاوەلانی تریش بەکەم نازانین، ئەوەی ئیمامی (علي) دەربـارەی فـەزڵی (ابـو بکـر) دەڵێت بەسمانە کە دەیفەرموو: (رَضيَك رسول الله لديننا، افلا نرضاك لدنيانا) واتـە: پێغەمبـەرﷺ ڕازی بـوو بـە کـاری دینـت بەسـەرمانا، ئایا ئێمـە چـۆن ڕازی نـابین بەکاری دنیات، مەبەستی ڕازیبوونە بە خەلیفاتیەکەی.

# چەند ئامۆژگاریەکی زێڕین

◉ خۆت بپارێزە لەو کەسەی کە دژایەتی ئەو کەسانە دەکەن پەیوەستن بە قورئان و سوونەتەوە، نەوەکو تۆش بە ئاگری ئەوان بسوتێی.

◉ ئاگاداری دوو دوژمن بە کە زۆرێك لە خەڵکی پێی بە هیلاك چوونە:

یەکەم: ئەو کەسەی خەڵکی دوور دەخاتەوە لە ڕێبازی خوا بە گومان و قسەی سەرقۆزی بن ئالۆز.

دووەم: ئەو کەسەش کە فریوی خواردوە بە دنیا و ناوبانگ دەسەڵاتەوە.

◉ هەموو هێزێکی مرۆڤ تام و چێژی خۆی لێ وەردەگیرێت، هێزی جووت بوون تام و چێژ لە جووت بوون وەردەگیرێت، هێزی تورەیی تام و چێژ لە بەکارهێنانی ئەو تورەییە وەردەگیرێت، هێزی خواردن و خواردنەوە تام و چێژ لە بەکارهێنانی ئەم دوانە وەردەگیرێت، هێزی زانست تام و چێژ لە وەرگرتنی زانست وەردەگیرێت، هێزی خۆشەویستی تام و چێژ لە خۆشەویستی خوا وەردەگیرێت، هێزی پەشیمانی تام و چێژ لە گەڕانەوە بۆ لای خوا وەردەگیرێت، هێزی هۆگری و ئیشتیاق تام و چێژ بە هۆگری لەگەڵ خوا و ئیشتیاق بۆ خوا وەردەگیردرێت، هەموو تام و چێژێك جگە لەمە بڕاوەیە.

◉ ئاگاداری (فراسة)ی مرۆڤی بە تەقوابە، چونکە ئەو مرۆڤە کارو کردەوەکانت لەو دیوی پەردەوە دەبینێت، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: ((اتقوا فراسة المؤمن، فانه ينظر بنور الله))[1]، واتە: خۆت بپارێزە لە (فراسه)ی بڕوادار، چونکە ئەو بە نوری خوا دەڕوانێت.

---

(١) رواه الترمذي (٣١٢٥) لە سەنەدەکەیدا (عطية العوفلي) هەیە کە بە (ضعيف) ناو دەبرێت.

◉ سبحان الله، نەفسی مرۆڤ (کبر)ی (إبلیس)ی تیایە، حەسوودی (قابیل)ی تیایە، سەرکەشی (عاد)ی تیایە، توغیانی (ثمود)ی تیایە، جورئەتی (نمرود)ی تیایە، خۆ بەگەورەزانی (فرعون)ی تیایە، فیز و لەخۆبایی (قارون)ی تیایە، فرتوفێڵی (اصحاب السبت)ی تیایە، سەرکەشی (الولید)ی کوڕی (المغیرة)ی تیایە، نەفامی (ابي جهل)ی تیایە، نەفسی مرۆڤ ڕەوشتی ئاژەڵی هەیە، سووربوونی قەڵەڕەشی هەیە، خراپەی سەگی هەیە، هەڵەشەی تاوسی هەیە، سوکی و کەمی خلێتکەی هەیە، سپلەی مارمێلکەی هەیە، ڕقی حوشتری هەیە، خۆماتکردنی پلنگی هەیە، پەلاماری شێری هەیە، دەرپەرینی مشکی هەیە، گەندەڵی ماری هەیە، ترۆهاتی مەیمونی هەیە، تەماعی مێرولەی هەیە، فرۆفێڵی ڕێوی هەیە، نهێنی و پەنهانی پەپوولەی هەیە، خەوی کەمتیاری هەیە.

کەچی ئەم ڕەوشتە قێزەوەنانە هەر هەمووی بە تەزکیە پاک دەبێتەوە و نامێنێت، بەڵام هەر کەسێك خۆی پاك نەکردەوە لەم ڕەوشتانە، ئەوە کەل و پەلەکەی شیاوی کڕین نیە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ﴾ (التوبة: ١١١) واتە: خوای گەورە نەفسی ئیمانداران کڕیوە. کەواتە خوای گەورە هیچ کردەوەیەك ناکڕێت، ئەگەر بە ئیمان پاك نەکرابێتەوە و وازی لەو کردەوە قێزەوەنانە نەهێنابێت و ڕووی نەکردبێتە شاری تەوبەکاران و خواناسان.

◉ کەل و پەلی فرۆشراو تەسلیمی خاوەنەکەی بکە نەوەك لە دەستت شتێکی لێ بێت، جا ئەوکات خاوەنەکەی وەری نەگرێت.

◉ قیمەتی کەل و پەل بە کڕیار و ئەو پارەی پێی دەکڕێت و ئەوەی بانگی بۆ دەکات دەردەکەوێت، ئەگەر کڕیارەکە گەورە و بەڕێز بوو، پارەکەشی بەقیمەت بوو، بانگکەرەکەش شکۆدار بوو، ئەوە دیارە کەل و پەلەکە زۆر بە نرخە.

◉ ئەی ئەو کەسەی خۆت بەلێزان دەزانیت، ئایا نەفسی خۆت ناسیوە؟دەزانی چەند بەڕێزی، بزانە ئەم بوونەوەرە هەر هەمووی بۆ تۆ فەراهەم هێندراوە.

◉ ئەی ئەو کەسەی کە خوای گەورە بە چاکە و بە سۆز پێی گەیاندووی، بزانە هەموو شتێك وەك درەخت وایە تۆش بەرەکەی، ئەو شتانە هەمووی وەك وێنە وان

تۆش واتاکانی بیت، ئەو شتانە هەمووی وەك پۆخڵەواتی گەوهەرات وایە تۆش گەوهەرەکەی بیت، ئەوشتانە هەمووی وەك دۆ وایە تۆش ئەو ڕۆنەی بیت کە لێی وەرگیراوە.

◉ ئەی مرۆڤ لە کوێ بوویت هانام بۆ ببە من لێت نزیکم وەڵامت دەدەمەوە، کەواتە بە خاتری کەسانێك هانا بۆ من مەبە، چونکە من لەو کەسەی بە خاتری ئەو هانام بۆ دێنی نزیك ترم.

◉ ئەگەر ڕێزی خۆت لای ئێمە بزانیبایە هەرگیز سوکت نەدەکرد بە گوناه و تاوان ئەی ـ بیرت نایەت ـ کە (ابلیس)مان لە ڕەحمەتی خۆمان دەرکرد لەبەر ئەوەی ڕێزی تۆی نەگرت و سوجدەی بۆ تۆ نەبرد، تۆش ئەوکات لە پشتی باوکت ئادەم بووی، زۆر سەیرە کەچی تۆ ئێستا لەگەڵ (ابلیس) بووی بە دۆست و پشتت لە ئێمە کردوە، والله سەیرە ! ئەگەر بێتوو خۆشەویستی ئێمە لە دڵتدا بایا ئەوە لەسەر جەستەت دەدرەوشایەوە.

◉ ئەگەر خۆشەویستیەکەت ڕاست بایە بۆ خوا، تێکەلی ئەو کەسانە نەدەبوویت کە باسی خۆشەویستەکەت بۆ ناکەن و بە بیرت ناهێننەوە ـ کە خوایە ـ سەیر لەو کەسانەدایە کە دەڵێن: خوامان خۆش دەوێت، کەچی خوایان لەبیر نیە پێویستیان بە خەڵکی ترە خوایان بیرخەنەوە، خوای بیر ناکەوێتەوە مەگەر کەسێك بۆی باس نەکات، چونکە نزمترین پلەی خۆشەویستی ئەوەیە کە خۆشەویستیەکەت لە یاد بێت.

◉ ئەگەر کەسێك بیەوێت بڕوات بۆ بینینی خۆشەویستەکەی سەربازەکانی لەگەڵیدا دەڕۆن، جا خۆشویستن لە پێشەوەی هەموو سەربازەکانەوەدا دەڕوات، ئومێدیش بەدەورەیدا دەسوڕێت، تامەزرۆی بینینیشی لێی دەخورێت، ترسیش کۆی دەکاتەوە لەسەر ڕێگادا، کاتێکیش گەیشتە دەرگای شار دڵدارەکە پێشی دەکەوێت بۆ بینینی خۆشەویستەکەی.

◉ تۆ سەگەکەت فێری ڕاو کردووە، ئەو سەگە وا فێرکراوە کاتێك نێچیرێکت بۆ ڕاو دەکات، ئارەزووی خۆی لێ دەگرێتەوە و هیچی لێ ناخوات، چونکە

نیعمەتەکانی تۆی لە پێش چاوە دەترسیٚ سزای بدەی، کەچی تۆ مامۆستای ئایینی پێت دەڵێت: ڕوو مەکە حەرام و واز لە ئارەزوات بێنە، بەڵام تۆ بە گوێی ناکەی.

◉ سەگی فێرنەکراو ئەگەر نێچیرێك ڕاو بکات بۆ خۆی ئەوە خواردنی نێـچیرەکە حەرامە، کەواتە کاری مرۆڤی نەفام کە بۆ ئارەزووی نەفسی خۆی دەیکات بەهـەمان شێوەیە.

◉ ئەی مـرۆڤ تـۆ عـەقلی مەلائیکـەتت هەیـە، ئـارەزووی ئاژەڵـت هەیـە، هـەوای شەیتانت هەیـە، جـا دەتـوانی بەسـەر ئـەم سیانە زاڵ بیـت: ئەگـەر بەسـەر هـەوا و ئارەزوواتدا زاڵ بوویت، ئەوە دەگەیتە پلەی مەلائیکەت، ئەگـەر هـەواو ئـارەزوو زاڵ بوو بەسەرتدا، ئەوە دەگەیتە پلەی سەگ.

◉ ئەگەر سـەگی فێرکـرا و نێـچیرێك ڕاو بکـات بـۆ خاوەنەکـەی ئـەوە خـواردنی نێچیرەکە حەڵاڵە، بەڵام ئەگەر نێچیرێك ڕاو بکات بۆ خۆی ئەوە خـواردنی نێـچیرەکە حەرامە.

# باسی بڕوادار و بێ بڕوا

خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَكَانَ ٱلْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِۦ ظَهِيرًا﴾(الفرقان: ٥٥)، واتــە: بەڕاستی مرۆڤی کافر بەردەوام دژ بەخوا دەوەستێت.

ئەمــە جــوانترین شــێوازی دەربڕینــە کــە قورئــان دەریــدەبڕێت و مانــای لێــك دەداتــەوە، بێگومــان ئیمانــدار بــەردەوام لەگــەڵ خــوای گەورەیــە و دژ بــە نــەفس و ئارەزوات و شەیتان و دووژمنانی پەروەردگاریدا دەوەستێت، ئەمە مانای ئەوەیە کە حزبی خوایە و سەرباز و دۆستی خوایە.

کە بە پاڵپشتی خوای گەورە دژایەتی دووژمنی دەرەوە و نـاخی خـۆی دەکـات و دەجـەنگێت، هــەر وەك چۆن ئەوانــەی دۆسـتی پادشـان پاڵپـشتی لـە پادشـاکەیان دەکەن و لە دژی دووژمنەکانی دەجەنگن.

بەڵام مرۆڤی کـافر بـە پاڵپـشتی شـەیتان و نەفـسی خـۆی دژایـەتی پـەروەردگار دەکـات، هــەر بۆیــەش دەبیــنین ووتــەی پێــشینانی چـاکمان لــەم بارەیــەوە زۆرە و پەنگی داوەتەوە (ابـن ابـي حـاتم) لـە (عطـاء)ی کـوری (دینـا) و (سـعید) ی کـوری (جبیر) دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: (وَكَانَ الْكَافِرِ عَلَى رَبِهِ ظَهِيراً) واتــە: بـە دۆسـتانی شەیتان دژایەتی خوا دەکات و هاوبەشی بۆ بڕیار دەدات.

(اللیــث)یــش لــە بــارەی تەفــسیری ئــەم ئایەتــەدا لــە (مجاهــد) دەگێڕێتــەوە دەفەرمووێ: واتە، شەیتان پاڵپشتی مرۆڤ دەکات لەسەر بێ فەرمانی خوا.

(زیـد)ی کـوری (اسـلم)یـش دەفـەرمووێ: (ظهـیرا) بـە واتـای (مواليــاً)نـە واتـە: شەیتان دووژمنانی خوا جۆش دەدات تاکو بێ فـەرمانی خـوا بکـەن و هاوبەشـی بـۆ بڕیار بدەن، پاڵپشتیان دەکات تاکو خوا لە خۆیان توورە بکەن.

مرۆڤی بـڕوادار بـۆ ئەنجامـدانی کـاری چـاك بـە پاڵپـشتی خـوا ئـەنجامی دەدات،

کەچـی مرۆڤـی کـافر و فـاجر کارەکـانی بـە پاڵپـشتی شـەیتان و ئـارەزرواتی خـۆی ئەنجامی دەدات، جـا بۆیـە سـەرەتای ئایەتەکـە بـەم شـێوە دەسـتی پـێ کـردووە: ﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُهُمۡ وَلَا يَضُرُّهُمۡۗ﴾(الفرقـان: ٥٥)، واتــە: کـافران لـە جیاتی خوای گەورە شتێك دەپەرستن نە سوودیان پێدەگەیەنێت نە زیان.

بێ بڕواکان بە پێـچەوانەی دۆسـتانی خـوا کـە خـوای گـەورە پاڵپـشتیان دەکـات لەسـەر دژایـەتی کردنـی شـەیتان و هـەواو ئـارەزووی خۆیـان، ئـەم مانـا جوانـە گەوهەرایەتی قورئان دەردەخات بۆ کەسێك تێی بگات خوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا﴾(الفرقـــان: ٧٣)، واتـە: ئەوانە کە بە ئایەت و فەرموودەکانی خوا بێدار دەکرێنەوە، هەر وا بەکـەڕی و کوێری و بەلاڵیدا تێناپەڕن، بەڵکو تێدەفکرن و لێی وورد دەبنـەوە ئینجـا پـەیڕەوی دەکەن.

(مقاتل) دەفـەرمووێ: کاتێـك بـە قورئـان ئامۆژگـاری دەکـرێن هـەروا بەکـەڕی و کوێری گوێی بۆ ناگرن کە هیچ نەبیستن و هیچ نەبینن، بەڵکو بە دڵەوە دەیبیستن و دەیبینن.

(ابن عباس) لە بارەی ئەم ئایەتەدا دەفەرمووێ: واتـە، هەروا بـە کـەڕ و کوێرانـە بەرانبـەر ئامۆژگاریـەکانی قورئـان ناوەسـتن، بـەڵکو بـەترس و لـەرزەوە بەرانبـەر ئامۆژگاریەکانی قورئان دەوەستن.

(الكلبي) دەفـەرمووێ: کاتێك گوێ بیستی ئامۆژگاریەکانی قورئان دەبن ملـی بـۆ کەچ دەکەن و چاو و گوێی بۆ دەکەنەوە.

(الفرّاء) دەفـەرمووێ: کاتێك قورئانیان بەسەردا دەخوێندرێتەوە لەسەر شـێوەی پێشوو دانانیشن کە تەواو گوێ بیـستی نـەبن، بـەڵکو بـە شـێوەیەك دادەنیـشن کـە گوێبیست بن.

(الزجاج) دەفـەرمووێ: واتـە: کە قورئانیان بەسەردا دەخوێنرێتەوەبەملکەچـی و گریانەوە کرنۆش دەبەن بۆ فەرمانەکانی خوا.

(ابن قتيبة) دەفـەرمووێ: واتـە: کە ئامۆژگاریەکانی قورئان دەبیستن بێ ئاگانین لێی وەکو کابرایەکی کەڕ و کوێر کە نەدەبیستێ و نەدەبینێ.

# گوناه و تاوان

بنچینەی هەموو گوناهێکی گەورە و گچکە پەیوەستە بەم سیانە:

١ ـ پەیوەست بوونی دڵ بە غەیری خوای گەورە.

٢ ـ بەگوێ کردنی هێزی تووڕەیی.

٣ ـ بەگوێ کردنی هێزی ئارەزووات.

ئـەم سـیانەش (شـیرك) و (سـتەم) و (بـێ ڕەوشـتی) دەگرێتـەوە، چـونکە دڵ پەیوەست بوون بە غەیری خـوای گـەورە ئـەوە شـیرکە، کـە دەکـات یـەکێکی تـری کردووە بە هاوبەشی خوا، گوێ ڕایەڵی کردنی هێزی تووڕەیش کوشتنی بە دوادادێت ئەمەشیان ستەمە، گـوێ ڕایـەڵی کردنـی هێـزی ئـارەزووش زینـای بـەدوادادێت کـە ئـەویش بـێ ڕەوشـتیە، جـا بۆیـە خـوای گـەورە لـەم ئایەتـەدا هەرسـێکی پێکـەوە کۆکردۆتـــەوە کـــە دەفـــەرمووێ:﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَ﴾(الفرقـان:٦٨)، واتـــە: ئەوانـــەی هـــیچ پەرستراوێکی تر جگە لە خوای گەورە ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشـتنی حەرام کردبێت مەگەر بە حەق و ڕەوا، هەروەها زیناش ناکەن.

بەڵـێ: ئەم سیانە پاڵپشتن بۆ یەکتری، وەك ئەوەی شیرك پاڵپشتیە بـۆ سـتەم و بێ ڕەوشتی، هـەر وەك چـۆن ئـیخلاص پاڵپـشتیە بـۆ یەکتاپەرسـتی و سـتەم و بـێ ڕەوشـتیش لـە مـرۆڤ دوور دەخاتـەوە، خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ﴾ (یوسف: ٢٤)، واتـە: بـە هـەمان شـێوە بۆیـە وامـان کـرد بـۆ ئـەوەی هەرچـی گونـاه و خراپەیـە لێـی دوور بخەینەوە بەڕاستی ئەوە لە بەندە پاکەکانی ئێمەیە.

بەهەمان شێوەش ستەم سەر دەكێشێت بۆ بێ ڕەوشتی، چونكە گەورەترین ستەم شەریك پەیا كردنە بۆ خوا، هەر وەك چۆن گەورەترین دادپەروەری یەكتاپەرستیە، دادپەروەری دۆستی یەكتاپەرستیە، ستەمیش دۆستی شیركە، هەر بۆیەش خوای گەورە ئەم دووانەی پێكەوە كۆ كردۆتەوە، بەڵگەی یەكەم كە گەورەترین دادپەروەری یەكتاپەرستیە ئەم ئایەتەیە: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُو۟لُوا۟ ٱلْعِلْمِ قَآئِمًۢا بِٱلْقِسْطِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾(ال عمران: ١٨)، واتە: خوا و مەلائیكەت و زانایانی بە ئینسافیش بە دادپەروەرانە شایەتیان داوە كە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە "ﷲ"

بەڵگەی دووەم كە گەورەترین ستەمیش شیركە ئەم ئایەتە: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾ (لقمان: ١٣)، واتە: بەڕاستی هاوبەش بڕیاردان بۆ خوا ستەمێكی زۆر گەورەیە.

هەروەها بێ ڕەوشتیش سەردەكێشێت بۆ شیرك و ستەم، بە تایبەت ئەگەر ئیرادەی بەهێز بوو، خوای گەورە لەم ئایەتەدا زینا و شیركی پێكەوە كۆ كردۆتەوە كە دەفەرمووێ: ﴿ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (النور: ٣)، واتە: پیاوی زیناكەر تەنها ئافرەتی زینا كەر یاخود موشریك مارە دەكات، ئافرەتی زیناكەریش تەنها پیاوی زیناكەر یاخود موشریك مارەی دەكات، ئەوە لەسەر ئیمانداران حەرامكراوە.

كەواتە: ئەم سیانە (شیرك) و (ستەم) و (بێ ڕەوشتی) هێندێكیان پاڵپشتن بۆ هێندێكیان، جا هەر كاتێك خواناسی لە دڵدا بێ هێز بوو و شیرك باڵادەست بوو، ئەوكات فاحیشە رووی تێدەكات خۆی تێ دەئاڵێنێ، هەر وەكو خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ

﴿يَغۡفِرُونَ﴾ (الشورى: ٣٦ـ٣٧)، واتـە: هەر شتێکتان پێبەخشراوە ئەوە زینەتی ژیانی ئەم دنیایەیە، بەڵام ئەو بەشەی کە لە لای خوایە چاکتر و بەردەوامترە بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، ئەوانەی خۆیان لە گوناهی گەورەو تاوانی خراپ و ناشیرین دەپارێزن، کاتێکیش کە تووڕە دەبن چاوپۆشی دەکەن.

لێرەدا خوای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو بەشەی کە لەلای خۆیدا هەیە، چاکتر و باشترە لەوەی لە دنیادا هەیە بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و پشتیان بە خوا بەستووە، ئا ئەمە یەکتاپەرستیە، پاشان کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ﴾ ئائەمەشیان خۆ پاراستنە لە هێزی ئارەزوو.

پاشان خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ ئا ئەمەشیان خۆپاراستن وبەگوێ نەکردنی هێزی تووڕەییە خوای گەورە خواناسی وداوێن پاکی و دادپەروەریشی پێکەوە کۆ کردۆتەوە کە خێر و چاکە هەمووی لەم سێیەدا کۆبۆتەوە.

# پشت هەڵکردن لە قورئان

واز هێنان لە قورئان و پشت تێکردنی چەند جۆری هەیە:

یەکەم: پشتی تێدەکا و گوێی بۆ ناگرێ و ئیمانی پێ ناهێنێت.

دووەم: پشتی تێدەکا و کاری پێ ناکا و گوێ ناداتە حەرام و حەلالی، ئەگەر چی خوێندبیشیەوە ئیمانی پێ هێنابێت.

سێیەم: پشتی تێدەکات و حوکمی پێ ناکات لە هەموو ڕوویەکەوە، بڕوای وایە کە ئەمە شتێکە تەنها وتەیە و باوەڕ پێ کراو نیە.

چوارەم: پشتی تێدەکات و لێی ووردنابێتەوە بزانێت خوا چی پێ مەبەستە.

پێنجەم: بۆ نەخۆشی دڵ و دەروون سوودی لێ نابینێت و پشتی تێدەکات، بەڵکو ڕوو دەکاتە غەیری قورئان و سوود لە قورئان وەرناگرێت. ئەمانە هەر هەمووی لەم ئایەتەدا دەردەکەوێت: ﴿وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا﴾ (الفرقان: ٣٠). واتە: پێغەمبەرﷺ سکاڵا دەکات و دەفەرمووێ: پەروەردگارا بەراستی قەومەکەم وازیان لەم قورئانە هێناو پشت گوێیان خست.

ئەوانە هەر هەمووی پشت کردنە لە قورئان، ئەگەر چی هێندێکیان لە هێندێکیان کەمتر.

# مرۆڤی دنیا ویست و مرۆڤی دنیا نەویست

مـرۆڤ کاتێـك ڕۆژ و شـەو دەکاتـەوە ئەگـەر مەبەسـتی تـەنها خـوا بێـت و دڵ و ئەندامەکانی پەیوەست بێت بەخوا، ئەوکات خوای گەورە هەموو پێویستیەکانی بۆ فەراهەم دێنێت، دڵێ پڕ دەکات لە خۆشەویستی خۆی، زمانی پاڵاو دەکات بە یادی خۆی، ئەندامەکانی ملکەچ دەکات بۆ بەندایەتی خۆی.

بەڵام ئەگەر ڕۆژ و شەوی کردوە مەبەستی تەنها دنیـا بـوو، ئـەوە خـوای گـەورە هەموو کارەکانی دەیسپێرێتە نەفسی خـودی مرۆڤەکـە خـۆی، ئـەوکات دڵ تـەنگ و غەمگین و پەژارە دەبێت، دڵی خەریك دەکات بە خۆشەویستی غـەیری خـوا، زمـانی تەنها ستایشی غەیری خـوا دەکـات، ئەندامـەکانی لـە خزمـەت غـەیری خـوا سـەرف دەکات، وەکو ئاژەڵ کە چۆن کارێك دەکات کە سوودی بۆ غـەیری خـۆی هەیـە، بـۆ نموونـە وەکـو (کـوورە) پەراسـووەکانی تێـك دەشـکێنێ بـۆ گـەرم کردنـی ئاگرەکـە کەچی هیچ سوودێکی لەم کارەیدا بۆ خۆی نیە، هەر کەسێکیش واز بێنێنت و پشت بکاتە بەندایەتی خوا و خۆشەویستی خوا، ئـەوە تووشـی پەرسـتنی دروسـت کـراوی خوا دەبێـت، خزمـەت و خۆشەویـستی بـۆ غـەیری خـوا دەردەبرێـت، خـوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴾ (الزخـرف: ٣٦). واتـە: هەر کەسێك لـە ئاسـتی شـوێنکەوتنی قورئـانی پـیرۆز دڵـی کوێربێـت و پشت بکاتە فەرمایشتەکانی خودا، ئەوە شەیتانێك دەکەینە هاودەمی، تا لەگەڵیـدا ببێتە برادەر و هاورێی.

(سفیان)ی کوری (عیینة)ە بە دۆسـتەکانی خـۆی فـەرمووی: هـەر پەنـدێکی بـاوی عەرەبی بێننەوە ئەوە من ئایەتێك دێنمەوکە پاڵ پشتی بکات.

پیاوێك پێی ووت: ئایە هیچ ئایەتێك هەیە لە قورئاندا پاڵپشتی ئەم پەندە بكات: (اعط اخاك تمرة فإن لم يقبل فأعطيه جمرة؟) واتــە: خورمایـەك بدە بـە دۆسـتـەكەت ئەگەر وەری نەگرت پشكۆیەكی ئاگری پێ بدە.

(سفيان)ی كوری (عيينة)ش فەرمووی: ئەم ئایەتە پاڵپشتی ئـەو پەنـەد دەكـات: ﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا ﴾ (الزخرف: ٣٦).

# بـاسی زانست و زانیاری

(العلـم) زانـست: واتــه گواسـتنەوەی وێنــەی شـتێکی زانـدرا و لــه دەرەوە بـۆ چەسپاندنی له ناخی خۆیدا.

(العمل) کارکردن: واته، گواستنەوەی وێنـەی شـته زانراوەکەیـه لـه ناخیـەوه بـۆ چەسپاندنی له دەرەوه لەسەر ئەندامەکانیدا.

جا هەر کاتێك ئەو زانستەی له ناخی خۆیدا دەیچەسپێنێت یەکی گرتەوه لەگـەڵ ئەوەی له دڵیدایه ئەوکات ئەوه زانستێکی تەواوه و به سوودە.

بەڵام زۆرێك له خەڵکی ئەو زانستەی وەری دەگـرن بـه هـیچ شـێوەیەك یـەك نیـه لەگـەڵ ناخیانـدا، کەچـی وا دەزانـن ئـەو شـتەی وەری گرتـووه زانـسته، بـەڵام لـه راستیدا وانیه، بەڵێ زۆرینەی زانستی خەڵکی بەم شێوەیە.

ئەو زانستەی لەدڵدایه، وه یەکیش دەگرێتەوه لەگەڵ دەرەوەیدا دوو جۆرە:

➢ جۆرێکیان به چەنگ کەوتنی مرۆڤ کامەران دەکات، ئەم جۆرەشیان ناسین و زانست بوونـه بـه خـوا و نـاو و سـیفات و کارەکـانی خـوا و کتێبـەکانی و فـەرمان و قەدەغەکراوەکانیەتی.

➢ جۆرەکەی تریان ئەگەر مرۆڤ نـەیزانێت زەرەری پـێ ناگـات، ئەوەشـیان ئـەو زانستەیه که نه بەنەزانینی زیانت پێدەگات، نه بەزانینیـشی سـوودت پـێ دەگـات، دەبینین پێغەمبەرﷺ هەموو کاتێك پەنای دەگرت به خوا له زانستێك کـه سـوودی پێ ناگەیـەنێت، ئەمـه زۆرێـك لـەو زانـستانه دەگرێتـەوه ئەگـەر نـەیزانی زیانـت پـێ ناگات، وەکو زانستی گەردوونناسی و زانستی زەویناسی و نموونەی ئەمانەش.

پله و پایه و بەنرخی زانست بەپێی زانراوەکه و ئاتاج بـوون پێـی دەردەکـەوێت، هیچ پله و پایەکیش نیه بگات به پله و پایەی زانست بوون بەخوا.

ئەو زانستەی کارەساتی لـە دوادایـە، ئـەو زانـستەیە کـە خـوا پێـی خـۆش نیـە، ئەمەشیان دوو جۆرە.

➢جاری وا هەیە زانستەکەی فەسادە، جـا فەسـادی زانستەکەی ئەوەیـە کـە وا دەزانێـت ئەنجامـدانی ئـەو کـارە خۆشەویـستە لای خـوا کەچـی واش نیـە، یـان وا دەزانیت ئەنجامدانی ئەو کارە لە خوای نزیك دەکاتەوە کەچی واش نیە.

➢جـاری واش هەیـە مەبەسـت و ئیرادەکـەی فەسـادە، فەسـادی مەبەسـت و ئیرادەکەشی ئەوەیە کارێك دەکات مەبەستی خوا و ئاخیرەت نیە، بەڵکو لەم کارەی مەبەستی دنیا و ڕەزامەندی خەڵکیە.

بەڵێ: ئەمە دوو کارەساتە کە لە کار و زانستدا هەیە، مرۆڤیش لێی ڕزگار نابێت مەگەر خۆی فێری ئـەو شـتانە نـەکات کـە پێغەمبـەرﷺ ئـەنجامی داوە و فـەرمانی پێداوە ئەمە لە بـەواری زانـستدا، لـە بـەواری کـارو کردەوەشـدا، دەبێـت مەبەسـتی خواو دواڕۆژ بێت. ئەگەر وای نەکرد ئەوکات کاروکردەوەکەی و زانـستەکەی فەسـاد دەبێت.

ئەوەش بزانن (الإیمان)و(الیقین) زانستی دروست بە مرۆڤ دەبەخـشن و مەبەسـتی دروست بە مرۆڤ دەبەخشن، ئا لێرەدا بۆمـان ڕوون دەبێتـەوە کـە زۆرینـەی خـەڵکی ئیمانێکی درووستیان نیە، چونکە زانستێکی دروست و مەبەستێکی دروستیان نیە.

مرۆڤیش ناگات بە ئیمانی ڕاست ودروست مەگەر لەڕێگای پێغەمبەرەوە نـەبێت و واز نەهێنێت لە هەوا و ئارەزواتی خـۆی، ئـەوکات دەکـات زانـستەکەی لـە دەلاقـەی سروشـی وەرگرتـووە، مەبەستیـشی خـوا و دوا ڕۆژ دەبێـت. ئـا ئەمـە زانـستێکی دروستە و کارێکی دروستە لە نێوان خەڵکیدا هەبێت، ئەوە کاری ئەو کەسانەیە کـە خوا هیدایەتی داون ئەوانەی کە بەڕاستی شوێنکەوتەی پێغەمبەرن ﷺ .

# جۆرەکانی ئیمان

**ئیمان دوو جۆری هەیە:**

١. ئیمـانی ڕواڵەتیـە، واتــە: ئیمانەکـەی لەسـەر زمـانی و لەسـەر ئەندامـەکانی بدرەوشێتەوە و کاری پێ بکات.

٢. ئیمانی ناو دڵە، واتـە: بـە دڵەوە ئیمانێکی پتەوی هـەبێت بـە خـوا و ملـی بۆ کەچ کات و خۆشی بوێت.

ئـەگینا کـاروکردەوە بەڕواڵـەت سـوودی پێناگەیـەنێت، ئەگـەر دڵـی ئیمـانی تیـا نەبێت، ئەگەرچی ئیمان هێنانی بە ڕواڵەتەکەی خوێن و مـاڵ و منـاڵی دەپارێزرێـت ـ بەڵام ئەو کارانەی بەڕواڵەت دەیکات ڕۆژی قیامەت سوودی پێ ناگەیەنێت ـ

بەهـــەمان شـــێوەش ئیمـــانی دڵ ســـوودی پێناگەیـــەنێت، ئەگـــەر هـــیچ کاروکردەوەیەکی لەگەڵدا نەبێت، مەگەر عوزری هـەبێت کـەبێ دەسـەڵات بێـت یـان زۆر لێکراو بێت یان لەترسی لەناوچوون کاروکردەوە نەکات.

کەواتـــە ـــ هەرکەسـێك بانگهێـشی ئیمـان بکـات ـــ لەگـەڵ ئەوەشـدا هـیچ کاروکردەوەیەکی موسڵمانانەش نەکات، هیچ بەربەست و عوزرێکیـشی نـەبێت ئـەوە ڕواڵەتی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دڵـی بـە فەسـاد چـووە و ئیمـانی تیانیـە، کـەمی کردەوەکانی بەڵگەیە لەسەر کەمی ئیمـانی، زۆری کردەوەکانیـشی بەڵگەیـە لەسـەر زۆری ئیمانی.

جا ئیمان کاکڵە و دڵی ئیسلامە، یەقینیش کاکڵـە و دڵـی ئیمانـە، هـەر زانـست و کردەوەیەکیش ئیمان و یەقینی پێ زیـاد نـەبێت ئـەوە عەیبـدارە، هـەر ئیمـانێکیش کردەوەی لەگەڵدا نەبێت عەیبدارە.

# تەوەکول و جۆرەکانی

تەوەکول لەسەر خودا کردن دوو جۆری هەیە:

یەکـەمیان: مـرۆڤ کـە تـەوەکول لەسـەر خـودا دەکـات بـۆ پڕکردنـەوەی ئاتاجیەکانیەتی لە دنیا، یان بۆ لێ لابردنی نەهامەتیەکانیەتی لە دنیا.

دووەمیان: تەوەکول لەسەر خودا دەکات بە مەبەستی بە دەست هێنانی ئەو شتانەیە کە خوا پێی خۆشە وەکو: لە ئیمان و یەقین و جیهاد و بانگەوازی بۆ خوا.

گـەورەترین جـۆری تـەوەکول کـردن لەسـەر خـوا تـەوەکولی هیدایـەت و یەکتاپەرستی و شوێنکەوتنی پێغەمبەر و جیهادە، کە ئەم جۆرەیان تەوەکولی پێغەمبەران و شوێنکەوتوانییانە.

تـەوەکول جاری وا هەیە دەبێتـە ناچاری، ئـەویش کاتێك مـرۆڤ هیچی چـەنگ ناکەوێت تەنها تەوەکول نەبێت لەسەر خوا، هەر وەك ئەوەی دەبینین مرۆڤێك هـیچ لە دەسەڵاتی نایەت لەو کارەی بۆی پـێش هـاتووە، دەبینیت هـیچ مۆڵگەیـەك نیـە جگە خوا نەبێت، بۆیە ئەوکات بە ناچاری تەوەکول لەسەر خوا دەکات.

جاری واش هەیە تەوەکول بە هەڵبژاردنی خوی مرۆڤەکە خۆیەتی، ئەمەشیان لـە کاتێکدا دەبێت کە دەبینیت هۆکارێك هەیـە بـۆ ڕاپەڕانـدنی کارەکـەی، جـا ئـەوکات ئەگەر هاتوو هۆکارەکەی هەیە شەرعی بوو خوا ڕێگای دابوو ئـەنجام بـدرێت، ئـەوە وازلێهێنانی لۆمەکراوە و باش نیە، بەڵام ئەگـەر هـاتوو تـەنها پـشتی بـە هۆکارەکـە بەست و پشتی لە تـەوەکول کـرد ئەمـەش لۆمـەکراوە بـاش نیـە، بـەڵکو وا چـاکە و واجبە هۆکارەکە ئەنجام بدات و تەوەکولیشی لەسەر خوا بێت.

بەڵام ئەگەر هاتوو ئەنجام دانی هۆکارەکـە حـەرام بـوو، ئـەوە واز لـە هۆکارەکـە دەهێنێت و پشت بە تەوەکولەکە دەبەستێ، چونکە تـەوەکول گـەورەترین هۆکـارە بۆ گەیشتن بە ئامانج و لابردنی نەهامەتیەکان، بەڵکو بەهێزترین هۆکارەیشە، ئەگەر

هۆکارەکە (مباح) بوو، ئەوە تێی دەڕوانی بزانـی ئایا ئـەو تەوەکولـەی لەسـەر خـوا هەتـە بـێ هێـزی دەکـات یـان نـا؟ جـا ئەگـەر بـێ هێـزی دەکـرد، ئـەوە وازهێنـانی چاکتـرە، بـەڵام ئەگـەر بـێ هێـزی نـەدەکرد دەسـت پێوەگرتنی چاکتـرە، چـونکە حیکمـەتی خـوای گـەورە وا دەخوازێـت، ناکرێـت وا نـەکرێت، بـە تایبـەت لـە بەندایەتییـدا، ئـەوکات دەکـات بەندایـەتی دڵـت بـە (توکـل) کـردووە، بەندایـەتی ئەندامەکانیش بە هۆکار ئەنجام داوە.

ئەوەی تەوەکول پتەو دەکات دەستگرتنە بەو هۆکارانـەی فـەرمانیان پێکراوە، هەرکەسێك بەم شێوە نەکات ئەوە تەوەکولەکەی دروست نابێت، هـەر وەکـو چـۆن دەست گرتن بە هۆکارەوە بۆ ئامانج ئەوە (رجـاء) بـۆ مـرۆڤ فەراهـەم دێنێت، هـەر کەسێك وانەکات ئەوە (رجاء)ەکـەی تەمەننایـە، هەرکەسێك دەسـت بـە هۆکـارەوە نەگرێت، دەکات تەوەکولی بێ دەسەڵاتیە، بێ دەسەڵاتیەکەشی تەوەکولە.

نهێنی و راستەقینەی تەوەکول پشت پـێ بەسـتنی دڵـە تـەنها بـە خـوا، دەسـت گرتن بە هۆکاریش زیانی پێ ناگەیەنێت ئەگـەر دڵـی پێوە نەبەسـتێتەوە و پـشت و پەنای تەنها ئەوبێت، هەر وەکو ئەو سـوودی پێناگەیـەنێت کـە بڵێـت: (توکلـت علـی الله) واتـە: (توکـل)م لەسـەر خـوا کـردووە. لەگـەڵ ئەوەشـدا پـشت و پـەنا و بـڕوای بەکەسێکی تر بێت، چونکە (توکل) بـە زمـان شـتێکە و (توکـل) بـە دڵـیش شـتێکی ترە، هەر وەکو تەوبەکردن بە زمان لەگەڵ سووربوونیشی لەسەر گوناه شـتێکە، وە تەوبە کردن بە دڵ و بەزمان نەگووتنی شتێکی ترە.

بەنـدە کـە دەڵێـت: (توکلـت علـی الله) واتـە: (توکـل)م لەسـەر خوایـە، لەگـەڵ ئەوەشدا بە دڵەوە پشتیوانی بە غەیری خوا بێت، وەکو ئەوە وایە کـە بڵێـت: (تبـت الی الله) واتـە: تەوبـەم کـردووە بـۆ خـوا، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا سـووربێت لەسـەر گوناه و تاوان.

# سكاڵای خواناس و سكاڵای نەفام

مرۆڤی نەفام و نەزان ئەوەیە كە گلەیی لە خوا دەكات لای خەڵكی، ئەوە ئەوپەڕی نەفامیە بەرانبەر بە خوای گەورە، چونكە ئەگەر پەروەردگاری خۆی بناسیبایە ئەوكات هەرگیز گلەیی لیٚ نەدەكرد، ئەگەر خەڵكیشی بناسیبایە ئەوە هەرگیز گلەیی لا نەدەكردن.

هێندیٚ لە زانایانی (السلف) پیاوێكیان بینی گلەیی لە لای پیاوێك دەكرد لە دەست هەژاری و ئاتاجی دنیا، جا پێیان گووت: كابرا سوێند بەخوا ئەو گلەییەی تۆ هیچ سوودی نیە، تۆ چۆن گلەیی لە كەسێك دەكەی كە ڕەحمت پێدەكات لە لای كەسێك كە ڕەحمت پیٚ ناكات.

مرۆڤی خواناس گلەیی خۆی تەنها لای خوای گەورە دەكات، بەڵیٚ ئەگەر مرۆڤ زۆر خواناس بێت گلەیی لای خوای گەورە دەكات لە نەفسی خۆی نەك لەلای خەڵكی، بەڵكو ئەو گلەیی لەكارە قیزەونەكانی خەڵكی و خۆیەتی، چونكە ئەو سەیری ئەو ئایەتە دەكات كە دەفەرمویٚ: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ﴾ (الشوری:٣٠)، واتە: هەر بەلاو نەهامەتیەكتان بەسەر هاتبێت، ئەوە دەرەنجامی ئەو كارو كردەوانەیە كە بە ئارەزووی خۆتان ئەنجامتان داوە.

هەروەها دەفەرمویٚ: ﴿وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَ﴾ (النساء:٧٩). واتە: هەرچی ناخۆشیەكت بۆ پێش دێت ئەوە دەستی خۆتی تێدایە.

لەئایەتێكی تر دەفەرمویٚ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ﴾ (ال عمران: ١٦٥). واتە: ئایا كاتێك بەلاو ناخۆشیەكتان تووش هات دەڵێن: ئەمە چی بوو؟ بۆ وات بەسەر هات؟ لە كوێوە

ئەمەمان بۆ هات؟ ئەی بۆ لـە یادتـان چـوو لـە جـەنگی بـەدردا بەڕاسـتی ئێـوە دوو ئەوەندەتان بەوان کرد ئینجا پێیـان بلّـێ: ئـەم بەڵایـە لەلایـەن خۆتانـەوە توشـتان هات.

جا گلەیی کردن پلەی هەیە:

یەکەم: خراپترینیان ئەوەیە گلەیی لە خوا بکەی لە لای خەڵکی.

دووەم: بەرزترین و باشترینیان ئەوەیە گلـەیی لـە نەفسی خـۆت بکـەی لـە لای خوا.

سێیەم: مام ناوەندیەکەشی ئەوەیە گلەیی لە خراپەی خەڵکی بکەی لە لای خوا.

# ژیان لە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەردایە

خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْۖ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾ (الانفال: ٢٤)، واتـە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەدەم بانگەوازی خوا و پێغەمبەرەوە بچن کاتێك بانگتان دەکەن بۆ ئەوشتەی دەتانژێنێتەوە، چاك بزانن بەڕاستی خوای گەورە دەبێتە لەمپەر لە نێوان مرۆڤ و دڵی، بێگومان هەر بۆ لای ئەویش کۆدەکرێنەوە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە چەند شتی لە خۆگرتووە:

یەکەم: ژیانی ئاسوودەی و کامەرانی بە وەڵامدانەوەی خواو پێغەمبەرﷺ چـنگ دەکـەوێت، هـەر کەسـێك وەڵامــی بانگــەوازی خــواو پێغەمبــەرﷺ نەداتــەوە و گوێڕایەڵیان نەکات مردووە و ژیانی چنگ نەکەوتووە، ئەگـەر چـی ژیـانی ئاژەڵیـشی هەبێت، کە ئەم ژیانە ئاژەڵیە نزمترین ئاژەڵ لەگەڵ ئەودا تیایدا بەشدارە.

جا ژیانی ڕاستەقینە و کامەران ئەوەیە کە بە دڵ و لاشە وەڵامی بانگەوازی خواو پێغەمبەرﷺ بداتەوە، ئا ئەمانە ژیانیان لەبەردایە ئەگەر چی بە لاشە مردووش بن، جگە لەوانە مردوون ئەگەرچی بە لاشەش زیندووبن.

کەواتـە ئـەو کەسـە ژیـانێکی کامـل و ئاسـوودەی هەیـە کـە بەتـەواوی وەڵامـی بانگەوازی پێغەمبەرﷺ دەداتەوە، چونکە هەر شتێك خـواو پێغەمبـەر خـەڵکی بـۆ بـانگ بکـەن ئـەوە ژیـانی پێـوە بەنـدە، هـەر کەسـێك بەشـێکی لێ بفـەوتێ دەکـات بەشێکی ژیانی لێ فەوتاوە، بە ئەنـدازەی وەڵامدانـەوەی بانگـەوازی پێغەمبـەر مـرۆڤ ژیانی کامەران دەبێت.

(مجاهد) دەفەرموێ: (لما یحییکم) واتـە: خواو پێغەمبەرﷺ بانگتان دەکەن بۆ ئەو شتانەی حەق و ژیانی ئێوەی تیایە.

(قتادة) دەفەرموێ: (لما یحییکم) واتە: وەرن بەرەو پیلی ئـەم قورئانـە چـونکە ژیان و بەختەوەری تیایە، ڕزگاربوونی دنیا و قیامەتی تیایە.

(السدي) دەفـەرمووێ: واتـە: ئـا ئـەم ئیـسلامە ژیانتـان پـێ دەبەخـشێت دوای ئەوەی کە کافر بوون وەك مردوو وا بوون.

(ابـن اسـحاق) دەفـەرمووێ: (لمـایحییکم) واتـە: وەڵامـی خـواو پێغەمبـەرﷺ بدەنەوە کە بانگتان دەکەن بۆ جەنگ لە کاتێکدا خوای گەورە سەربەرزی کردن بەم جەنگە دوای ئەوەی کە ئێوە زەلیل بوون، وە بە هێزی کردن کە بێ هێزبـوون، بـەم جەنگە ئێوەی پاراست لە دووژمن.

ووتـەی ئـەم زانایانـە لـە ڕاسـتیدا هـەمووی یـەك دەگرێتـەوە ئـەویش ئەوەیـە گوێڕایـەڵی و جـێ بـەجێ کردنـی ئـەو پەیامەیـە بـە دڵ و لاشـە کـە پێغەمبـەرﷺ هێناویەتی.

(الواحـدي) دەفـەرمووێ: زۆرینـەی زانایـان لەسـەر ئـەوەن کـە مانـای (لما یحییکم)جیهادە، ئەمەشـیان ووتەکـەی (ابـن اسـحاق)ە، کـە زۆرێـك لـە زانایـان ئـەم ڕایەیان هەڵبژاردووە، (الفراء) دەفەرمووێ: هەر کاتێك خوای گەورە بانگی کردن بۆ ژیان ئەوە فەرمانتان پێدەکات بە جیهاد کە بجەنگن لە دژی دووژمنانتان، دەیەوێت بەم جیهادە بەهێزتان بکات، بەڵام ئەگەر وازیان لە جیهاد هێنا ئەوە بێ هێز دەبن و دووژمن بەسەریاندا زاڵ دەبێت و تێکیان دەشکێنێت.

(ابن قیم) دەفەرمووێ: منیش دەڵێم: جیهاد پلەیەکی زۆر بـەرزە ژیـان بـە مـرۆڤ دەبەخشێت لە دنیا و بەرزەخ و دواڕۆژدا.

دەبینین لە دنیا ژیان بە مرۆڤ دەبەخشێ، چونکە باڵا دەستی و سەرکەوتنیان بە جیهـادە، لـە بـەرزەخیش ژیـان بـە مـرۆڤ دەبەخـشێ هـەر وەك خـوای گـەورە لـەم بارەیـــەوە دەفـــەرمووێ: ﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ

رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ﴾ (ال عمـران:١٦٩). واتـــە: وا نـــەزانن ئەوانـــەی لـــە پێنـــاوی خـــوا شـــەهیدبوون و کـــوژراون، مـــردوون، نـــەخێر وانیـــە، بـــەڵکو ئەوانـــە زینـــدوون، لای پەروەردگاریان لە ڕزق و ڕۆزی تایبەت بەهرەوەرن.

لـە دوا ڕۆژیـش ژیـان بـە مـرۆڤ دەبەخـشێ، ئەوەیـە کـە بەشـی جـەنگاوەر و شەهیدەکان لە خۆشی و بەخششی خوا لە بە هەشت لە هەموو کەسێك زیاترە.

جا بۆیە (ابن قتیبة) دەیفەرموو: مانای (لما یحییکم) واتە: گەیشتن بـە کـاروانی شەهیدانە.

هێندێ لە زانایانی تەفسیریش فەرموویانە: (لما یحییکم) واتـە: بەهەشت، چونکە بەهەشت ژیانێکی کامەرانی و ئاسوودەی بەردەوامە.

جا ئەم ئایەتە ئەو تەفـسیرانە هـەمووی دەگرێتـەوە، چـونکە ئیمـان و ئیـسلام و قورئان و جیهاد، بەختەوەری و ژیانی دڵی پێوەبەندە.

بە هـەمان شـێوەش ژیـانی کامـڵ و نـەبڕاوە و ئاسـوودە تـەنها لـە بەهەشـتدایە، پێغەمبەریشﷺ خەڵکی بانگ دەکات بۆ ئیمان و بەهەشـت، کەواتـە پێغەمبـەرﷺ خەڵکی بانگ دەکات بۆ ژیانی ئاسوودە لە دنیـا و دواڕۆژدا، مـرۆڤیش پێویـستی بـە هەردوو جۆرە ژیانە کە هەیە:

ژیـانی جەستەیی کە بەم ژیانە شتی بـە سـوود و بـێ سـوود جیادەکاتـەوە، ئـەو شتانە هەڵدەبژێرێ کە سوودی پـێ دەگەیەنێت.

ئەگەر ژیانی جەستەی تـەواو نـەبێت، ئـەوە بـە گـوێرەی ناتەواویەکـەی تووشـی ئێش و ئازار و بێ هێزی دەبێت،بۆیەژیانی مرۆڤی نەخۆش و خەفەت بارو غـەمگین و ترسنۆك و هەژار وەکو ژیانی مرۆڤی دروست نیە.

ژیـانی دڵـیش کـە بـەم ژیانـە ڕاسـت و ناڕاسـت و چـاك و خـراپ و هیدایـەت و سەرگەردانی لێك جیادەکاتەوە، بەڵام بەم ژیانە حەق هەڵدەبژێرێت بەسەر ناحەق.

هەر بەم ژیانە ڕۆحیە مـرۆڤ دەتوانێـت زانـست و کـاروکردەوەی بـە سـوود و بـێ سـوود لێـك جیابکاتـەوە، هـەر ئـەم ژیانـەش وا لـە مـرۆڤ دەکـات هێـزی ئیمـان و خۆشەویستی بۆ حەق پێدەبەخشێ، ڕق لێبوونەوەی بۆ ناحەقی پێدەبەخشێ.

مرۆڤ ئەگەر ژیانی رۆحی نەبوو ئەوا ناتوانێت شتی بەسوود و بیٚ سوود لە یەك جیا بكاتەوە، ئەگەر چی هێزی جیاكردنەوەشی هەبێت هەر ناتوانێت شتی بەسوود بەسەر شتی بیٚ سوود هەڵبژێرێت.

هەر وەك چۆن مرۆڤ جەستەی ژیانی لەبەردانیە تاوەكو مەلائیكەت بە فەرمانی خوای گەورە ژیانی بەبەردا نەكات، كە ئەو مەلائیكەتە نێردراوی خوایە تاكو رۆحی بەبەردا بكات، جا بەم رۆحە جەستەی مرۆڤەكە زیندو دەبێت، ئەگینا پێشتر لەگەڵ مردوواندا دەژمێردرا، بەهەمان شێوەش دڵ مردووە و ژیانی لەبەردا نیە تاكو پێغەمبەرﷺ ئەو رۆحەی لەبەردا نەكات كە لەلایەتی، خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ﴾ (النحل: ٢)، واتە: خوای گەورە بە مەلائیكەت ژیانەوە كە قورئان دەنێرێت بۆ هەركەسێك بیەوێت لە بەندەكانی.

خوای گەورە دەفەرمووێ : ﴿يُلْقِى ٱلرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ﴾ (غافر: ١٥)، واتە: خوای گەورە ژیان بە فەرمانی خۆی دەنێرێت بۆ هەر كام لە بەندەكانی كە بیەوێت.

لە ئایەتێكی تر دەفەرمووێ : ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ﴾ (الشورى: ٥٢). واتە: بەهەمان شێوەش ئێمە قورئانمان بۆ ڕەوانە كردیت لە لایەن خۆمانەوە، كە ژیان بەخشە بە دڵ و دەروون، لە كاتێكدا كە تۆ نەتدەزانی قورئان چیەو ئیمان چیە، بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان كردە رووناكی و نورێك كە رێنموونی هەركەسێكی پیٚ دەكەین كە بمانەوێت لە بەندەكانمان.

خوای گەورە لێرەدا ڕوونی دەكاتەوە وەحی كە قورئانە رۆح و نوور و ژیانەوەی دڵـی پێوە بەندە، وە ژیانی جەستەش لەلایەن مەلائیكەتی فەرمان پێكراو دەبەخشرێت، كەواتە هەر كەسێك ڕۆحی جەستەی بەبەردا كرابێت لەلایەن مەلائیكەتەوە، ڕۆحی دڵیشی روحی بە بەردا كرابێت لەلایەن پێغەمبەرەوە كە قورئانە، دەكات لە هەردوو ژیان سەرفرازە و هەردوو ژیانەكەی چنگ كەوتووە.

هەر کەسێکیش مەلائیکەت جەستەی ڕۆحی بەبەردا کرد، بـەڵام ڕۆحـی قورئـانی وەرنەگرتبوو، دەکات یەك جۆرە ژیانی هەیە و ژیـانێکی لـە دەسـت داوە کـە ژیـانی ڕاستەقینەیە خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا﴾ (الانعـــــام: ١٢٢).
واتـە: ئایا ئەو کەسەی کە مردووە بە هۆی بێ باوەڕیەوە، ئینجا بە هـۆی ئیمانـەوە زیندوومان کردەوە و نوور و ڕووناکیمان بۆ ساز کرد لە ژیانیـدا کـە قورئانـە لـە نـاو خەڵکیشدا پێـی دەڕوات و هەڵسوکەوت دەکـات، وەکـو ئـەو کەسـە وایـە کـە لـەناو تاریکیەکاندا گیری خواردووە و لێی دەرناچێت؟!
خوای گەورە لەم ئایەتەدا نـوور و ژیـانی پێکـەوە کۆکردۆتـەوە بـۆ ئـەو کەسـەی ئیمانی هێناوە، بۆ ئەو کەسەش کە پشتی کردووە لە دیـنی خـوا مـردن و تاریکـایی پێکەوە کۆکردۆتەوە.

(ابن عباس) و هەموو زانایانی تەفسیر لە بارەی ئەم ئایەتـەدا ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ﴾ فەرموویانە، واتـە: مرۆڤی کافر گومڕابووە، ئێمە هیدایەتماندا.

کـە دەفـــەرمووێ : ﴿وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ﴾چـەند شـتی لـە خـۆ گرتووە:

یەکەم: ئەو کەسە کە ئیمانداره نـوور و ڕۆناکیـەکی پێیـە پێـی دەڕوات، کەچـی ئەوانەی سەرلێشێواون لە ناو تاریکیدان، جا نموونـەی ئـەو مرۆڤـە ئیمانـدارە و ئـەو سەرلێشێواوانە وەك نموونەی کۆمەڵە خەڵکێك وایە کە لە شوێنێکی تاریکدا شـەویان بەسەر داهاتووە و ڕێگایان لێ وون بووە بۆیە ڕاوەستاون.

دووەم: ئـەو کابرایـە بـە نـوور و ڕووناکیـەوە بەناویانـدا دەڕوات ئـەوانیش بـۆ پێویستی خۆیان نووری لێ وەردەگرن.

سێیەم: ئـەو کابرایـەی خـاوەن نـوورە ڕۆژی قیامـەت بەسـەر پـردی (صراط)دا دەڕوات نووری خۆی بەدەستەوەیە لە کاتێکدا موشریك و منافیقـەکان نووریـان لـێ کوژاوەتەوە.

لە سەرەتای باسەکەمان کە باسمان کرد خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ﴾ (الانفال: ٢٤). ئەو ڕایـەی مەشـهورە لـە بـارەی ئەم ئایەتەوە ئەوەیە خوای گەورە دەبێتە لەمپەر لە نێوان بڕوا و کـوفر، لـە نێـوان کافر و ئیماندار، لە نێوان ئەوانەی گوێڕایەڵی خـوا دەکـەن و لـە نێـوان ئەوانـەی بـێ فەرمانی خوا دەکەن، ئەمە ووتەی (ابن عباس) و جمهوری زانایانی تەفسیرە.

تەفسیرێکی تریش هەیە بۆ ئەم ئایەتە ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە نزیکە لـە دڵی بەندەکانی هیچ شتێکی لێ شاراوە نیە.

(الواحدي) لە (قتادة)ە دەگێڕێتـەوە دەفـەرمووێ: ئەمـە گونجـاوە بـۆ تەفـسیری ئەم ئایەتە، چونکە وەڵامدانەوە لە دڵدا هەڵدەقوڵێت، کەواتە وەڵامدانەوە ئەگەر بە دڵ نەبێت جەستە هیچ سوودی نیە، چونکە خوای گەورە بە ئاگایـە بـەوەی لـە نـاو دڵی مرۆڤدا چی هەیە دەزانێت وەڵامی داوەتەوە یان نا.

جا ووتەی یەکەم وا دەردەخات ئەگەر کەمتـەر خـەمیتان کـرد لـە وەڵامدانـەوەی خواو پێغەمبەرﷺ، ئەوکات خوای گەورە دەبێتـە لەمپـەر لـە نێـوان مـرۆڤ و دڵیـدا، بۆیە مرۆڤەکە ناتوانێت بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبـەرەوە بـچێت ئەمـەش وەکـو سزایەك وایە بۆ مرۆڤەکە، چونکە حەقیان بۆ ڕۆشن بۆوە بەڵام وەڵامیان نەداوە.

خـوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾ (الانعام: ١١٠)، واتـە: ئێمە دڵ و چاوەکانیان هەڵدەگێڕینەوە، هـەر وەك چـۆن یەکەمجار لە سەرەتاوە باوڕیان نەهێنابوو.

هەروەها دەفـەرمووێ: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ﴾ (الصف: ٥)، واتـە: کاتێك ئەوان گوێیان بۆ ڕاستی نەگرت و لە حەق لایانـدا، خـوای گـەورەش دڵـەکانیانی لـە خشتە برد و مۆری پێدانا.

لەئایـەتێکی تـر دەفـــەرمووێ: ﴿فَمَا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ مِن قَبْلُ﴾ (الأعراف:١٠١)، واتـە: چۆن لە پێشدا بڕوایـان بـە خـوا نـەبوو، هـەر واش بـێ بـاوەڕ مانەوە.

لە ئایەتەکـەدا مـرۆڤ ئاگـادار دەکاتـەوە کـە بـە دڵ وەڵامـی خـواو پێغەمبـەرﷺ بدەنەوە، ئەگەر چی بە جەستە وەڵامیان دانەوە، بەڵام با دڵیشی لەگەڵدابێت.

نهێنیەکی تریش لە ئایەتەکەدا هەیە ئـەویش ئەوەیـە کـە خـوای گـەورە شـەرعی ناردووە فەرمانیشی بە مرۆڤ کردووە کاری پـێ بکـات، بەهـەمان شـێوەش قـەدەر و ئیمان هێنان بە قەدەری پێکەوە کۆ کردۆتـەوە خـوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ (التكـوير: ٢٨ ـ ٢٩). واتـە: ئەم قورئانە یادخەرەوەیە، بەڵام بۆ ئەوانەتان کە دەیانەوێت ڕێبـازی ڕاسـت و دروسـت بگرنـە بـەر، ویـستی ئێـوەش نایەتـەدی مەگـەر کاتێـك خـوای پەروەردگاری جیهانیان بیەوێت.

دەفـــــــــــــەرمووێ: ﴿فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿٥٥﴾ وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ (المدثر:٥٥ـ٥٦)، واتـە: ئەم قورئانـە ئامۆژگاریـە، ئـەوەی بیـەوێت بـا یـادی بکـات و شوێنی بکەوێت، ئەو خەڵکەش یادەوەری وەرناگرێت و بیر لـەم ڕاسـتیانە ناکاتـەوە مەگەر ویستی خوای لەسەر نەبێت.

# تۆ نازانی خێر لە چی دایە

خــوای گــەورە دەفــــەرمووێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ (البقرة: ٢١٦)، واتـە: جـەنگ لەسـەرتان بڕیاردراوە کـە شـتێکی گرانـە لاتـان، بـەڵام لەوانەیـە شـتێکتان لا نـاخۆش بێـت کەچـی خێـری تیـا بێـت بۆتـان، هەروەها لەوانەشە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەری تیا بێت بۆتـان، بێگومـان خوای گەورە دەزانێت خێر لە چی دایە، ئێوە نایزانن.

لــە ئایـــەتێکی تــر دەفـــەرمووێ : ﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ (النسـاء:١٩). واتـــە: ئەگــەر خۆشـتان نەویـست و لێیان بێزار بوون، ئەوە دوور نیە و دەشێت حەزتان لە شـتێك نـەبێت و خـوا بیکـات بە مایەی خێر و بێری زۆر و بێ سنوور بۆتان.

ئایەتی یەکەم باسی جیهـاد دەکـات کـە هێـزی تـوڕەیی لـە خۆگرتـووە، ئایـەتی دووەمیش باسی ژن خواستن دەکات کە هێزی ئارەزووی لە خۆ گرتـووە، مـرۆڤ بـەم هێزە توورەییەی کە هەیەتی لەلای گرانـە بـەرەنگاری دووژمـن ببێتـەوە لـە نەفـسی خۆی دەترسێ، بەڵام ئەوەی کە لەسەر نەفسی گرانە خێری دنیـا و قیامـەتی ئـەوی تیایە، حەزیش دەکات بەرەنگاری دووژمن نەبێتەوە ئەمەش شەری دنیا و قیامـەتی ئەوی تیایە، بەهەمان شێوەش حەز ناکات ئافرەتێك بخوازێت لەبەر هێندێ ڕەوشـت کە پێی خۆش نیە، بەڵام ئەو ڕەوشتانە خێری بۆ ئەو تیایـە کەچـی ئـەو بـەم خێـرو بێرە نازانێت، حەز دەکات ئافرەتێك بخوازێت لەبەر هێندێ ڕەوشت کە پێـی خۆشـە ئەو ڕەوشتانەی هەیە، بەڵام ئەو ڕەوشـتانە شـەڕی بـۆ ئـەو تیایـە کەچـی ئـەو بـەم شەڕە نازانێت.

مرۆڤ هەر وەك خوای گەورە وەسفی کردووە ستەمکار و نەفامە، مرۆڤ بە هەڵە دادەچێت ئەگەر وا لێکبداتەوە کە شتێکی پێ خۆش بێت ئەو شتە بۆ ئەو بە سوودە، شتێکیشی پێ ناخۆش بێت وابزانێت ئەو شتە بۆ ئەو بێ سوودە، بەڵکو ئەو شتە بۆ مرۆڤ بە سوودە کە خوا فەرمانی پێکردووە، ئەو شتەش بێ سوودە کە خوا قەدەغەی کردووە.

چاکترین شت بۆ مرۆڤ کە سوودی تێدابێت گوێڕایەڵی پەروەردگاریەتی بە دڵ و لاشە، وەخراپترین شتیش بۆ مرۆڤ بێ سوودبێت بێ فەرمانی پەروەردگاریەتی، ئەگەر مرۆڤ بەدڵێکی سافەوە گوێڕایەڵی خوا بکات، ئەوە هەر شتێکی بەسەر بێت کە پێی ناخۆش بێت خێری بۆ ئەو تیایە، بەڵام ئەگەر گوێڕایەڵی و بەندایەتی خوا نەکات، ئەوا هەر شتێکی پێ ناخۆش بێت شەری بۆ ئەو تیایە، هەر کەسێك بە چاکی پەروەردگاری بناسێت ناو و سیفاتەکانی بناسێت، دڵنیا دەبێت کە ئەو ناخۆشیانەی کە بەسەریدا دێت خێرو قازانجی پێوەیە بەڵام ئەو پێی نازانێت، بەڵکو خێر زیاتر لەوەدایە کە مرۆڤ پێی ناخۆشە نەك لەوەی پێی خۆشە، چونکە هەموو خێرو چاکەیەك لە و شتانە دایە کە لەلای گرانە، هەر وەك چۆن هەموو زەرەر و هیلاکی مرۆڤ لەو شتانە دایە کە لەلای خۆشەویستە.

بۆ نموونە: بڕوانە باخەوانێکی لێزان بەکاری باخەوانی، بڕوانە کە چۆن هەرشتێك بچێنێت ئەوە ئاوی دەدات و خەریکی دەبێت تاوەکو درەختەکە پێ دەگا، ئینجا ڕووی تێدەکات و دەچێت لقی گەڵاکان دەقرتێنێت، چونکە ئەو دەزانێت ئەگەر هەروا لێی بگەڕێت، ئەوا بەرەکەی چاك نابێت، ئەو لەو کارەیدا مەبەستی بە پیت و بەرەکەیەتی، جا کاتێك درەختەکە پێ دەگات و لقەکانی دەلکێن بەیەکەوە و تێکەڵ دەبن و بەریش دەدات، باخەوانەکە دەچێت کە ئەو لقانەی دەرختەکە بێ هێز دەکات دەیقرتێنێت، جا کە بە مەقەسی ئاسن لقەکانی ئەم درەختە دەبڕێت و تووشی ئازاری دەکات، مەبەستی چاکسازییە بۆ درەختەکە نەك ئازاردانی، بۆ ئەوە وا دەکات تاکو بەرەکەی باش بێت و پێشکەشی پاشا بکرێت، پاشان هەروا بەخۆڕایی وازی لێ ناهێنێت، بەڵکو هێندێ جار تێنی دەکات

هەندێ جاریش ئاوی دەدات، بەردەوام ئاوی نادا ئەگەر چی ئاودانی بەردەوام زوو دەیپڕسکێنی، پاشان ئەو لق و گەڵایانەی کە درەختەکەی ڕازاندۆتەوە زۆرێکی لێ دەقرتێنێت، چونکە ئەوجوانیە ناهێڵێت بەچاکی پێ بگات هەروەکو درەختی ترێ و وێنەی ئەو وایە، جا کە ئەو گەڵا و لقە جوانەکەی بە مەقەسی ئاسن دەقرتێنێت، مەبەستی چاکسازیە بۆ درەختەکە، ئەگەر بێتوو ئەو درەختە وەکو گیاندار هۆشی هەبایە، وا گومانی دەبرد کە ئەم باخەوانە دەیەوێت تێکی بدا و زەرەری پێبگەیەنێت، کەچی لە ڕاستدا ئەم کارەی باخەوانەکە سوود بەخشە بۆ درەختەکە.

بە هەمان شێوەش باوکێکی دڵسۆز بۆ ڕۆڵەکەی خۆی، چاك دەزانێت چی چاکە بۆ ڕۆڵەکەی، ئەگەر ڕۆڵەکەی تووشی نەخۆشیەك بێت بزانێت خوێنی پیسی لێدەرکرێت چاك دەبێتەوە، دەچێت لای پزیشك نەشتەرگەری دەکات بەوەی کە پێستەکەی دەبڕێت و تووشی ئازاری دەکات تاکو چاك بێتەوە، ئەگەر بزانێت بە لێکردنەوەی ئەندامێکی چاك دەبێتەوە، ئەندامێکی لێدەکاتەوە، لە ڕاستیدا ئەم کارانەش دەکات بەزەیی بە ڕۆڵەکەی دێتەوە تاکو چاك بێتەوە نەك ڕقی لێ بێتەوە، ئەگەر بزانێت سوود لەوەدایە هەندێ شت لە ڕۆڵەکەی بسێنێتەوە ئەوە لێی دەسێنێتەوە، چونکە دەزانێت ئەگەر وا نەبێت بەهۆی ئەم شتەوە بە هیلاك دەچێت، بەهەمان شێوەش ناهێڵێت زۆرێك لە ئارەزوات ئەنجامبدات، باوکەکە لەم کارەشیدا ڕقی لە ڕۆڵەکەی نابێتەوە، بەڵکو بەزەیی پێدا دێتەوە و خۆشی دەوێت بۆیە قەدەغەی دەکات لە شتی خراپ.

جا خوای گەورە بە ڕەحمترین و حەکیم ترین و زانا ترین کەسە، خوای گەورە بۆ بەندەکانی بە ڕەحمترە لە خۆیان بۆ خۆیان، لە باوك و دایکیان بە ڕەحمترە، مرۆڤ کاتێك شتێکی بەسەرادێت پێی ناخۆشە ئەو خێری بۆ ئەو تیایە، چونکە خوای گەورە ئاوڕی بە خێری لێ داوەتەوە، بەڵام ئەگەر بێتوو مرۆڤ خۆی کاری خۆی هەڵبژاردایە ئەوە نەیدەتوانی ڕایپەڕێنێت، بەڵام خوای گەورە بە انست و حیکمەت و ڕەحمەتی خۆی کارەکانی مرۆڤ دەبات بەڕێوە، جا پێیان خۆش بێت یان نا، ئینجا

مرۆڤی ئیمانداری ڕاستەقینە کە ناو و سیفاتی خوای ناسیبێت، بە هەموو حوکمێکی خوا ڕازیە هەر چیەك بێت، هیچ گلەیی لە حوکمی خوا نیە بڵێ: غەدری لێ کردووم.

بەڵام مرۆڤی نەزان کە خوای گەورەی بە تـەواوی نەناسـیوە، گلـەیی لـە حـوکمی خواو حیکمەتی خوا دەکات، ملکەچ ناکات بۆ حوکمی خوا، بەڵکو دژایـەتی حـوکمی خوا دەکات بە عەقلە گەندەڵەکەی خۆی، ئا ئەو مرۆڤانە نە پەروەردگاریان ناسـیوە نە بەمەرامەکانیشیان گەیشتوونە.

هەر کاتێك مرۆڤ سەرکەوتوو بوو لە ناسینی خوا بـە چـاکی پـەروەردگاری خـۆی ناسیبێ، ئەوە لە دنیادا کامەران و دڵ ئارام دەبێت پێش ئەوەی بگات بە ئاخیرەت، چونکە ئەو بەردەوام لە پەروەردگاری ڕازیە، ڕازی بوونیش لە پـەروەردگار دنیـا بـۆ مرۆڤی خواناس دەکات بە بەهەشت، چونکە هەر شتێکی بەسەر بێت دەزانێت لەلای خواوەیە و پێی ڕازیە، دڵی ئارامە بـە حـوکمی خـوای گـەورە، ئـا ئەمـە ئەوەیـە کـە ڕازیە خوا پەروەردگاری بێت، ئیسلام دینی بێت، محمدﷺ پێغەمبـەری بێـت، هـەر کەسێکیش ئەمانەی لێ نێتە جێ دەکات تامی ئیمانی نەچەشتووە.

ڕازی بوونی مرۆڤ بە حوکمی خوا بە گوێرەی ناسینی دادپـەروەری و حیکمـەت و ڕەحمەتی پەروەردگاریەتی، هەرکاتێك چـاکتر ئەمانـە بناسـێت زیـاتر لـە خـوا ڕازی دەبێت.

چونکە ئەو بڕیارانـەی خـوا بەسـەر بەندەکانیـدا دەیـدات لـە دەوری ئـەم چـوارە دەخولێتەوە:

- العـدل: دادپەروەرانەیە بۆ مرۆڤ.
- المصلحة: قازانج و بەرژەوەندی مرۆڤی تیایە.
- الحكمة: بە حیکمەت و لێزانی خۆی فەرمان دەدات.
- الرحمـة: بە سۆز و بەزەییە لەگەڵ بەندەکانی.

فەرمانەکانی خوای گـەورە لـەم چـوارە دەرناچێت، هـەر وەك پێغەمبـەرﷺ لـە نزایە مەشهورەکەیدا دەیفـەرموو: ((اللَّهُـمَّ إِنِّـي عَبْـدُكَ، ابْنُ عَبْـدِكَ، ابْنُ أَمَتِـكَ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَـكَ، سَمَّيْتَ بِـهِ نَفْسَكَ، أَوْ

أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَداً مِنْ خَلْقِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي، وَنُورَ صَدْرِي، وَجَلاَءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي و غمي، إِلاَّ أَذْهَبَ اللَّهُ هَمَّهُ وَحُزْنَهُ، وَأَبْدَلَهُ مَكَانَهُ فَرَجاً. قَالَوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ نَتَعَلَّمُهَن؟ قَالَ: بَلَى، يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهَن أَنْ يَتَعَلَّمَهَن)) [١].

واتـە: خوایە من بەندەی تۆم، کوڕی بەنـدەی تـۆم، کـوڕی کـەنیزەك و کۆیلـەی تــۆم، نێوچــەوانم بــە دەســت تۆیــە، حــوکم و بڕیــارت بــە ســەرمدا ڕابــردووە، بڕیارەکانیشت بەسەرمدا دادپەروەرانەیە، خودایە داوات لێدەکەم و لێت دەپاڕێمەوە بە هەموو ناوە جوانەکانت کە ناوت پێ لــە خـۆت نـاوە، یـان لـە قورئانـدا ناردۆتتـە خوارەوە، یان فێری کەسێکت کردووە لە دروستکراوەکانت، یان لە زانستی پەنهانی خۆت حەشارت داوە کە قورئان بکەیتە بە هاری دڵم، و نووری سنگم و ڕەوێنـەوەی دڵ تەنگیم و لابەری غەم و خەفەتم، هەر کەسێك ئەو نزایە بکات ئەوە خوای گەورە غەم و خەفەتەکەی لادەبا و بـۆی دەگۆڕێـت بـە خۆشـی - کاتێـك هـاوەڵان ئەمـەیان بیست - فەرموویان: ئەی پێغەمبـەری خـواﷺ خـەڵکی فێـری ئـەم نزایـە بکـەین؟! پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: بەڵی، هەر کەسێك گوێ بیستی بوو، پێویسته خـەڵکی تری لێ فێربکات

مەبەست لەوەی کە دەفـەرمووێ: (عَدْلٌ فِيَّ قَضاؤُكَ)، ئەمـە هـەموو ئـەو بڕیارانـە دەگرێتەوە کە خوا دەیدا بەسەر بەندەکەیدا لە سزا و ئازار و هۆی ئەمانەش، خوای گەورە دادپەروەرە لە بڕیارەکانی، ئەم بڕیارەی خوا خێری بۆ ئیماندار تیایـە، هـەر وەك پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێ: ((والـذي نَفْسي بِيَـده لا يَقْضِي الله لِلمؤمن قـضاء إلا كـان خـيراً لـه، ولـيس ذلـك إلا للمؤمن)) [٢]، واتــە: سـوێند بـەوەی کـە گیـانی منـی

(١) صحيح: رواه أحمد في مسند (٣٧١٢)، ابن حبان في صحيحه (٩٧٢)، الحاكم في المستدرك (١٨٧٧)، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: السلسلة الصحيحة للشيخ الألباني (١/٣٨٣).

(٢) صحيح: رواه مسلم (٢٩٩٩).

بەدەستە، خوای گەورە هەر بڕیارێك بەسەر مرۆڤی ئیماندار بدات، ئەوە خێری بۆ ئەو تیایە، ئەمەش بۆ کەسی تر نیە جگە لە ئیماندار.

ابن قیم دەفەرموێ: پرسیارم لە مامۆستای بەڕێزمان[1] کرد: ئایا ئەمە بڕیاری گوناهیش دەگرێتەوە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ بە مەرجی خۆی، لە قسەکەیدا فەرمووی (بە مەرجی خۆی) کە تایبەتمەندیەکانی گوناه دەگرێتەوە لە تەوبە و ملکەچی و پەشیمانی و خشوع و زەلیلی و گریان و شتانی لەم جۆرە.

---

(١) مەبەستی شێخ (ابن تیمیة)یە.

# ڕێگای بە دەست هێنانی زوهـد

مرۆڤ تامەزرۆ و ئیشتیاقی دوا ڕۆژ نابێت تاکو واز لە حەڕامەکانی دنیا نـەهێنێت، ناشتوانێت واز لە حەڕامەکانی دنیا بێنێت مەگەر لەم دوو ڕێگایەوە نەبێت:

یەکـەم: مـرۆڤ بڕوانێـت و بـیر بکاتـەوە لـە ناوچـون و نـەمانی خۆشـیەکانی ئـەم دنیایەو بێقیمەتی و ئێش و ئازاری و نەگەیشتن بە ئامـانجی، کەچـی ئەگـەر مولـك و سامانێکی زۆریشی هەبێت لەم دنیایە ئەوە دوای ئەمە داخ و حەسرەتی بەدوا دێـت، دەبینین مرۆڤ هەموو هەوڵ و کۆششی خۆی دەدات بۆ ئەوەی خۆشیەکانی دنیـا بـە دەست بێنێت، پێش بە دەست هێنانی دڵ گرانە و خەفەتی بۆ دەخـوات، کـاتێکیش بـە دەسـتی دەهێنێـت هـەر دڵ گرانـە و خەفـەتی بـۆ دەخـوات، کـە لـە دەسـتیـشی دەردەچـێت هـەر دڵ گرانـە و خەفـەتی لێ دەخـوات، ئەمـە یەکێکـە لـەو ڕێگایانـەی ئەگەر مرۆڤ لێ ی ووردبێتەوە دەتوانێت دوا ڕۆژ بۆ خۆی بە دەست بهێنێت.

دووەم: مرۆڤ بڕوانێت و بیر بکاتەوە لە دوا ڕۆژ، کە ڕۆژێکە هـەر دێـت بڕانـەوەی بۆ نیە، بیر بکاتەوە لە خێر و بەرەکەتی دوا ڕۆژ، ئینجا بەراوردی بکات لەگـەڵ ئـەم دنیایەی ئەو تیایدایە، هـەر وەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ﴾ (الاعلى:(١٧)، واتـە: ئاخیرەت چاکترە لە دنیا و بەردەوامـە، وەکـو دنیـا نیـە، بـەڵام ئەم دنیایە وەك خەیاڵات وایە و دەبڕێتەوە.

جا ئەگەر بەم دوو ڕێگایەدا بڕوانیتە دوا ڕۆژ و بیری لێ بکاتەوە ئەوە ڕوو دەکاتە کاری چاکە و چاکە هەڵدەبژێرێت و وازیـش لـە خراپـە دەهێنێت، تـەبیعاتی هـەموو کەسێکیش هەر وایە کە واز لە شتێك ناهێنێت لەبەر دەستدابێت بـۆ شـتێکی نادیـار کـە ئامـادە نیـە، مەگـەر بزانێـت ئـەو شـتەی ئامـادە نیـە بـە نـرخترە لـەو شـتەی ئامادەیە، ئەوکات ڕوو لە بە نرخەکان دەکات.

بەڵام ئەگەر هاتوو شتە بێ نرخەکەی لەسەر شتە بە نرخەکە هەڵبژارد، ئەوە یان ئەو شتە بەنرخ دادەنێت یان حەز لە شتی بە نرخ ناکات، ئـەو دووانـەش هـەردووکی بەڵگەیە لەسەر بێ هێزی ئیمـان و کـەم عـەقڵی و گـەوجی ئـەو مرۆڤـە، چـونکە ئـەو کەسەی ئارەزووی لە دنیایە و ڕووی کردۆتە دنیا، ئـەو کەسـە یـان بـڕوای وایـە ئـەم دنیایـە لـە دوا ڕۆژ چاکترە و هـەر دەمێنێـت، یـان بـڕوای وایـە دوا ڕۆژ لـەم دنیایـە چاکترە و نەبڕاوەیە، جا ئەگەر بڕوای وابوو دنیا لە دوا ڕۆژ بـەنرخترە ئـەوە ئیمـانی نیە، ئەگەر بڕواشی وابێت دوا ڕۆژ لە دنیا بەنرخترە لەگـەڵ ئەوەشـدا ڕووی لـە دنیـا کردووە، دەکات گەمژەیە و مەسلەحەتی خۆی نازانێت.

کەوابوو مرۆڤ لەم دوو جۆرە دەرناچێت:

چونکە هەڵبژادنی دنیا بەسەر دوا ڕۆژدا، یان ئەو کەسە ئیمـانی تـەواو نیـە، یـان عەقڵی تەواو نیە، بۆیە هاوەڵانی ﷺ پێغەمبەر دنیایـان پـشت گـوێ خـستبوو نـەیان دەهێشت مەیلی دڵیان بۆ دنیا بڕوات، بەڵکو وەکو بەندیخانە سەیری دنیایان دەکرد نەك وەکو بەهەشت.

بە ڕاستی ئەوان زاهید بوون لە دنیـادا، ئەگـەر مەبەسـتیان دنیـا بایـە و دنیایـان بویستایە ئەوە هـەموو خۆشـیەکانی دنیایان بـۆ ئـەوان فـەراهام دەهـات، دەبیـنین پێغەمبەر ﷺ کلیلی دەرگای خەزێنەکانی پێشکەش کرا، بەڵام ئەو ڕەتـی کـردەوە، هاوەڵانیـشی بـە هـەمان شـێوە دنیایـان نەگۆڕیـەوە بـە دوا ڕۆژ، چـونکە ئـەوان دەیانزانی کـە ئـەم دنیایـە شـوێنی حەسـانەوە نیـە، بـەڵکو شـوێنی پیـا ڕۆیـشتنە، شوێنێك نیە مرۆڤ بەردەوام تیای بمێنێتەوە و دڵخۆش بێت پێی.

پێغەمبەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((مَالي وَللدُنيا، إنَما أنا كراكبٍ قام في ظِـل شَـجَرةٍ ثُـم رَاحَ وَ تركَها))[1]، واتـە: من چیم لە دنیا داوە، مـن لـەو دنیـا هـەر وەك ڕێبوارێـك وام کـە کەمێك لە ژێر دارێکدا دەحەسێتەوە و چاوی گەرم دەکات، پاشان دەڕوا و ئەو دارە بەجێ دەهێڵێت.

(١) صحيح: رواه الترمذی (٢٣٧٨)، و ابن ماجه (٤١٠٩)، و احمد فی مسند (٢/٧٠).

هەروەها لە فەرمودەیەکی تـر دەفـەرمووێ ((مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إلاَّ كَمَا يدخل أَحَدُكُمْ أُصْبُعَهُ فِي الْيَمِّ فالينْظُرْ بِمَ تَرْجِعُ! !))[1]، واتـە: دنیـا لـە چـاو دواڕۆژدا، وەکـو ئەوە وایە کە یەك لە ئێوە پەنجەی بخاتە ناو دەریایەك بڕوانێت کـە پەنجـەی چـەند ئاو لەگەڵ خۆی دەهێنێت، دنیاش لە چاو دواڕۆژ بەم شێوەیە.

خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّمَا مَثَلُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلْأَنْعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَآ أَنَّهُمْ قَٰدِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَىٰهَآ أَمْرُنَا لَيْلًا أَوْ نَهَارًا فَجَعَلْنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِٱلْأَمْسِ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٥﴾﴾(یونس:٢٤ ـ ٢٥). واتـە: بێگومان نموونەی ژیانی ئەم دنیایە، هەر لەو بارانە دەچێت کە لە ئاسمانەوە دامانباراندووە، جا بەهۆیەوە ڕووەکی زەوی گەشە دەکات و بەیەکدا دەچن ـ بەرووبوومی خۆی پێشکەش دەکات ـ لەو خۆراکانەی کە هەم خەڵکی و هەم ئاژەڵیش لێی دەخوات، هەر کاتێك وای لێ دێت زەوی، بەجوانی نەخش و نیگاری خۆی دەردەخات و خۆی دەڕازێنێتەوە، خەڵکەکەی وا گومان دەبەن بەڕاستی هەمیشە دەسەڵاتداری تەواون بەسەریدا ـ ئا لەو کاتەدا کە خەڵکی ڕوو لە گوناه و تاوان دەکەن ـ ئەوە فەرمانی ئێمەیان بۆ دەردەچێت لە شەودا یان لە ڕۆژدا، ئەوسا وەك کشتوکاڵ دروێنە کراوی لێ دەکەین، هەر وەکو دوێنێ نەبووبێت، بەو شێوەیە ئایەتەکانی خۆمان ڕوون دەکەینەوە بۆ کەسانێك کە بیر بکەنەوە و تێبفکرن، خوای گەورەش بانگەواز دەکات بۆ بەهەشتی پڕ لە شادی و ئاشتی و ئاسایش، هەر کەسێك خوای گەورە بیەوێت ڕێنموونی دەکات بۆ ڕێگەی ڕاست.

لەم ئایەتەدا خوای گەورە باسی کەمی دنیا و وازهێنـان لـە دنیـا دەکـات، باسـی بەهەشت دەکات و خەڵکی بۆ بانگ دەکات.

(١) صحيح: رواه مسلم (٢٨٥٨)، و الترمذي (٢٣٢٤)، و ابن ماجه (٤١٠٨).

دەفـەرمووێ: ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَآءٍ أَنزَلْنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخْتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ ٱلرِّيَٰحُ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾ ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴾ (الكهف:٤٥ ـ ٤٦)، واتـە: ئەی پێغەمبەر نموونەیان بۆ بهێنەوە کە ژیانی دنیا وەك ئەو ئاوی بارانە وایە کە لە ئاسمانەوە دەیبارێنین و ڕووەکی زەوی بەهۆیەوە بەیەکدا دەلکێن، لە دوای ماوەیەکی کەم ـ هەموو ئەو ڕووەك و گژوگیایە ـ دەبێتە پووش و پەلاشێکی وورد و خاش، ڕەشەبا بەم لاو بەو لادا بڵاوی دەکاتەوە، خوای گەورەش دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ماڵ و سامان و وەچە، زینەت و جوانی بۆ ژیانی دنیا، بەڵام دڵنیابن کردەوە چاکەکان کە بەرهەمیان دەمێنێتەوە پاداشتیان چاکترە لای پەروەردگارت و ئومێد و هیوای چاکتریشی لێ دەکرێت بۆ خاوەنەکانیان.

خوای گەورە لە ئایەتێکی تر دەفـەرمووێ: ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا ۖ وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴾ (الحديـد: ٢٠)، واتــە: چـاك بـزانن ژیـانی دنیـا بریتیە لە یاری و گەمە و ڕازاندنەوە و خۆ هەڵکێشان لـە نێوان یەکتریـدا، هـەروەها زۆرکردنی سامانی ماڵ و منداڵە، جا ئەوانە هـەر هـەمووی وەکـو بـارانێکی بـە پیـت وایە کە ببێتە هۆی بەرهـەمێکی زۆر، کـە گەشتیارەکان سەرسـام بکـات، لـەوەودوا وشك بێـت و زەرد هەڵگـەڕێت، پاشـان ووردوو خـاش بێـت و بکـەوێت، بێگومـان لـە قیامەتیـشدا سـزای زۆر سـەخت بـۆ دنیـا پەرسـتان ئامادەیـە، لـەو لاشـەوە لـێ خۆشبوون و ڕەزامەندی لە لایـەن خـواوە ئیمانـدارانی چاکە خـوازی لـێ بـەهرەوەر دەکرێت، ژیانی دنیـاش دوور لـە خواناسـی و دینـداری جگـە لـەوەی کـە بریتیـە لـە ڕابواردنێکی کەم شتێکی تر نیە، زۆر کەسیش پێی غروور و دەستخەڕۆ دەبێت.

هـــەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ۞ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾ (ال عمران:١٤ ــ ١٥). واتـە: ئارەزووی ئافرەت بوونی نـەوەی نێرینـە و خاوەنیـەتی ئـاڵتون و زێـر و زیـوی زۆرە و زەبەنـد و ئەسـپی چـاك و ڕەسـەن، هـەروەها مـاڵان و زەوی و زاری كشتوكاڵی بۆ خەڵكی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەر هەمووی نازونیعمەتی ژیانی دنیان، خـوای گـەورەش بـۆ چـاكەكاران شـوێنی گەڕانـەوەی ڕازاوە و خۆشـی لای خـۆی ئامادەكردووە ـ كە بەهەشتە ـ ئـەی محمـد (ﷺ) بـەو خەڵكـە بڵـێ: ئایا هـەواڵی چاكتر لەو نـاز و نیعمەتنـەتان پێڕابگەیـەنم؟! ــ ئـەویش ئەمەیـە ــ بـۆ ئەوانـەی پارێزگار و خواناسن، لای پـەروەردگاریان باخـەكانی بەهەشـت ئامادەیـە بۆیـان كـە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەكانیدا بەبەردەم كۆشـكەكانیدا دەڕوات، مـرۆڤ لەگـەڵ ژیـانی نـەبڕاوە لەگـەڵ هاوسـەرانی پاكـژدا و بـەدەم هەسـت كردنـی بـەردەوام بەڕەزامەنـدی پـەروەردگاریان دەگـوزەرێنن، بێگومـان خـوای گـەورە بینایـە بـە بەندەكانی.

خوای گەورە لە ئایەتێكی تر دەفـەرمووێ: ﴿وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ ﴾ (الرعد:٢٦)، واتـە: خەڵكی دڵخۆشن بە ژیانی دنیا، لە كاتێكدا كـە ژیانی دنیا لە بەرانبەر ژیانی دوا ڕۆژ تەنها ڕابواردنێكی كەم نەبێت هیچی تر نیە.

خوای گەورەش هەڕەشەی زۆر توندی كردووە لەو كەسانە كە بە ژیانی دنیا ڕازین و پشتیان كردووە لە ئایاتی خوا و بەنیازی گەیشتن بە خوانین خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّوا۟ بِهَا

وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨﴾ (یونس:٧ـ ٨). واتـە: بەڕاستی ئەوانەی بەتەمای ئامادەبوونی بەبارەگای ئێمە نین و ڕازی بوون بە ژیانی ئەم دنیایە و دڵیان پێیەوە بەندە، ئەوانە بێ ئاگان لە ئایەت و دروستکراوەکانی ئێمە، ئا ئەوانە شوێن و جێگەیان ئاگرە بەهۆی ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.

خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ (التوبة:٣٨)، واتـە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە ئەوە بۆچی کاتێك پێتان دەگوترێ ڕاپەڕن لە پێناو خودا، ئێوە لەشتان گران دەبێت و دەلکێن بە زەویەوە، ئایا ڕازین بەژیانی دنیا و بە گرنگتری دەزانن لە ژیانی نەبڕاوەی دوا ڕۆژ لە بەهەشتی بەریندا، بێگومان ژیانی دنیا بەراورد لەگەڵ ژیانی پڕ لە شادی دوا ڕۆژ زۆر کەم تەمەن و کەم خۆشیە.

مرۆڤ بەئەندازەی ڕازی بوونی بـە دنیـا و دڵ بەنـد بـوونی بـە دنیـا لەشـی گـران دەبێت لە بەندایەتی و کـارکردن بـۆ دوا ڕۆژ ئـەم ئایەتـەش بەسـە بـۆ ئـەو کەسـەی بـاوەش بــە دنیــا ئــەکات: ﴿أَفَرَءَيۡتَ إِن مَّتَّعۡنَٰهُمۡ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ﴾ (الشعراء: ٢٠٥ ــ ٢٠٧). واتـە: باشـە ئەگەر چەندان ساڵ ڕابوێرن، پاشان ئەگەر ئەو هەڕەشە و سزایەی کە لـەوان کـراوە هاتەدی و پێش هات، دەتوانن چی بکەن، ئەوسا ئیتر ئەو ڕابواردنـەی دنیایـان هـیچ فریایان ناکەوێت و بێ سوود دەبێت بۆیان.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ كَأَن لَّمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيۡنَهُمۡ﴾ (یونس:٤٥). واتـە: ڕۆژێك دێت خوا هەر هەموویان کۆ دەکاتـەوە، وا هەست دەکەن تەنها سەعاتێك لە ڕۆژیان پێچوە هەموویان یەکتر دەناسنەوە.

هــەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭ ۚ بَلَـٰغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾ (الأحقاق:٣٥). واتــە: ئــەو ڕۆژەی کــە بــەڵێنیان دراوەتیێ هەر کاتێك پێشهات وادەزانن تەنها ساتە وەقتێکتـان لـە ڕۆژێکدا پێچوە، ئەمە بەڵێن و پەیام و ڕاگەیاندنێکی تـەواوە، جـا ئـەو کـات مەگـەر تـەنها تاوانبـاران وەکو گوناهکاران نین کە تیادەچن؟!

لە ئایەتێکی تردەفـەرمووێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾﴾ (النازعات:٤٢ـ٤٦)، واتــە: پرسیارت لیێ دەکەن ـ ئەی محمد(ﷺ)ـ دەربارەی قیامەت کە کەی و چ کاتێك بەرپا دەبێت؟ جا تۆ لە کوێ دەزانیت کەی بەرپا دەبێت!! تۆ لەکوێ و ئەو باسە لەکوێ؟ بێگومان کۆتایی دنیا و بەر پابوونی قیامەت، هەر پەروەردگار دەیزانێت، بێگومان ئەرکی تۆ تەنها بێدارکردنەوەی ئەو کەسانەیە کە لەو ساتە دەترسن، ئەو ڕۆژەی کە قیامەت بەرپا دەبێت، بیێ باوەڕان وا دەزانن کە تەنها سەر لە ئێوارەیەك یان سەر لە بەیانیەك درێژی ژیانی دنیایان چێژتوو.

خــوای گــەورە دەفــەرمووێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ ۚ﴾ (الروم:٥٥)، واتــە: ئەو ڕۆژەی کە قیامەت بەرپا دەبێت تاوانبـاران سـوێند دەخۆن ـ کە ژیانی دنیایان ـ تەنها کات ژمێرێك بووە.

وە دەفـەرمووێ: ﴿قَـٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَـٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ (المؤمنون:١١٢ ـ ١١٤). واتــە: خوای گەورە لێیان دەپرسێت: ئەوە چەند ساڵە لە دنیادا ژیانتان بردە سەر؟ دەڵێن: ڕۆژێك یان کەمتر لە ڕۆژێك، لەو کەسانە بپرسن کە بیرو هۆشیان لای خۆیانە و حسابی ژمارەکان دەکەن، خوای گەورە پێیان

دەفەرمووێ لە ڕاستیدا مانەوەتان لە دنیادا هەر زۆر کەم بووە، ئەگەر بەڕاستی دەتانزانی؟

هەروەهادەفـــــــــەرمووێ: ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَافَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾﴾ (طه:١٠٢ ـ ١٠٤)، واتـە: ڕۆژێك دێت فوو دەكرێت بە (صـور)دا ئەو ڕۆژە تاوانباران چاویان كوێر و شـین هەڵگـەراوە، بەچپە چـپ بـە یـەك دەڵـێن: تەنها دەشەو نەبێت لە دنیادا هیچی ترتان پێچوە، ئێمـە چـاك دەزانـین سـەرەنجام چی دەڵێن: تەنها ڕۆژێك نەبێت هیچی ترتان پێنەچووە.

# بۆ تووشی نەهامەتی دەبیت

بنچینەی هەموو خێرێك ئەوەیە کە بزانی هەر شتێك خوا حەز بکات دەبێت، هـەر شتێکیش خوا حەزنەکات نابێت، ئەوکات دڵنیا دەبی کە ئەو شتە چاکانەی بەسەرت دادێت لە بەخششی خوای گەورەیە، بۆیە سوپاسی لەسەر دەکەی و ملی بەندایـەتی بۆ کەچ دەکەی تاکو لێت نەبڕێتـەوە، دڵنیـاش دەبـی کـە ئـەو بەڵایانـەی بەسـەرت دادێت، سزای خوای گەورەیە بۆ تۆ، بۆیە دەپاڕێیتەوە لێی کە لێت تووڕە نەبێت و فەرامۆشت نەکات.

زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە هەر خێرێك تووشی مرۆڤ دەبێت ئەوە پـشتیوانی خوای گەورەیە بۆ ئەو مرۆڤە، هەر بەڵایەکیش تووشی مرۆڤ دەبێت، ئەوە فـەرامۆش کردنی خوای گەورە بۆ ئەو مرۆڤە.

وە دەڵێن: سەرفرازی خوای گەورە بۆ مرۆڤ، ئەوەیـە کـە نـەت سـپێرێتە نەفـسی خۆت، زەلیل کردنی مرۆڤیش ئەوەیـە فەرامۆشـت دەکـات و دەت سـپێرێتە نەفـسی خۆت.

کە هەموو خێر و چاکەیەك بـە دەسـت خوایـە و بـە دەسـتی کـەس نیـە، کەواتـە کلیلی دەرگای ئەو خێر و چاکانە نزا و ملکەچـی و ڕووکردنـە خـواو خۆشەویستی و ترسی خوایە، هەر کاتێك بەنـدە ئـەو کلیلـەی بـە دەسـت هێنـا دەتوانێـت دەرگاکـە بکاتەوە، هەر کاتێکیش ئەو کلیلەی بە دەست نەهێنا ئەوە دەرگای خێر و بەخشش بە ئەو ناکرێتەوە بە غەیری ئەو دەکرێتەوە.

پێشەوای ئیمانداران (عمر بن الخطاب) دەفەرموێ: من غەمی وەڵامدانـەوەی ئـەو نزایانەم نیە کە دەیکەم، بەڵکو غەمی نزاکەم هەیە، چونکە ئەگـەر بـە پـوختی نـزام کرد ئەوە بێگومان گیراویش دەبێت.

بە ئەندازەی نیەت و تێکۆشان و تـرس و خۆشەویـستی مـرۆڤ خێـرو بەرەکـەت و یارمەتی خوا دادەبەزێت، بەهەمان شێوەش بە ئەنـدازەی پـشت تێکردنـی مـرۆڤ لـە

دینی خوا تووشی ئازار و بەڵا دەبێت.

چونکە خوای گەورە زۆر زانا و دانا و بە حیکمەتە، کێ شیاوی سەرفرازی بێت سەرفرازی دەکات، کێش شیاوی سەرگەردانی بێت سەر گەردانی دەکات، چونکە زانا و بەحیکمەتە.

هەر کەسێك کە تووشی سەرگەردانی بووە، هۆیەکەی ئەوەیە کە نزا و ملکەچی و سوپاسی خوای نەکردووە، هەر کەسێکیش کە سەرفراز بووە هۆیەکەی ئەوەیە کە بە کارەکانی خۆی هەڵساوە، نزا و ملکەچی و شوکرانە بێژی خوای کردووە.

سەری ئەمانەش هەر هەمووی ئارامگرتنە، چونکە ئارامگرتن لە ئیماندا وەکو سەر وایە بۆ لاشە، کە هەر کاتێك سەر نەما ژیانیش نامێنێت.

# خەرمانەی دڵان

- گەورەترین سزا کە بەسەر مرۆڤدا بێت دڵ ڕەقی و دوور بونیەتی لە خوا.
- ئاگر دروست کراوە بۆ تاواندنەوەی دڵی ڕەق.
- دوورترین دڵ لە خوای گەورە دڵی ڕەقـــە.
- ئەگەر دڵ ڕەق بوو چاو کوێر دەبێت بەرانبەر حەق.
- چوار شت هەیە دڵی مرۆڤ ڕەق دەکات ئەگەر زیاد لە پێویست ئەنجامدرا:

١. زۆر خـــواردن.
٢. زۆر خەوتـــن.
٣. زۆر قسەکردن.
٤. زۆر تێکەڵ بوونی خەڵکی.

هـەروەکو چـۆن جەسـتە ئەگـەر نـەخۆش کـەوت تـام و سـوود لـە خـواردن و خواردنەوە وەرناگرێت، بەهەمان شـێوەش دڵ ئەگـەر بـە هـەواو ئـارەزوات نـەخۆش کەوت سوود لە ئامۆژگاری وەرناگرێت.

- هەر کەسێك دەیەوێت دڵی ساف بێت، بـا گوێڕایـەڵی خـوا پـێش گوێڕایـەڵی ئارەزواتی بخات.

- دڵ بە ئەندازەی پەیوەسـت بـوونی بـە ئارەزوواتـەوە دوور دەکەوێتـەوە لـە خوای گەورە.

- دڵەکان دەفرەی خوای گەورەن لە زەویـدا، خۆشەویـستترینیان ئەوەیـە کـە ساف و بێگەرد و پاکـــە.

- خەڵکی دڵیان سەرقاڵ کردووە بە دنیاوە، ئەگەر بێتوو دڵیان سـەرقاڵ کـەن بە خوا و ڕۆژی دوایی چاو ڕۆشن دەبن بە ئایات و نیـشانەکانی خـوا، وە کامـەران و ئاسوودەدەبن.

♥ ئەگەر دڵ و دەروون بە وێردی خوا خۆراك بدرێت، بە بیرکردنەوە لە دروست کراوەکـانی خـوا ئـاو بـدرێت، پـاکیش بکرێتـەوە لـە خراپـە، ئـەوکات ئـەو دڵــە بەختەوەر دەبێت و شتی سەیر دەبینێت، حیکمەتی بۆ دێت.

♥ مەرج نیە هەر کەسێك خۆی ڕازانـدبۆوە بـە زانـست و حیکمـەت و بلیمـەتی ئەوە ئەو کارانە پڕ بە پێستی بێت و زانـا و بەحیکمـەت و لێـزان بێـت، بـەڵکو ئـەو کەسانە زانـا و بلیمـەت و لێـزانن کـە دڵیـان زینـدوو دەکەنـەوە بـە کوشـتنی هـەواو ئارەزواتیان.

بەڵام کەسێك دڵی بکـوژێ و هـەواو ئـارەزواتی زینـدوو بکاتـەوە، ئـەوە زانـست و بلیمەتیەکەی بەتاڵە و تەنها زمانی درێژە و هیچی تر.

♥ دڵ بە بێ ئاگایی و نەترسان لە خوا کاول دەبێـت، بـە یـاد و ترسـی خـواش ئاوەدان دەبێتەوە.

♥ ئەگەر دڵ پشتی کردە سفرەی دنیا ئەوە داوەتی خوانی ئاخیرەت دەکرێت، بەڵام ئەگەر ڕازی بـوو بەسـفرەی دنیـا و ڕووی تێکـرد، ئـەوە خـوانی ئـاخیرەتی لـە چنگ دەچێت.

♥ تامەزرۆی گەیشتن بە خوا وەك شەماڵێکە هەڵدەکات بەسـەر دڵـدا و ئـاگری دنیای تیا دەکوژێنێتەوە.

♥ هەر کەسێك دڵی پەیوەست بێت بەخوا ئەوە ئاسوودە و کامـەران دەبێـت، هەر کەسێکیش دڵی پەیوەست بێت بە خەڵکی ئەوە دڵ تـەنگ و نیگەران دەبێت.

♥ خۆشەویستی خوا ناچێتە دڵێك کـە خۆشەویـستی دنیـای تیـا بێـت، مەگـەر حوشتر بەکونی دەرزیدا بڕوات.

♥ ئەگەر خـوای گـەورە بەندەیـەکی خـۆش بوێـت، ئـەوە خۆشەویـستی خـۆی دەخاتە دڵی، هەڵیی دەبژێرێت بە بەنـدەی خـۆی، تـاکو وای لێـدێت، هـەموو غـەمی

دەبێتە ڕەزامەندی خوا، زمانی بە زکری خوا تەڕ دەکات، ئەندامەکانی دەکاتە خزمەتی.

♥ دڵ نەخۆش دەکەوێت هەر وەك چۆن لاشە نەخۆش دەکەوێت، شیفا و دەرمانەکەشی تەوبە و پەشیمانیە، دڵ ژەنگ و لێڵ دەبێت هەر وەك چۆن ئاوێنە لێڵ دەبێت، پاك بوونەوەکەشی بەزکری خوایە، دڵ ڕووت دەبێت هەر وەك چۆن لاشە ڕووت دەبێت، پۆشاکەکەشی تەقوایە، تێنی و برسی دەبێت هەر وەك چۆن جەستەی مرۆڤ برسی و تێنی دەبێت، خواردن و خواردنەوەکەشی ناسین و خۆشویستن و تەوەکول و گەڕانەوەیە بۆ لای خوای گەورە.

♥ نەکەی بێ ئاگا بیت لەو خوایەی ئەجەلی بۆ ژیانت داناوە، بۆ ڕۆژ و هەناسەکانت ماوەی داناوە، هەموو شتێك جگە لەو لێت جیا دەبێتەوە، تەنها خوایە هەرگیز لێت جیانابیەوە و بەردەوام پێویستت پێیەتی.

♥ هەر کەسێك کارەکانی دنیای سپاردەی خوا کرد، یان منداڵەکانی یان ترسی هەژاری یان ڕزگار بوون لە دووژمنی سپاردە خوای گەورە و پشتیوانی پێ بوو وڕازی بوو بەوەی کە خوا بۆی دیاری دەکات هەموو کارەکانی خستە بەردەستی خوا و بەویستی و بڕیارەکانی ئەو ڕازیش بوو، ئەوکات نیگەران و غەمگین و خەفەتبار نابێت، بەڵام هەر کەسێك بە بڕیاری خوا ڕازی نەبێت لە نەفسی خۆی ڕازی بێت، تووشی بەد بەختی و شڵەژانی گوزەران و ماندوو بوون دەبێت و ژیانی نیگەران دەبێت، دڵی تەنگ دەبێت، کاری چاکی بۆ نایەت، نیازەکانی بۆ نایەتە دی، ئیسراحەت لە خۆی ناکات.

خوای گەورە ڕێگای گەیشتن بە ڕەزامەندی خۆی ئاسان کردووە بۆ بەندەکانی بە پەردەی بەڕێوەبردن داپۆشیوە، جا هەر کەسێك بە بڕیاری خوا ڕازیبێت و ڕازی بێت لەو شتانەی بۆی دیاری دەکات، کارەکانی بسپێرێتە خوا، ئەو پەردەیە لادەچێت و مرۆڤەکە دڵ ئارام و ئاسوودە دەبێت.

♥ هەر کەسێك سەرقاڵ بێت بە نەفسی خۆی ئاگای لە خەڵکی نامێنێت، هەر کەسێکیش سەرقاڵ بێت بە پەروەردگاری ئاگای لە نەفسی خۆی نامێنێت.

♥ ڕەزامەندی ئەوەیە دڵی ڕازی بێت بە بڕیارەکانی خوای گەورە.

♥ خەڵکی لە دنیا تووشی ئێش و ئازار دەبن بە ئەندازەی پەیوەست بوونیان بە دنیاوە.

♥ دڵ شەش شت هەیە وەکو نیشتیمانی خۆی تیایدا دەخولێتەوە، ئەم شەشەش سیانیان نزم و بێ ڕێزە، سیانیشیان بەرز و بەڕێزە.

سیانە نزم و بێ ڕێزەکە ئەمانەن:

١. دنیایە کە خۆی بۆ ڕازاندۆتەوە.

٢. نەفسیەتی پێ ی دەڵێت ئەوە بکە ئەوە مەکە.

٣. ئەو دوژمنەیەتی کە شەیتانە وەسوەسەی بۆ دروست دەکات.

ئەم سیانە بەردەوام لە دڵی مرۆڤی خراب دادێن و دەچن.

سیانە بەرز و بەڕێزەکەش ئەمانەن:

١. زانستێکە شتی خراپ و ڕاستی بۆ ڕۆشن دەکاتەوە.

٢. عەقلە کە ڕێگای پیشاندەدات.

٣. خودایەکە کە دەیپەرستێ.

ئەم سیانەش بەردەوام لە دڵی مرۆڤی چاکدا دێن و دەچن.

♥ شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوات و ئومێدی درێژ بە دنیاوە تێکدەری هەموو کارێکە، چونکە مرۆڤ کە شوێنی هەواو ئارەزوات کەوت چاوی کوێر دەبێت لە ئاست حەقدا، ئومێد بوونی بە دنیا دوا ڕۆژی لە بیرە دەباتەوە، دەبێتە ڕێگر لە کارکردن بۆ دوا ڕۆژی.

♥ هەر کاتێك خوای گەورە بیـەوێت چاکەیەك لەگەڵ بەندەکەیدا بکـات، وای لێدەکات دان بەهەڵەکانیدا بنێت، خەریك نەبێت بە هەڵەی خـەڵکی، بەخـشندە بێـت بەو شتانەی لەلایەتی، تەماعی لە ماڵ و سامانی خەڵکی نەبێت، ئارام بگرێت لەسەر ئێش و ئازاری دنیا، بـەڵام ئەگـەر خـوای گـەورە بیـەوێت سـزای بـدات ئەمانـەی بۆ پێچەوانە دەکات.

♥ سەرفرازی مرۆڤ لە سێ شت دایە:

١. ناسینی سیفاتە بەرز و بڵندەکانی خوا، چونکە بە ناسین و خۆشەویستی خـوا ئیرادەی زیاد دەبێت.

٢. وورد بوونەوە لە بەخششەکانی خوا، چونکە بەووردبوونەوە لە بەخششەکانی خوای گەورە زیاتر ملکەچ و شوکرانە بژێری دەبێت.

٣. بیرکەوتنەوەی گوناهەکانی، چونکە بە بیرکردنەوەی گوناه و تاوانەکانی زیاتر پەشیمان دەبێتەوە وتەوبە دەکات.

جا سەرقاڵ بوون جگە بەم سیانە مرۆڤ تووشی وەسوەسە و نیگەرانی دەکات.

هەرکەسێك ڕووبکاتە دنیـا و دڵـی پێیـەوە پەیوەسـت بێـت، ئـەوە دنیـا بـێ ڕێـز سەیری دەکات و دەیکات بە خزمەتکاری خۆی، هەرکەسێکیش پشت لە دنیا بکات، ئەوە دنیا بەگەورەی دەزانێت و دەبێت بە خزمەتکاری.

گەشـتیار بـە شـەو نخـوونی و تێکۆشـان و مانـدووبوون گەشـتەکەی بـۆ تـەواو دەکرێت، بەڵام ئەگەر گەشتیار خاوی لێکرد و لە ڕێگادا شەوان خـەوت، ئـەوە چۆن دەگاتە مەبەستی؟

# نموونەی زانای بەد عەمەل

هەر زانایەك دنیا ویست بێت، ئەوە قسەی ناحەق بە ناوی خوا بڵاو دەكاتـەوە و فتوا بە پێی بەرژەوەندی دەدات.

چونكە زۆرێك لە خەڵكی فەرمانەكانی خوایان پێ خۆش نیە، بە تایبەت دەسەڵاتداران و سەركردەكان، ئەوانەی شوێنی هەواو ئارەزواتی خۆیان كەوتوونە، چونكە ئەوان ناگەن بە مەبەستەكانیان مەگەر لە ڕێگایەكی گەندەڵ كە پێچەوانەی حەق بێت، جا هەر كاتێك زانا و دادوەر حەزیان لە پلە وپایە و دەسەڵات بوو و ڕوویان كردە هەواو ئارەزوات، ئەوە ناگەن بە مەبەستیان مەگەر بە ڕێگایەك نەبێت پێچەوانەی حەق بێت، بە تایبەت ئەگەر بەڵگەیەكی گوماناوی دەست كەوێ، ئەوكات ئارەزوات وای لێدەكات ئەو گومانەی بكات بە بەڵگەی كارەكەی بۆیە هەوا و ئارەزوات وای لێدەكات ڕاستی لێ وون بێت، ئەگەر چی لە ڕاستیدا حەق ڕوون و ئاشكرایە هیچ گوومانی تیا نیە، بەڵام چاوی بەرانبەر بە حەق كوێرە بووە بۆیە پشتی تێكردووە، لەگەڵ ئەوەشدا لە دڵی خۆیدا دەڵێت: دەی دەی تەوبەیەك دەكەم خوا لێم خۆش دەبێت!! خوای گەورە دەربارەی ئەوانە و وێنەی ئەوانەش دەفـەرمووێ: ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٞ وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا وَإِن يَأۡتِهِمۡ عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُۚ أَلَمۡ يُؤۡخَذۡ عَلَيۡهِم مِّيثَٰقُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّ وَدَرَسُواْ مَا فِيهِۗ وَٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾ (الاعراف: ١٦٩). واتـە: جێ نشینانێكی بەدفەڕ هاتنە جێگایان، كتێبەكەی خوایان بەمیراتی وەرگرت، ئەوانە پەلاماری كەل و پەلی حەرامی ئەم دنیایەیان داوە و دەشیان گوت: خوا لێمان دەبورێت، ئەگەر دیسانیش لە شتێك دەستیان گیربایە وەریان دەگرت، باشە ئایا ئەوانە لەو كتێبەدا پەیمانیان لێ وەرنەگیراوە كە بەناوی

خواوە شتێك نەڵێن جگە لە حەق؟ خۆ هەرچی لەو کتێبەدا هەیە ئەوانە خوێندیانۆتەوە و دەیزانن!!

خوای گەورە لێرەدا ئـەوە ڕوون دەکاتـەوە کـە ئەوانـە ڕوویـان کردۆتـە حـەرامی دنیا، لە کاتێکدا کە دەیانزانیش لێیان حـەرام کـراوە، دەشـیان گـووت: خـوا لێمـان خۆش دەبێت.

بەڵکو ئەوانە سوور بـوون لەسـەر حـەرام، هـەرکاتێکیش چـەنگیان بکەوتایـە بـە تامەزرۆییەوە دەیان لۆشی، جا کاتێـك ئـەم کارەیـان ئەنجامـدەدا دەشـیان گـووت: ئەمە حوکمی خوایە و دینی خوایە خوا فەرمانی پیّ کردووین.

کەچی دەشیانزانی حوکم و دینی خوا پێچەوانەی ئەم کارانەی ئەوانە، یان جاری وا هەبوو دەیان گووت: ئـەم کارانـە حەڵاڵـە بـەبیّ ئـەوەی هیـچی لـیّ بـزانن بـەناوی خـواوە قـسەیان دەکـرد، بـەڵام ئەوانـەی لـە خـوا ترسـن دەزانـن دوا ڕۆژ چـاکتر و نەبراوەترە لە دنیا، هـەر بۆیـەش هـەواو ئـارەزوات و سـەروەت و سامانی دنیـا وای لێنەدەکردن دوا ڕۆژ لە بیربکەن.

جا بۆ ئـەوەی مـرۆڤ سـەرفراز بێـت پێویـستە دەسـت بـە قورئـان و سـوونەتەوە بگرێت و پشت بە نوێژ و ئارامگرتنـەوە بگرێـت، بڕوانێتـە کـەمی دنیـا و زوو لـە نـاو چوونی، وە بڕوانێتە بەردەوامی دوا ڕۆژ و پێش هاتنی.

ئائەمە دەردێکە کە تووشی زانایان دەبێت، ئەگەر ڕوو بکەنە دنیا و شوێنی سەروەت و سامان و هەواو ئارەزوویان بکەون، ئەم ئایەتەش باسی ئەوان دەکات تاکو دەگاتە ئێـرە: ﴿وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ أَفَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿١٧٤﴾ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ﴾ (الاعراف:١٧٥ ـ ١٧٦). واتـە: ـ ئەی محمد ـ

هەواڵی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەوە کە فەرمانی خۆمان پێبەخشی بوو، کەچی ئەو خۆی لێ داماڵی و خۆی لێ دوورە پەرێز گرت، ئەوسا ئیتر شەیتان شوێنی کەوت و دایە پێش و چووە ڕێزی سەر لێشێواوان، خۆ ئەگەر بمانویستایە ئەوە بەو ئایەت و فەرمانانە بەرزمان دەکردەوە، بەڵام ئەو خۆی چەسپان بەزەویەوەو شوێنی هەواو ئارەزووی خۆی کەوت، جا نموونەی ئەو جۆرە کەسانە وەکو نموونەی سەگ وایە ئەگەر دەری بکەیت و پیایدا هەڵبشخێیت هەناسە برکێیەتی، زمان دەردەکێشێت یاخود ئەگەر وازی لێبهێنیت ئەوە هەر هەناسە برکێیەتی.

ئەمە نموونەی زانای خراپــە کە کــار بە زانستەکەی ناکات، بڕوانــە ئـەم ئایەتـە لە چەند ڕووەوە سەرزەنشتی زانای خراپ دەکات:

یەکەم: دوای ئەوەی زانستی بـە ئیـسلام بـوو ئینجـا پـشتی تێکـرد و گومڕابـوو، کوفری بەسەر ئیماندا هەڵبژارد نەك بەنەفامیەوە، بەڵکو بەعەمدی.

دووەم: بەشێوەیەکی وا پشتی لە ئیمـان کـردووە کـە جـارێکی تـر نەگەڕێیتــەوە سەری، هەر وەك چۆن مار لەکیفکەی دەردەچـێت ئـەویش بەهــەمان شـێوە، ئەگـەر ئومێدی تیامابایە ئەوە بەم شێوە لە ئیسلام دەرچوو.

سێیەم: شەیتان گەیشت پێی کە وەك نێچیرێك ڕاوی کرد.

چوارەم: دوای ئەوەی حەقی دۆزیەوە ئینجا گومڕابوو،واتە: گومڕابوو لەزانست و نیەت، کە دەکاتە بەفەساد چوونی نیەت و کردەوەکان، بەفەساد چـوونی زانـست و بیرو باوەری.

پێنجەم: خوای گەورە نەیدەویست بەزانست بەرزی بکاتــەوە کـە ببێـت بـە هـۆی تیاچوونی، چـونکە ئەگـەر رای نەپــەڕێنێت دەبێـت بەسـزا بـۆی، ئەگـەر بێتـوو زانـا نەبایە چاکتر بوو بۆی و سزای کەم تر دەبوو.

شەشەم: خوای گەورە گەمژەیی ئەو ڕووندەکاتەوە، کە بێ نرخی لەسـەربەنرخ و بەرزی هەڵبژارد.

حەوتەم: جا کە بێ نرخەکەی هەڵبژاردووە وانەبێت بە تەنها فکرێك یان قسەیەك بێت، بەڵکو ئەو ڕووی کردۆتە دنیا و کردوویەتیە بارەگای خۆی، چونکە بنچینەی مانای (إخلاد) واتە: مانەوەی بەردەوام لە شوێنێك، هەر وەك ئەوە وایە گوترابێت: ڕووی کردە زەوی، لەو بارەیەوە دەگووترێ: فلان کەس لەم شوێنەدا دەمێنێتەوە ئەگەر لەوێ مایەوە.

هەشتەم: وازی لە هیدایەتی خوا هێناوە ڕووی کردۆتە هەواو ئارەزوی خۆی، هەوا و ئارەزووی کردۆتە پێشەوای خۆی و شوێنی کەوتووە.

نۆیەم: خوای گەورە بە سەگی چواندووە کە بێ نرخترین ئاژەڵە، نەفس نزمترین ئاژەڵە، چاو چنۆك ترین ئاژەڵە بۆیە ناوبراوە بە سەگ.

دەیەم: تامەزرۆ و بێ ئارام بوونی لەسەر دنیا، خوای گەورە چواندوویەتی بە هەناسەبڕکێ و هانکە هانکی سەگ لەکاتی دەرکردنی و وازلێهێنانی، بەهەمان شێوەش ئەو کەسەش ئەگەر وازی لێبهێندرێت هانکە هانکیەتی بۆ دنیا، ئەگەر ئامۆژگاریشی بکرێ و ڕێی لێ بگیرێت هەر هانکە هانکیەتی بۆ دنیا، بەردەوام تامەزرۆ و هانکە هانکیەتی بۆ دنیا وەکو سەگ.

(ابن قتيبة)ە دەفەرمووێ: هەموو گیان لەبەرێك هانکە هانکیەی پێ دەکەوێت لە کاتی ماندووبوون و تێنوویەتیدا جگە لە سەگ نەبێت کە بەردەوام هانکە هانکیەتی لەکاتی ماندووبوونیەتی و لەکاتی ئیسراحەتدا، لەکاتی تێنوویەتی و لەکاتی تێر ئاویشدا، بۆیە خوای گەورەش نموونەی ئەم کافرەی بەو سەگە هێناوەتەوە کە دەفەرمووێ: ئەگەر ئامۆژگاری بکەی هەر گومڕایە، ئەگەر ئامۆژگاری نەکەی هەر گومڕایە وەکو سەگ، ئەگەر دەری بکەی و ڕاوی بنێیت هانکە هانکیەتی، خۆ ئەگەر لە شوێنی خۆشی لێی گەڕێی هەر هانکە هانکیەتی.

# نموونەی دینداریکی نەزان

دینداری نەزان دەردەکەی نەفامی و بێ ئاگاییە لە دین، جا بۆیە (سفیان)ی کوری (عیینة) و چەندین زانای تریش فەرموویانە: خۆتان بپارێزن لە زانایەکی لە خوا نەترس و فاجر، وە لە دیندارێکی نەزان و بێ ئاگا لە دین، چونکە ئەو دووانە دەردن بۆ خەڵکی، هەرچی دیندارە نەزانەکەیە مرۆڤێکی نەزانە و سوودی زانستی نیە و دەبێتە لەمپەر بۆ زانست، هەرچی زانا خوا نەناسەکەشە خەڵکی سەرگەردان دەکات خوای گەورە نموونە دێنێتەوە و دەفەرمووێ: ﴿كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِى ٱلنَّارِ خَٰلِدَيْنِ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾﴾ (الحشر: ١٦ ـ ١٧). واتـە: وەکو شەیتان، کاتێ کە هانی ئادەمیزاد دەدات لەڕێی خەیاڵ و وەسوەسەوە، پێی دەڵێت: کافربە، جاکاتێك مرۆڤەکە ڕوو لە کوفر دەکات و کافردەبێت، پێی دەڵێت: من بەریم لە تۆ من لە پەروەردگاری جیهانیان دەترسم، بەڵام سەرەنجامی هەردووکیان ئەوەیە کە هەتا هەتایە، لە ئاگردا دەمێننەوە، ئەوەش پاداشتی ستەمکارانە.

خوای گەورە وای داناوە هەر بەندەیەك ڕازی بێـت بـە دنیـا و دڵـی پێیـەوە بەنـد بێت و بێ ئاگا بێت لە ئایەتەکانی خوا و وردنەبێتەوە لێ و کاری پێنەکات، ئەوە بـە هۆی ئەمانەوە تووشی سەرگەردانی دەبێت، هەرگیز ڕازی بوون بە دنیا و بێ ئاگـای لە ئایەتەکانی پەروەردگارە پێکەوە کۆنابنەوە لـە دڵێك، مەگـەر دڵێـك نـەبێت کـە ئیمـانی بـە دوا ڕۆژ نـەبێت و ئومێـدی گەیـشتن بـەخوای نـەبێت، ئەگـەر وانەبایـە و ئیمـانی بـە دوا ڕۆژ هەبایـە ئـەوە هـەرگیز بـە دنیـا ڕازی نـەدەبوو، پشتیـشی لـە ئایەتەکانی خوا نەدەکرد.

ئەگەر بڕوانیە گوزەرانی خەڵکی دەبینی زۆرینەی خەڵکی ئەوانەن کە سەرقاڵن بە دنیاوە، کەچی ئەوانەی سەرقاڵی ئاخیرەتن زۆر کەمن، ئەوانەی سەرقاڵی ئاخیرەتن لە ناو خەڵکی نامۆ دیارن، ئەوان حاڵێکیان هەیە خەڵکیش حاڵێکی تر، ئەوان زانست و بۆچونێکیان هەیە خەڵکی بۆچوون و زانستێکی تر، ئەوان کارێك دەکەن و خەڵکیش کارێکی تر، ئەوان لەسەر ڕێبازێکن خەڵکی لەسەر ڕێبازێکی تر، ئەوان لە دۆڵێکن خەڵکی لە دۆڵێکی تردان، خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّوا۟ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾ (یونس:٧ـ٨)، واتـە: بەڕاستی ئەوانەی بەتەمای ئامادەبوونی بەر بارەگای ئێمە نین و ڕازی بوون بە ژیانی ئەم دنیایە و دڵیان پێیەوە بەندە، ئەوانە بێ ئاگان لە ئایەت و دروست کراوەکانی ئێمە، ئا ئەوانە شوێن و جێگەیان ئاگرە بەهۆی ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.

پاشان باسـی چارەنووسـی کەسـانێك دەکـات کە پێچەوانەی ئـەو گرۆهـەی کـە دەفـــــەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْ ۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾ (یـونس: ٩)، واتــە: بێگومـان ئەوانـەی کە باوەڕیان هێناوەو کاروکردەوەچاکەکانیان ئەنجامداوە پەروەردگاریان هیدایەت و ڕێنموونیـان دەکـات، لـەو جیهانیـشدا لـەناو بەهەشـتە جـۆراو جـۆرە پـڕ لـە نـازو نیعمەتەکاندا چەندەها ڕووبار بە بەردەمیاندا دەڕوات.

ئا ئەوانە ئیمان بوونیان بە ئامادەبوونی بەر بارەگای خـوا ناهێڵێـت ڕازی بـن بـە دنیا و دڵی پێـوە پەیوەسـت بکـەن، ئەوانـە بۆیـە بـەردەوام یـادی ئایەتـەکانی خـوا دەکەن، بەڵێ: ئەوە بەرووبوومی ئیمانە بەدوا ڕۆژ، ئـەوەی پێشووش باسمـان کـرد بەرووبوومی بێ ئاگایی و ئیمان نەبوونە بە خواو دوا ڕۆژ.

# ئیمان و زانست چاکترین شتن

گـەورەترین و پیرۆزتـرین شـت کـە دڵ و دەروون هـەوڵی بـۆ بـدات بـە دەسـتی بهێنێت، وە بەندە پێی بەرز بێتەوە لە دنیا و قیامەت زانست و ئیمانە، هەر بۆیـەش خوای گەورە لە زۆر شوێندا زانست و ئیمانی پێکـەوە لکاندووە وەك دەفـەرمووێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ ۖ فَهَٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ ﴾ (الروم: ٥٦). واتـە: ئەوانەی زانیـست و ئیمانیـان پـێ بەخـشرابوو دەڵـێن: بێگومـان ئێـوە بـە ڕادەی ئـەوەی خـوا بڕیـاری لەسـەر بـووە ماونەتـەوە، تـا ڕۆژی زیندوو بوونەوە.

خوای گەورە لە ئایەتێکی تر دەفـەرمووێ: ﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ﴾ (المجادلة:١١)، واتـە: خوای گەورە ئەوانەی ئیمانیـان هێنـاوە لـە ئێوە و ئەوانەشتان کـە زانـست و زانیاریـان پێـدراوە چـەندەها پلـەو پایـە بـەرزیان دەکاتەوە. ئا ئەمانە چاکترین کەسن کە شیاون پلەی بەرزیان پێبدرێت.

بەڵام زۆرینەی خەڵکی بەهەڵەدا چوونە لە ڕاستەقینەی ئەو زانست و ئیمانەی کە ئاسودەیی و سەربەرزی مرۆڤی پێوەیە بەندە، بەڵکو هەر گرۆهەو وا دەزانێـت ئـەو زانست و ئیمانەی ئەوان لەسەرینە ڕاستە و مرۆڤ پێیان دەگات بە کامەرانی، کەچـی لە ڕاستیدا وانیە، بەڵکو زۆریان نە ئیمانەکەی باسی دەکەن مـرۆڤ کامـەران دەکـات، نە زانستەکەشیان مرۆڤ سـەر بـەرز دەکـات، بـەڵکو بگـرە بـەم کارەیـان ڕێگـاش لـە خۆیـان دەگـرن بـۆ گەیـشتن بـەو زانـست و ئیمانـەی پێغەمبـەرﷺ هێناویـەتی و گەلەکەشـی بـۆ سـەری بـانگکردووە، ئـەو زانـست و ئیمانـەی خـۆی و هـاوەڵانی و ئەوانەی دوای ئەوانیش لەسەری بوونە.

هەموو گرۆهێکیش بڕوای وایە کە ئەو زانـست و بۆچـونانەی لای ئەوانـە ڕاسـتە و پێـی دڵخۆشن هەر وەك خوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ فَتَقَطَّعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا ۖ كُلُّ

حِزْبِۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾ (المؤمنـون:٥٣). واتـــە: زۆربـــەی خـــەڵکی بـیر و بۆچـونی خۆیان بەش بەش و پارچـە پارچـە کـرد، هـەموو گرۆهێك و حـزبێکیش بـە ڕێبـاز و حزبەکەی خۆی دەنازێت و بە باشی دەزانێت.

زۆربەی لەوەی کـە ئـەوان نـاوی دەبـەن بـە زانـست قـسەی گـەورە و بۆچـوون و درۆیە، کەچی لە ڕاستیدا زانست قسەی گەورە نیە، هەر وەك (حماد)ی کوری (زید) دەفـەرمووێ: بە(ایوب)م گوت: ئایا لەم سەردەمە زانست زۆرترە یان پێشتر زانـست زۆرتر بوو؟ لەوەڵامدا فەرمووی: لەم سەردەمە قسە زۆر بووە، بەڵام پێـشتر زانـست زۆرتر بوو! بڕوانـە چۆن ئەم زانا لێهاتووە زانست و قسەی لێك جیا کردۆتەوە.

بەڵـێ: وایـە کتێـب زۆر بـووە، قـسە زۆر بـووە، مـشتومڕ و بۆچـوون زۆر بـووە، کەچی زانست زۆربەی ئەمانەی هەر لەگەڵدا نیە، بەڵکو زانست ئەوەیە کە پێغەمبـەر لەلایەن خواوە هێناویەتی بۆ گەلەکەی.

کاتێك سەردەمی ئەم زانستە پاکـە دوور کەوتـەوە، خـەڵکی هـەر بـیرو ڕایـەکیان بەهێزردا دەهات وەریان دەگرت و دەیان کرد بە زانست و کتێبێکیان لەسەر دادەنـا و خۆیان پێوە خەریك دەکرد و کاتیان پێ بە فیڕۆ دەدا، پـەڕاوەکانیان بـەم شـتانە پڕدەکردەوە، دڵەکانیشیان بەم شتانە ڕەش دەکرد، ئەمە شـەیتان لـە بـن گوێیـانی چرپاندوە و لە نێوانیان بڵاوەی پێ کردووە تـاکو سـەرگەردانیان بکـات، جـا دڵیـان دادەماڵدریت لە زانست و ئیمان، وەکو مار کە چۆن خۆی دادەماڵێت لە پێستەکەی، وەکو پۆشاك چۆن لەبەر دەکرێتەوە.

(ابن القیم) دەفـەرمووێ: هێندێ لـە هاوڕێکـانم پێیـان ڕاگەیانـدم کـە هێنـدێ لـە شوێنکەوتووی قوتابی ئەوانەی کە بەم شـێوە سـەرگەردان بوونـە، سـەرقاڵی لەبـەر کردنی کتێبی مامۆستاکانی بووە و لەبەرکردنی قورئانی پـشت گـوێ خـستووە، جـا کـە پێیـان گوتـووە: کاکـە گیـان سـەرەتا قورئـان لەبـەر بکـەیت باشـتر نیـە لـەم کتێبانە؟! لە وەڵامدا گوتیەتی: بۆ زانست و زانیاری لە قورئانـدا هەیـە! هێنـدی لـە

پێشەوایانی ئەوانە پێیان گوتم: ئێمە گوێ بۆ حەدیس دەگرین مەبەستمان زانست و زانیـاری لێ وەرگرتنـی نیـە، بـەڵکو بـۆ بەرەکـەت گـوێی بـۆ دەگـرین، چـونکە ئێمـە توێشووی زانایانی خۆمان بەسە جا بۆیە ئێمە کۆلەگەمان ئەوەیـە کـە ئـەوان تێـی گەیشتوون و بڕیاریان لەسەر داوە.

جارێکیان شێخەکەمان باسی ئەوانەی بۆ کردم و پێی گووتم: ئەوانە گـەڕاوون لـە نـاو بیروڕاکـان کامـەی بێهێـزە و مەرامـەکانیان جـێ بـەجێ دەکـات ئـەوانیان هەڵبـژاردووە، بەڵگـەش لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەو ڕێگایـەی دەسـتیان پێوەگرتـووە پوچەڵـە، ئەوەیە کە دەبینی بۆچوونەکانیان پڕیەتی لـە ئیختلاف وە هێنـدێ ڕایـان دژی یەکترییـــە، خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا﴾ (النساء:۸۲). واتـە: ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن کەسێکی تـرەوە بوایە جگە لە خوا بێگومان جیاوازی و دژایەتیەکی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە.

ئائەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر شتێك لەلایەن خواوە بێت ئیختلاف تیا نابێت، بەڵام ئەوەی ئیختلاف تیایە و دژایەتی یـەکتری تیایـە، ڕێـك نیـە لەگـەڵ ئـەوەی لای خوایە، چۆن دەکرێت بۆچوون و خـەیاڵات بکرێـت بـەدین و خـەڵکی دینـداری پێـوە بکات، حوکمیش بدا بەوەی کە ڕاستە و خوا و پێغەمبەر پێی ڕازیە، پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە بەڕاستی ئەوە بوختانێکی گەورەیە.

بەڕاستی زانستی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ کە یەکتریان پێ ئامۆژگاری دەکرد، ئەو زاستە نەبوو کە ئەو سەرگەردان و درۆزنانە پێیەوە سەرقاڵن هـەر وەك (الحـاكم) لـە ژیـان نامـەی (أبـي عبـدالله البخـاري)دا دەگێڕێتـەوە و دەفـەرمووێ: هـاوەڵانی پێغەمبـەرﷺ کاتێـك کۆدەبوونـەوە بـە قورئـانی پـەروەردگاریان و سـوونەتی پێغەمبەرەکەیان ئامۆژگاری یەکتریان دەکرد.

# ئەو ئیمانەی خوا و پێغەمبەر دەیانەوێت

دەبینین زۆرینەی خەڵکی یان هەر هەموو خـەڵکی بانگهێـشتی ئـەوە دەکـەن کـە ئیماندارن، بەڵام لە ڕاستیدا زۆربەی خەڵکی ئیمانێکی تەسکیان هەیە، بەڵام ئیمـانی فراوان ئەو ئیمانەیە کە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی بـۆ گەلەکـەی، ناسـینی خـوا و دان پێنانی و خۆشویستنی و ناسینی ئەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشە و لێی توورەیە، ئا ئەمە ئەو ئیمانە ڕاسـتەقینەیە کـە پێغەمبـەرﷺ لەسـەری بـووە و بـە گەلەکـەی ڕاگەیاندووە، ئا ئەو ئیمانە ئیمانی گرۆهی ڕاستگۆیانە.

لەلای زۆربەی خەڵکی وادەزانن ئیمان دان هێنانە بە بوونی دروست کارێك، هـەر ئەویش تەنهایە و ئاسمانەکان و زەوی و ئـەوەی لـە نێوانیاندایـە دروسـتی کـردووە، بەڵام ئیمانی کامڵ ئەوەندە نیە بەتەنها چونکە بـت پەرسـتەکانی (قـریش)یـش ئـەم ئیمانەیان هەبووە، کەواتـە بەمە ناگووترێ ئیمان.

لەلای هێندێ خەڵکی تریشدا وادەزانن ئیمان تەنها ووتنی شەهادەی ـ اشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمد رسول الله ـ جا کاری لەگەڵدا بێت یان نـا بـە دڵ بێـت یـان پێچەوانەی دڵ بێت.

لەلای هێندێ خەڵکی تریشدا وادەزانن ئیمان تـەنها ئەوەیـە مـرۆڤ بـە دڵ ئیمـانی هەبێت کە خـوا دروسـت کـراوی ئاسمانـەکان و زەویـە و (محمـد)یـش ﷺ بەنـدە و نێردراوی خوایە، ئەگەر بە زمانیش نـەیڵێت و کاریـشی پـێ نـەکات قـەیناکا، بـەڵکو ئەگەر جنێویش بە خوا و پێغەمبەرﷺ بدات و هـەموو گونـاهێکی گـەورەش بکـات، تەنها ئیمانی بە خوا و پێغەمبەر هەبێت ئەوە ئیمانداره.

لـەلای هێنـدێ خـەڵکی تـریش وادەزانـن ئیمـان تـەنها دان هێنانـە بەسـیفاتە بەرزەکانی پەروەردگار وەکو سیفاتی بەرزی عەرش و سیفاتی قسەکردن بە ووشە و سـیفاتی (سمـع)و (بـصر)و (مـشیئة)و (قـدرة) و (إداة)و (حـب)و (بغض) و چـەندین

سیفاتی تریش کە خوا بۆ خۆی باسی کردووە یان پێغەمبەرەکەی باسی کردووە، بەڵکو ئیمان لەلای ئەوانە دان نەهێنانە بەمانە و گوێڕایەڵی کردنی بۆچوونی مامۆستایە گەمژە و نەزان و درۆزنەکانیانە کە ووتەکانیان هێندێکی دژ بەیەکە و یەکتر هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەوانە وەکو ئەوەنە کە ئیمام (عمر)ی کوڕی (الخطاب) و ئیمام (احمد) فەرموویانە: ئیختیلافیان لە قورئاندا هەیە و پێچەوانەی قورئان دەکەن و کۆکن لەسەر وازهێنان لە قورئان.

هێندێ خەڵکی تریش وادەزانن ئیمان تەنها پەرستنی خوایە بە پێی ئارەزوو و هەواو هەوەسی خۆیان، بێ ئەوەی پەیوەست بن بەو فەرمانانەی پێغەمبەرﷺ لەلای خواوە هێناویەتی.

هێندێ خەڵکی تریش وادەزانن ئیمان تەنها ئەنجامدانی ئەو کارانەیە کە باوك و باپیرانی و پێشینەی ئەوان ئەنجامیان داوە جا چۆن و کێ بێت ئەوە باس نیە، بەڵکو ئیمانیان لەسەر دوو شت دامەزراوە:

یەکەم: ئەوە پێشینەیە و باو باپیرانمان وایان گوتووە ئێمەش ئەنجامی دەدەین.

دووەم: هەر ئەوەی ئەوانیش گوتیانە ڕاستە و هیچی تر.

هێندێ خەڵکی تریش وادەزانن ئیمان تەنهاڕەوشت جوانیی و هەڵسوکەوتی چاکو ڕووی خۆش و گومانی چاکە بردن بە خەڵکی و دوور کەوتنەوە لە بێئاگای خەڵکییە.

هێندێ خەڵکی تریش وادەزانن ئیمان تەنها خۆداماڵینە لە دنیا و دەرکردنی دنیایە لە دڵ و زهد کردنی دنیایە، جا ئەوانە هەر کاتێك کەسێکیان بینی بەم شێوەیە بوو ئەوە بە ئیماندارێکی مەزنی دەزانن ئەگەر چی زانست و کردەوەشی نەبێت.

ئائەمانە هەر هەموویان ئیمانی ڕاستەقینەیان نەناسیوە و شوێنی نەکەوتوون و چەنگیان نەکەوتووە، ئەوانەی ڕابران چەند جۆرێکن: هێندێکیان ئیمانەکەیان دژی ئیمانی ڕاستەقینەیە، هێندێکیان ئیمانەکەیان هەر بە ئیمان ناژمێردرێت، هێندێکیان

ئیمانەکەیان مەرجی ئیمانە بە تەنها بەوە نەگەیشتوونە بە ئیمان، هیندێکیشیان مەرجیان داناوە بۆ گەیشتن بە ئیمان کەچی مەرجەکان هەڵوەشێنەرەوە و دژی ئیمانە، هێندێکیشیان مەرجیان داناوە بۆ گەیشتن بە ئیمان کە هەر پەیوەندی بە ئیمانەوە نیە.

لە راستیدا ئیمان دوورە لەمانە بەڵکو ئیمانی ڕاستەقینە تێکەڵە لە ناسینی ئەو شتانەی کە پێغەمبەرﷺ لە لایەن خواوە هێناویەتی، جا بە دڵ ئیمانی پێی هەبێت و بەزمانیش دانی پێدا بهێنێت و بەخۆشەویستی دڵیشیەوە ملکەچی بێت، بە دڵ و لاشە کاری پێبکات، بەپێی توانا جێبەجێی بکات و بانگەوازی بۆ بکات.

بەڵێ: ئیمانی ڕاستەقینەی مرۆڤی ئیماندار ئەوەیە کە خەڵکی لە ڕاهی خوا خۆش بووێت، ڕق لێبوونەوەی لە ڕاهی خوا بێت، لە ڕای خوا ببەخشێ و لە ڕاهی خوا نەبەخشێ، وە بەتەنها خوای گەورە بپەرستێ و ملی بۆ کەچ بکات، مرۆڤ ئەگەر بیەوێت بگات بەو ئیمانە ڕاستەقینەیە دەبێت بە دڵ و لاشە تەنها شوێنی پێغەمبەری خوا بکەوێتﷺ دەبێت چاوی دڵی بنوقێنێت لە ئاوڕدانەوە بۆ کەسانی تر جگە لە خوا و پێغەمبەری خوا.

# چەند ئامۆژگاریەکی زێڕین

بێگومان هەر کەسێك بیەوێت دەست لە شتێ هەڵگرێ کە خووی پێوە گرتووە ئەوە زۆر بۆی ئاستەمە و ناتوانێت، چونکە لەبەر خاتری خوا وازی لێ ناهێنێت، بەڵام ئەو کەسەی بە دڵێکی ساف و لەبەر خاتری خوا وازی لێدەهێنێت، ئەوە زۆر بە ئاسانی دەستی لێ هەڵدەگرێت، تەنها یەکەمجار ماندوو دەبێت ئەمەش تاقی کردنەوەی خوای گەورەیە تاکو دەردەکەوێت ئایا ڕاست دەکات یان درۆ دەکات، جا ئەگەر یەکەمجار کەمێك ئارامی گرت لەسەر ئەم ئازارە ئەوە کامەران دەبێت.

(ابن سيرين) دەفەرمووێ: گوێم لە (شريح)بوو سوێندی دەخوارد دەیووت: هەر بەندەیەك واز لە شتێك بهێنێت لەبەر خاتری خوای گەورە، ئەوە بێگومان خوای گەورە شوێنەکەی بۆ پڕ دەکاتەوە.

کە گووتوویانە: (من ترك لله شيئا عوضه الله خيرا منه) واتـە: هەر کەسێك واز لە شتێك بهێنێت لەبەر خاتری خوای گەورە، ئەوە خوای گەورە لەو شتە چاکتری پێ دەبەخشێ.

بەڕاستی ئەوە ڕاستە(عوض) واتـە: پێدانی شتێکی تر، چەند جۆری هەیە، بەنرخترین و چاکترینیان کە خوا لە بری ئەو شتەی وازی لێهێناوە پێی ببەخشێ، خۆشەویستی و هۆگر بوونە بەخواوە، دڵ ئارام بوونە بەخوا، هێز و ئاسوودەیی و ڕەزامەندی پەروەردگارە.

* بێگومان گەوجترین کەس ئەوەیە کە نزیکە لە گەشتەکەیدا بگاتە شوێنی مەبەست لەوکاتەدا ڕێگاکەی لێ وون بێت.

* ئەو عەقڵانەی سەرکەوتوونە وادەبینن ئەو پەیامە کە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی ڕاست و دروستە و ڕێکە لەگەڵ عەقڵ و حیکمەت، بەڵام ئەو عەقڵانەی سەرگەردانن

وا دەبینن ئەو پەیامەی پێغەمبەرﷺ هێناویەتی ڕێك نیە لەگەڵ عەقڵ و حیکمەت.

* نزیکترین هۆکار بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خودا سێ ڕێگایە:

١. پەیوەست بوونە بە سوونەتەکانی پێغەمبەر و کار پێکردنیەتی بە دڵ و لاشە.

٢. بەردەوام خۆی بە زلیل و ئاتاج بزانێت بەرانبەر بە خوا.

٣. هەموو کاروکردەوەکانی تەنها بۆ خوابێت و مەبەستی تەنها خوا بێت.

جا هەر کەسێك بیەوێت بگات بە ڕەزامەندی خـوا تـەنها بـەم سـێ ڕێگایــە، هـەر کەسێکیش نەگات بەڕەزامەنی خوا ئەوا دابڕاوە لەم سێ ڕێگایە یان لە یەکێکیان.

* ئەو بنچینانەی کامەرانی مرۆڤـی پێـوە بەنـدە سـێ بنـچینەیە، هـەر یـەك لـەو سێیانەش دژی خۆی هەیە، جا هەر کەسێك یەکێك لەو بنچینانەی لە دەست بـچێت ئەوە تووشی دژەکەی دەبێت.

١. یەکتاپەرستی، دژەکەشی شەریك دانانە بۆ خوا.

٢. سوونەت، دژەکەشی بیدعەیە.

٣. گوێ ڕایەڵی خوا. دژەکەشی بێ فەرمانی خوایە.

ئەم سیانەش هەموو یەك دژیان هەیە: ئەویش دڵ پەیوەست نە بوونـە بـە خـوا و بە بەهەشتی خوا، وە نەترسانە لە خوا و نە ترسانە لە دۆزەخ.

# ڕێبازی ئیمانداران و ڕێبازی تاوانباران

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموویٚ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ (الانعام:٥٥)، واتـە: بەهەمان شێوەش بە درێژی ئایەتـەکانیان بۆ شـی دەکەینەوە تاکو ڕێبازی تاوانبارانیان بۆ ڕوون بێتەوە.

خوای گەورە لـە ئایـەتێکی تـر دەفـەرمووێ: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ﴾ (النساء: ١١٥). واتــە: هـەر کەسێك دوژمنایەتی پێغەمبەر ﷺ بکات و لێی جیابێتەوە لە دوای ئەوەی ڕێگـەی ڕاست و دروستی بۆ ڕوون بۆوە، ئینجا ڕێبازێك بگرێتە بـەر کـە جیابێـت لـە ڕێگـە و ڕێبـازی ئیمانـداران ئـەوە ڕووی وەردەچـەرخێنین بـۆ ئـەو ڕێگـەو بەرنامـەی هەڵیبژاردووە و ڕووی تێکردووە.

خوای گەورە لە قورئاندا بە درێژی ڕێبازی ئیماندرانی ڕوون کردۆتەوە، بە هەمان شێوە بە درێژیش ڕێبازی تاوانبارانی ڕوون کردۆتەوە چارەنووسی هـەردوو لاشیانی ڕوون کردۆتـــەوە، کـاروکردەوەی هـــەردوو لاشـیانی ڕوون کردۆتـــەوە، دۆســـتانی ئیمانداران و دۆستانی تاوانبارانی ڕوون کردۆتەوە، هۆکاری سـەرفرازی ئیمانـداران و سەرگەردانی تاوانبارانیشی ڕوون کردۆتەوە، بـەم شـێوە خـوای گـەورە لـە قورئانـدا ئەو دوو ڕێبازەی بە جوانی ڕۆشن کردۆتەوە، تاکو بۆ خـەڵکی ڕوشـن بێتـەوە وەکـو ڕووناکی و تاریکی، ئەوانەی زانان بە خوا و قورئان و دینی خوا، بە درێـژی ڕێبـازی ئیمانداران و تاوانباران دەناسن، هەردوو ڕێبازەکەیان بـۆ ڕۆشـن بۆتـەوە، هـەر وەك ئـەو کەسـە بـۆی ڕوون بۆتـەوە کـە ڕێگەیـەك دەگرێتـە بـەر بـۆ ئـەو شـوێنەی کـە مەبەستیەتی.

جا ئەوانە چاکترین و زاناترین کەسن بۆ خەڵکی کە ئامۆژگاریان دەکەن و ڕێگای ڕاست بە خەڵکی نیشان دەدەن، هەر بەمەش بوو هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ چاکترین کەس بوون، لەهەموو ئەوانەی لە دوایان دێن تاکو ڕۆژی قیامەت، چونکە ئەوان لە ناو گومڕایی و کوفرو شیرك و سەرلێشێواویدا ژیابوون، بەدرێژی ئەمەیان ناسی بوو، جا پاشان پێغەمبەرﷺ هاتوو دەری هێنان لە ناو سەرگەردانی و تاریکایی بۆ سەر ڕێگای ڕاست و هیدایەت، دەری هێنان لە تاریکایی بۆ ڕووناکی، لە شیرك بۆ یەکخواناسی، لە نەفامی بۆ زانین و زانیاری، لەسەرگەردانی بۆ سەرفرازی، لە ستەمکاری بۆ دادپەروەری، لەسەر لێشێواوی و کوێری بۆ هیدایەت و چاوساغی، چونکە ئەوان دەیانزانی کاتی خۆی چەندە سەر لێشێواو و گومڕا بوونە، کەچی ئێستا لە چ خۆشی و کامەرانیەك دانە.

کەوابوو: بە شتی خراپ پێچەوانەکەی پێ دەناسرێت کە چاکەیە، چونکە شت بە پێچەوانەکەی ڕۆشن دەبێتەوە و دەناسرێت. گەر وابوو زیاتر تامەزرۆ و خۆشەویستی ئەو شتەیان دەکەوێتە دڵ کە بۆی هاتوون، وە زیاتر لەوەی پێشتر هەڵدێن و ڕقیان لێدەبێتەوە، ئەوانە بە خواناسی و ئیمان و ئیسلامیان زۆر لەلا خۆشەویستە، زۆر ڕقیشیان لە پێچەوانەکەیەتی چونکە ئەوان زانان بەم ڕێبازە.

بەڵام ئەوانەی دوای هاوەڵان سەریان هەڵدا، هێندێکیان لە ناو ئیسلامدا گەورەبوون بۆیە خراپەیان بە چاکی نەدەناسی، هێندێ شتی ڕێبازی ئیماندارانیان لێ تێکەڵ بوو لەگەڵ ڕێبازی تاوانباران، چونکە مرۆڤ کاتێك شتی لێ تێکەڵ دەبێت ئەگەر بە چاکی هەردوو ڕێبازەکە نەناسێت یان یەکیان نەناسێت، هەر وەك (عمر)ی کوڕی (الخطاب) دەفەرمووێ: کەسێك لە ناو ئیسلامدا گەورەبوبێت و سەرگەردانی و نەفامیش نەناسێت بێگومان ڕاستی ئیسلامەتیەکەی بەرە بەرە لێ کاڵدەبێتەوە.

بەڵێ: ئەمە نیشانەی پلە بەرزی زانستی (عمر)ە (رضي الله عنه) چونکە ئەگەر گومڕایی و نەفامی نەناسێت کە ئەو شتانە دەگرێتەوە پێچەوانەی پەیامی پێغەمبەرە ئەوکات چۆن دەتوانێت خۆی لێ بپارێزێت، جا هەرشتێك پێچەوانەی ئەو پەیامە بێت کە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی ئەوە پێی دەگوترێت نەفامی.

هەر کەسێك ڕێبـازی تاوانبـاران نەناسێت و بـۆی ڕۆشـن نەبووبێتـەوە، دوورنیـە هێندێ شتی ڕێبازی تاوانباران بەهی ئیمانداران بزانێت، هەر وەك دەبینین زۆر شتی تاوانبـاران و کـافران و دووژمنـانی پێغەمبـەران لـە بـواری بیروبـاوەڕدا و زانـست و کـاروکردەوەدا تێکـەڵی ئومـەتی ئیسلام بـووە، کـە هێنـدێ کەسـی نـەفام و نـەزان تێکەڵیان کردوە لەگـەڵ ڕێبـازی ئیمانـداران کـە وایـان زانیـوە ئەوانـە پەیوسـتە بـە ڕێبـازی ئیماندارانـەوە، هێنـدێ شـتیان حـەڵاڵ کـردووە کـە خـواو پێغەمبـەرﷺ حـەرامیان کـردووە، هـەر وەك زۆربـەی بیدعەچـیەکان تووشـی ئەمـە بوونـە کـە بیدعەیەك دادێنن ئینجا بانگەوازیشی بۆ دەکەن کەسێکیش پێچەوانەی بکات کافری دەکەن.

## خەڵکی لەو باوەڕەدا چوار جۆرن:

گرۆهی یەکەم: ئەوانەن کـە ڕێبازی ئیمانداران و ڕێبازی تاوانبارانیـان بـە درێـژی بۆ ڕۆشن بۆتەوە بە زانست و کردەوە، ئەوانە زاناترین کەسن.

گرۆهی دووەم: ئەوانەن کە چاویان کوێرە لـە بەرانبـەر هـەردوو ڕێبازەکـە وەکـو وێنەی ئاژەڵ وان، ئەوانەش بە ڕێبازی تاوانباران دەژمێردرێن.

گرۆهی سێیەم: گیانی خۆی سـەرف دەکـات بـۆ ناسـینی ڕێبـازی ئیمانـداران بـە کورتیش پێچەوانەکەی دەناسێت، دەزانێت هەر شتێك پێچەوانەی ڕێبازی ئیمانداران بێت ئەوە پوچەڵە ئەگەرچی بەدرێژیش نەیزانێت، بەڵکو هەر کاتێك گوێی لە شتێك بێت کـە پێـچەوانەی ڕێبـازی ئیمانـداران بێـت یەکسەر گـوێی لادەبـا و گـوێی بـۆ ناگرێت، خۆی سەرقاڵ ناکات بزانێت مانای چیە و تێی بگـات، یـان لێـی بکۆڵێتـەوە بزانێت بۆ خراپە تاکو گوێی بۆ بگرێت.

بە پێچەوانەی گرۆهی یەکەم، چونکە ئەوان ئارەزووات دەناسن، وە نەفسیـشیان بۆی دەچێت بـەڵام بەربـەرەکانێی نەفـسی خۆیـان دەکـەن و لـە پێنـاوی خـوا وازی لێدێنن.

کاتی خۆی لەم بارەیەوە نامەیەکیان بۆ ئیمامی (عمر)ی کوڕی الخطاب نووسی و پرسیاریان لێکرد، کامیان چاکترە: پیاوێك کـە ئـارەزووات بـە خـەیاڵیا نایـەت، یـان پیاوێـك ئـارەزووات بـە خـەیاڵیـدا دێـت کەچـی بەربـەرەکانێی لەگەڵـدا دەکـات و لـە پێناوی خـوا وازی لـێ دەهێنێـت؟ لـە وەڵامـدا ئیمـامی (عمـر) نووسـی: ئـەوەی کـە نەفسی حـەز لـە ئـارەزووات و گونـاه دەکـات بـەڵام ئـەو لـە پێنـاوی خـوا وازی لـێ دەهێنێت لەو جۆرەیە کە خوای گەورە دەربارەیـان دەفــەرمووێ: ﴿ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ (الحجرات: ٣). واتــە: ئەوانـە ئـەو کەسـانەن کـە خـوا دڵـەکانیانی تـاقی کردۆتـەوە بـە تـەقوا، ئەوانـە لێ خۆشـبوون و پاداشـتی گەورەیان بۆ ئامادەیە.

ئـەو کەسـەش بـە هـەمان شـێوە فـەزڵی هەیـە کـە بیدعـە و شـیرك و ناحـەق و ڕێچکەکانی بناسێت، ئینجا لە ڕای خوا ڕقی لێبێتەوە و خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوە و خـۆی لێ بـەدوور بگرێـت و نـەهێڵێت ئیمانەکـەی شـەلۆق بکـات و گومـان لـە دڵیـدا بمێنێت، بەڵکو بە ناسینی ناحەق چاکترە حەق بناسێت و خۆشی بوێت، وە چاکترە ڕقی لە ناحەق بێت و لێی دوور کەوێتەوە، ئەمە چاکترە لـەوەی کـە ئـەم شـتانە بـە خەیاڵیدا نایە و بە دڵیدا نایەت، چونکە ئەو مرۆڤە هەر کاتێك ئەو خراپانە بـە دڵیـدا دێت، ئەوە خۆشەویستی بۆ حەق زیاتر دەبێـت و چـاکتر پایـەی حـەق دەناسێت و پێی دڵخۆش دەبێت و ئیمانی پێ بەهێز دەبێـت، هـەر وەك چۆن ئـەو کەسـەی کـە گوناه و ئـارەزووات بـە خـەیاڵیا دێـت زیـاتر سـوور دەبێـت لەسـەر پێچەوانەکەی و حەزی لێدەکات.

هـەرکاتێك خـوای گـەورە بەندەیـەکی بـڕواداری تـاقی بکاتـەوە بـە گونـاه و ئارەزووات، ئەوە بۆ ئەوەیە تاکو خۆشەویستی چاکتر و بە سـوودتر و بـەردەوامتری بۆ فەراهەم بێنێت، تاکو بەندە بەربەرەکانێ لەگەڵ نەفسی خۆیدا بکات بۆ گەیشتن بەم خۆشەویستیە بەرزە. هەرکاتێکیش نەفسی بۆ گونـاه و ئـارەزووات چـوو، ئـەوە تامەزرۆی خۆشەویستیە بەرز و بەردەوامەکـەی تـری لێـی لادەبـات، بـە پێـچەوانەی نەفسێك کە هیچ شتی وای تیا نیە.

ئایا کەسێك کە بەنا و کەندەڵان و درك و بەردا ڕێ دەگرێتە بەر بۆ گەیشتن بە خۆشەویستەکەی بەڕێزتر نیە لەو کەسەی کە تووشی هیچ ئازار نابێت لەسەر پشتی سوارێکی چاك دەگاتە خۆشەویستەکەی؟!

کەسێك کە بە بەربەرەکانێ لەگەڵ نەفسی خۆیدا خۆشەویستی خوا هەڵدەبژێرێت، وەك ئەو کەسە وایە کە بەبێ بەربەرەکانێ خۆشەویستی خوا هەڵدەبژێرێت.

گرۆهی چوارەم: ئەوانەن کە بە درێژی ڕێبازی خراپەکاران و بیدعەچیان و کافران دەناسن، بەڵام بەکورتی ڕێبازی ئیمانداران دەناسن، ئەمانەش حاڵی زۆربەی ئەو کەسانەیە کە برەو بە مەقالات وکتێب و فیکرەی گەلانی بێگانە دەدەن، بە چاکی شارەزاییان لێی هەیە کە بەم جۆرە شارەزایان لەو پەیامە نیە کە پێغەمبەرﷺ هێناویەتی، ئەگەر بڕوانیتە کتێبەکانیان ئەوە بە ڕوون و ئاشکرایی دەبینیت.

بەهەمان شێوەش ئەو کەسەی کە بە درێژی شارەزایە بە خراپە و ستەم و فەساد، ئەگەر تەوبەی کردو گەڕایەوە و ڕووی کردە ڕێگای ڕاست، شارەزای بەو شتانە بە فراوانی نامێنێت بەو شێوەی کە تەمەنی تیا بەفیڕۆدا.

مەبەست لەمانەدا ئەوەیە خوای گەورە حەز دەکات ڕێبازی دووژمنانی بناسرێت تاکو خەڵکی خۆی لێ بپارێزێت و ڕقی لێبێتەوە، هەروەکو چۆن حەز دەکات ڕێبازی دۆستانی بناسرێت تاکو خەڵکی بیگرێتە بەر و خۆشیان بوێت.

کەوابوو: شارەزابوون لەو شتانە سوود و نهێنی زۆری لە خۆ گرتووە تەنها خوا دەیزانێت، لە ناسینی پەروەردگاریەتی خواو حیکمەت و کەمالی ناو و سیفاتەکانی و پەیوەست بوونی بە شوێنی خۆی و شوێنەواری، چونکە ئەمە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر پەروەردگاریەتی و پادشایەتی و خوایەتی و خۆشەویستی و تووڕەیی و پاداشت و سزای خوا، والله اعلم.

# دە شت هەیە هیچ سوودی نیە بۆ مرۆڤ

١. زانستێك كە كاری پێ نەكرێت.

٢. كاروكردەوەیەك ئیخلاصی تیا نەبێت.

٣. سـەروەتو سـامانێك لێـی نەبەخـشرێت كـە خاوەنەكـەی نـە لـە دنیـا لێـی بەهرەوەر دەبێت، نە هیچیشی پێش دەخات بۆ قیامەتی.

٤. دڵێك چۆلبێت لە خۆشەویستی خـوا و تامـەزرۆی گەیـشتن بـە خـوا نـەبێت و هۆگر نەبێت بە خوا.

٥. لاشەیەك كە بەندایەتی خوا نەكات.

٦. خۆشەویستی خوا كە وای لێ نەكات گوێڕایەڵی بكات وڕەزامەنـدی بـە دەسـت بهێنێت.

٧. ئەگـەر كاتێـك مـرۆڤ سـوودو چـاكەی دەسـت كـەوت لـە خزمـەتی دینـی خـوا بەكاری نەهێنێت.

٨. فیكر و بیرێك كە لە شتێك دەگەڕێت سوودی پێناگەیەنێت.

٩. كاركردن بۆ شتێك كە ئەو كارە نزیكت نەكاتەوە لە خوا، چاكسازی دنیاشـت نابێت.

١٠. ترست لە كەسێك بێت و ئومێدت بە كەسێك بێت كە بۆ خۆی نێوچـەوانی بـە دەسـت خوایـە، دیلـی بەردەسـتی خوایـە، كـە زەرەر و قـازانج و مـردن و ژیـان و زیندووبوونەوەی خۆی بە دەست نیە.

ئەمانە هەر هەمووی شتی بێ هوودە و بێ سوودن.

گەورەترین زەرەریش كە مرۆڤ بیكات دووانن كە بنچینەی هەموو زەرەرێكن:

١. إضاعة القلب: دڵ بە فیڕۆدان.

٢. إضاعة الوقت: كات بە فیڕۆدان.

دڵ بە فیرۆدان ئەوەیە دنیا بەسەر دوا ڕۆژدا هەڵبژێریت، کات بـە فیرۆدانـیش دڵ پەیوەست بوون و ئومێدبوونە بە دنیا.

چونکە هەموو خراپەیەك لەو دووانە کۆبۆتـەوە شـوێنکەوتنی دنیـا و ئـارەزووات، ئومێدی نەبڕاوە بە دنیا، چاکەش هەمووی لە دوو شت کۆبۆتەوە:

۱. شوێنکەوتنی هیدایەت و خواناسی.

۲. خۆ ئامادەکردن بۆ قیامەت.

سەیر بۆ ئەو کەسەی کە ئاتاجی شتێك دەبێت هانا بۆ خوا دەبات، کەچـی داوای ژیان و شیفا ناکات بۆ دڵی کـە بـە دەردی نـەفامی و گومـان و ئـارەزووات مـردووە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ دڵی مرد هەست بە گوناه ناکات.

# مرۆڤی ژیـــر

خوای گەورە فەرمانی هەیە فەرمان دەدات بەسەر بەندەکانی، بڕیاریشی هەیە بڕیار دەدات بەسەر بەندەکانی، نیعمەت و بەخششی هەیە نیعمەت دەڕژێنێت لەسەر بەندەکانی، بەندە لەم سیانە دەرناچێت.

(القضاء) واتە: بڕیار دوو جۆرە:

١. (مصائب).

٢. (معائب).

جا خۆشەویسترین کەس لەلای خوای گەورە ئەوەیە کە بە جوانی لە هەموو ئەو بووارانەدا بەندایەتی خوا ئەنجام بدات، جا ئەوە نزیکترین کەسە لە خوای گەورە.

دوورترین کەسیش لە خوای گەورە ئەوەیە کە بەندایەتی خوا ناکات لەو بووارانەدا.

بەندایەتیکردنی خوا لە فەرمانەکانی، ئەوەیە بە ئیخلاصەوە گوێڕایەڵی خوا بکات، شوێنی پێغەمبەرﷺ بکەوێت.

بەندایەتی خوا لە قەدەغەکراوەکانی خۆ پاراستنە لە ترس و گەورەی و خۆشەویستی خوای گەورە.

بەندایەتی کردنی خوا لە (قضاء المصائب)، ئەوەیە بەندە ئارامی لەسەر بگرێت، ئینجا پێشی ڕازی بێت کە ئەم پلەیە بەرزترە لە ئارامگرتنەکە، ئینجا سوپاسی خواش بکات لەسەری کە ئەمە پلەی بەرزترە لە ڕازی بوونەکە.

بەندە کاتێك دەتوانێت بەم شێوە بێت، ئەگەر خۆشەویستی خوای لە دڵدا جێگیر بووبێت و بزانێت خوا هەرچی بۆی پێش بێنێت لە سوودی ئەو دایە، بزانێت کە خوای گەورە بەم کارەساتە چاکەو سۆزی بۆ ئەو دەوێت ئەگەرچی بەندەش کارەساتەکەی پێناخۆش بێت.

بەندایەتی کردنی خوا لە (قضاء المصائب) ئەوەیە بەندە دەست پێشخەر بێت و پەلە بکات بۆ تەوبەکردن و ڕزگاری بێت، ملکەچ بکا و عوزر بێنێتەوە، بزانێت کەس ناتوانێـت ڕزگـاری بکـات و بیپارێزێـت جگــە لــە خــوا، ئەگــەر بــەردەوام بێـت لــە تاوانەکەی دوور دەکەوێتەوە لە دەرگای خوا، جا بۆیـە هەموو پاڵدەداتە لای خـوای گەورە.

پەنادەگرێت بە خوا لە تووڕەیی خوا، پەنا بگرێت بـە لێبـووردنی خـوا لـە سـزای خوا، هەر هاناو پەنا بۆ خوا بەرێت، دەزانێت ئەگەر خوای گەورە فەرامۆشی بکات و بیسپێرێتە خۆی سەرگەردان دەبێت، هیچ ڕێگایەکی نیە بۆ واز هێنان و تەوبـەکردن مەگەر بە پشتیوانی خوا نەبێت.

ئەوە بە دەستی خوایە بە دەستی بەندە نیە، چونکە بەندە زۆر بـێ دەسـەڵات و بێ تواناترە لەوەی کە ڕەزامەندی خوا بە دەست بهێنێت بەبێ ئیزن و ویستی خـوا، بەندە موڵکی خوایە، ملکەچ و زەلیل و فەقیر و داماوە لە بەر دەستی خوا، ئاتـاجی دەرگای خوایە و ملکەچ و هـەژار و پێویـست و دامـاوی خوایـە، جەسـتەی سـەرقاڵە پێـی، دڵـی ملکەچـە لـە ژێـر دەسـتی، بـە یـەقینی دەزانێـت هـیچ خـێر و چـاکە و چاکسازی لە دەست نایەت، هەموو خێر و چاکەیەك لە خواوەیە و لە دەسـت ئـەوە، ئەو خاوەنی بەخششەکانیەتی پێیداوە بەبێ هیچ بەرانبەر.

بەڕاستی خوای گەورە جێگای مەدح و سوپاس و ستایشە، بەڵام بەندە جێگـای لۆمە و کەم و کوڕی و عەیبە، هەموو سوپاسێك بۆ خوایە، هەموو خێر و چاکەیە بـە دەست ئەوە، هەموو فەزڵێك لەوەوەیە، هەموو ستایـشێك شـیاو بـە خوایـە، هـەموو منەتێك بۆ خوایە.

چاکسازی و چاکە لە خوداوەیە، خراپە لە بەندەوەیـە، خـودا بـە بەخـشـشەکانی خۆشەویستی بەخشش دەکات بۆ بەندەکەی، بەندەش بە گوناهەکانی خـودا تـووڕە دەکـات، خـودا ئامۆژگـاری و چاکـسازی دەبەخـشێ بـە بەنـدەکانی، کەچـی بەنـدە خیانەت دەکات لە مامەڵەکەی، لە بەندایەتی کردنی خوا لە بەخشـشەکانی، ئەوەیە

یەکەمجار دان بنێت کە ئەمە لەلایەن خواوەیە، پاشان پەنا بگرێت بە خـوا کـە ئـەم بەخششانە بە هی کەسی تر نە زانێت جگە لە خوا، ئەگەر چ هۆیەکیش هەبێت بەڵام لە خواوەیە.

وا دابنێت کە هەموو نیعمەتێك تەنها لەلایەن خواوەیـە، پاشـان ستایـشی لەسـەر بکات و لە بەندایەتی خوا سەرفی بکات.

بەندایەتی کردنی خوا لە بەخششی و نیعمەتەکانی، ئەوەیە کە نیعمەتی کـەمیش بە زۆر بزانێت، وە سوپاس کردنەکانی خۆشی لەسەر ئەم نیعمەتە بـە کـەم بزانێـت، ئەوەش بزانێت کە ئەم نیعمەتە لەلایەن گەورەکەیەوە پێی بەخشراوە بەرانبـەر ئـەو ڕەنجـە کەمـەی ئـەو نیـە، وە بـەهۆی هۆکـارەوە نیـە، وەبـە ناچـاریش پـێ ی نەبەخشراوە، لە ڕاستیشدا ئەم نیعمەتە هی خوایە نەك هـی بەنـدە، ئـەم بەخـشـە ملکەچی و نەرم و نیانی و خۆشەویستی بە بەندە دەبەخشێ.

هـەر کـاتێکیش نیعمەتەکـە بەسـەریدا دووبـارە بێتـەوە، ئـەوە زیـاتر ملکەچـی و خۆشەویستی و گوێڕایەڵی خـوا دەبێـت، هـەر کاتێـك نیعمەتەکـەی لێبـسەندرێتەوە، ئەوە پێ ی ڕازی دەبێت، هەر کاتێك گوناهێکی تووشهات ئەوە پەشیمان دەبێتـەوە و عوورز دێنێتەوە، ئـا ئەمـە مرۆڤـی ژیـر و دانایـە، بـەڵام مرۆڤـی بـێ هێـز و نـەزان ئەوەیە کە بەم شێوە نەبێت.

# بە پشتیوانی خوا کارەکانت ئەنجامدە

هەر کەسێك کارەکانی بسپێرێتە خوا لە پـێ بەخـشین و نـەمان و لـەش ساغی و نەخۆشی، بزانێت خوای گەورە دەسەڵاتی بەسـەر هـەموو شـتێکدا هەیـە، هـەر ئـەو زاتەش بەڕێوەبەرە و دەزانێت چی بۆ بەندەکانی باشە، بـەڕێوەبردنی خـوا چـاکترە بۆ بەندە لە بەڕێوەبردنی خۆی بۆ خۆی، چونکە خوا چاکتر دەزانێت چی بـۆ بەنـدە سوودمەندە لە بەنـدە خـۆی بـۆ خـۆی، خـوا بـە تواناتـرە لـە بەنـدە بـۆ سـوود پـێ گەیاندن و زیان پێ گەیاندن، خوا زۆر بـە ڕەحمـترە بـۆ مـرۆڤ لـە نەفـسی خـۆی بـۆ خۆی.

دەزانێت کە بەبێ بڕیار و (قضاء و القدر)ی خوای گەورە ناتوانێـت شـەقاوێکیش بهاوێت، بۆیە نەفس و هەموو کاروکردەوەکـانی دەسـپێرێتە دەسـتی خـوای گـەورە وەکو کۆیلەیەکی بێ هێز کە چۆن خـۆی دەسـپێرێتە دەسـتی گەورەکـەی، ئـەوکات گەورەکەشی چۆن حـەز بکـات بەندەکـەی هەڵدەسـوڕێنێت کەچـی بەنـدە ناتوانێـت ئەوی بە هیچ شێوەیەك هەڵسوڕێنێت.

بەڵێ: مرۆڤ ئەوکات ئیسراحەت دەکات و دڵ تەنگی و غەم و خەفـەت و پـەژارەی نامێنێت، چونکە کارەکانی سپاردۆتە کەسـێك کـە لـە بـەڕێوەبردنی کارەکـانی هـیچ باکی پێ نیە، بۆیە بە تـەنها سـپاردویەتیە ئـەو چـونکە دەزانێـت زۆر بـە بـەزەیی و چاك و بە ڕەحم و چاکسازە بۆ بەندەکانی.

چـونکە ئـەو بەندەیـە هـەموو کارەکـانی تـەنها سـپاردوە بـە خـوا، بۆیـە خـوای گەورەش ئاتاجیەکانی لە دنیا و قیامەتیش بۆ جێبەجێ دەکـات، ئـای کـە ژیـانێکی دەبێت، کە دڵی بەخششی پێ دراوە، ئای کە بەختەوەر و کامەرانە.

بەڵام ئەگـەر ڕازی نـەبوو پـەروەردگار سەرپـەرشـتی بکـات و کـارو بارەکـانی بـۆ فەراهەم بێنێت، خۆی بووە سەر پشك و بەڕێوەبەری خۆی، ئەوکات تووشی غـەم و

خەفەت و نیگەرانی و بەدبەختی و ترس و ماندوو بوون و پەژارەیی دەبێت، جا نە دڵی پاك و كامەران دەبێت، نە كارەكانی چاك دەبێت، نە بە ئاواتیش دەگات، نە ئیسراحەتیش دەكات، نە تامیش وەردەگرێت، بەڵكو خۆشی و ئاسوودەیی و چاو ڕوونی هەمووی لێ دوور دەكەوێتەوە، چونكە ئەو وەكو دڕندە تێدەكۆشێت تەنها بۆ بە دەست هێنانی دنیا، سەركەوتوو نابێت لە ئاواتەكەی، سەركەوتووش نابێت لە دوا ڕۆژ چونكە هیچی بۆ ئامادە نەكردووە.

خوای گەورە فەرمانی بە بەندە كردووە فەرمانەكانی جێبەجێ بكات، جا ئەگەر ڕەنجی كێشا و بە ڕاست گۆیانە و ئیخلاصەوە فەرمانەكانی بە جێ هێنا، ئەوە خوای گەورە بەو شتانەی زامنی پێداوە لە ڕزق و ئاتاجی و سەرخستن و جێبەجێكردنی پێویستیەكانی بۆ فەراهەم دێنێت، چونكە خوای گەورە ڕزقی بۆ كەسێك زامن كردووە كە بەندایەتی بكات، سەركەوتنی بۆ كەسێك زامن كردووە كە تەوەكولی لەسەر خوا بێت، لێبووردنی زامن كردووە بۆ كەسێك كە داوای لێبووردنی لێ بكات، دابین كردنی پێویستیەكانی زامن كردووە بۆ كەسێك كە بە ڕاستگۆیانە داوا دەكات و متمانە و ئومێدی بە بەخشش و كەرەمی خوا بەهێزە.

مرۆڤی ژیر و دانا ئەوەیە كە هەڵدەستێت بە جێبەجێكردنی فەرمانەكانی خوا بیر لە زەمانەتی خوا ناكاتەوە بۆ كارەكانی چونكە دەزانێت خوای گەورە ڕاست گۆیە و وەفا بە زەمانەتەكەی خۆی دەكات بۆ كەسێك كە پەیمانەكەی لەگەڵدا بەرێتە سەر.

لە نیشانەی كامەرانی مرۆڤیش ئەوەیە كە سەرقاڵی جێبەجێكردنی فەرمانەكانی خوا بێت، نەك بچێت لە زەمانەتی خوا بكۆڵێتەوە، لە نیشانەی بێ بەش بوونی مرۆڤ لە كامەرانی ئەوەیە كە واز بێنێت لە جێبەجێكردنی فەرمانەكانی خواو خۆشەویستی و ترسی خوا، ڕوو بكاتە زەمانەتی خوا و لێی بكۆڵێتەوە.

# ڕوو لە دینی خوا بکــە

(بشر)ی کوڕی (الحارث) دەفەرمووێ: ئەوانەی پیاوی دوا ڕۆژن سێ کەسن:

١. عابیـد.

٢. زاهیـد.

٣. ڕاستگۆ.

جا مرۆڤی (عابید) ئەو کەسەیە کە بەندایـەتی خـوا دەکـات بـەڵام مباحـەکانیش ئەنجام دەدات، (زاهید) یش ئەو کەسەیە بەندایەتی خوا دەکات بە جۆرێك کە واز لە مباحەکانیش دەهێنێت، (ڕاستگۆ)ش ئـەو کەسـەیە بەندایەتی خـوا دەکـات لەسـەر ڕەزامەندی و ملکەچی خوا، ئەگەر بزانێت شتێك لـە دنیـا مباحـە و پێویـست ناکـات ئەنجام بدرێت ئەو دەستی لێ هەڵدەگرێت، ئەگـەر بزانێـت شـتێك لـە دنیـا مباحـە و پێویستە ئەنجام بدرێت ئەنجامی دەدات.

ئاگاداربە ئەگەر خواو پێغەمبەر لەلایەك بوون نەکەی تۆ بچیە لایەکی تر، چـونکە ئەو کارە مرۆڤ ڕادەکێشێت بۆ سەرپێچی و دژایـەتی، چـونکە ئـەم دووانـە بنـچینەی هەموو خراپەیەکن، لەبەر ئەوەی سەرپێچی ئەوەیە کە مرۆڤ لەلایەکدا بێـت ئـەوەی پێـچەوانەشی دەکـات لەلایـەکی تـر دابێـت، دژایـەتیش ئەوەیـە کـە مرۆڤەکـە لەلایەکدابێت دووژمنەکەشی لـە لایـەکی تـر، جا ئـەوە بـە سـاکار مەزانـە، چـونکە سەرەتا و کەمەکەی سەر دەکێشێت بۆ زۆربوون و فراوان بوون، کەواتە ڕووبکە ئـەو لایە و لـەو لایـە بـە کـە خـوا و پێغەمبەرەکـەی لێیـە، ئەگەرچـیش خـەڵکیش هـەر هەمووی لەو لای تر بن، چونکە ئەمە بۆ چارەنووسی مرۆڤ زۆر باشترە، هـیچ شـتێك نیە لە دنیادا لەمە سوودمەندتر بێت بۆ مرۆڤ.

زۆربەی خەڵکی لەو ڕیزەنـە کـە خـوا و پێغەمبـەری لـێ نیـە، بـە تایبـەت ئەگـەر چاویان لە دنیا بێت، نزیکە کـەس بـەدی نەکـەی لـە ڕیـزی خـواو پێغەمبـەری خـوا،

بـەڵکو ئەوانـەی ڕێبـازی خـواو پێغەمبـەریان هەڵبـژاردووە خـەڵکی بەکـەم عـەقڵیان دەزانن و وا دادەنێن کە نەیان زانیوە چاکەی خۆیان هەڵبژێرن، بەڵکو تۆمەت باریان دەکەن بەوەی کـە شـێت بوونـە، ئەمـەش پیشەی دووژمنـانی پێغەمبەرانـە کـە بـە میرات بۆیان ماوەتەوە کە هەر کەسێك لە ڕێزی ئەوان نەبێت تۆمەتی شێتی دەدەنە پالی.

بەڵام کەسێك ژیر بێت دەزانێت پێویستی بە زانیاریەکی پتەو هەیە بەو پەیامـەی پێغەمبـەرﷺ هێناویـەتی تـاکو هـیچ گومـانێکی لـە دڵـدا نـەمێنێت، وە دەزانێـت پێویستی بە ئارامیەکی پتەو هەیە بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئـەو دوژمنانـەی دژایـەتی دەکەن، جا ئەمەشی چەنگ ناکەوێت مەگەر بە خۆشەویستیەکی بە هێـز نـەبێت بـۆ خوا و ڕۆژیی دوایی نەبێت، کـە خۆشەویـستیەکەی بـە جۆرێـك بێـت دوا ڕۆژ بەسـەر دنیادا هەلبژێرێت، وە خوا و پێغەمبەری لـە هـەموو شـتێك زیـاتر خـۆش بوێـت، جـا لەسەرەتادا هیچ شتێك لەمە گرانتر نیە لەسەر دڵی مرۆڤـدا، چـونکە نـەفس و هـەواو ئـارەزووات و شـەیتان و برادەرانـی و خـزم و کەسـانی لـە ڕیـزی بـەدکارانن بـانگی دەکەن بێتە سەر ڕێبازی ئەوان، جا ئەگەر بەگوێیان نەکات دژایەتی دەکەن، بـەڵام ئەگەر ئارام بگرێت و بەردەوام بێت ئەوە خوا یارمەتی دەدات و کارەکانی بۆ ئاسان دەکات، وە ناخۆشیەکانی بۆ دەگێڕێت بە خۆشی، لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار سوپاسی کراوە، هەر دەبێت ئـەو خۆشـیەی پـێ ببەخـشێ کـە ڕووی کردۆتـە خـواو پێغەمبەرﷺ، دەبێت ئەم ڕێزەی پیشان بدات تاکو دڵخۆش و کامەران بێت.

کەوابوو گوێ مەدە سەرپێچی کردنی خەڵکی بەرانبەر بە خوا، ڕوو بکەرە خـوا و پێغەمبــەرﷺ ئەگــەر بــە تــەنهاش بــووی، چــونکە خــوای گــەورە پــشتیوانتە و دەتپارێزێت وە چاودێریت دەکات، بەڵام بڕوا و ئارامیەکەت تاقی دەکاتەوە.

ئەوەش بزانە کە دوای یارمەتی خوا گەورەترین پشتیوانی بـۆ پەیوەسـت بوونـت بە ڕێبازی خوا، خۆ دامالێنە لە چاوبرسیەتی و ترس، هەر کاتێك خـۆت دامـاڵی لـەم دووانە، ئەوە پەیوەسـت بوونـت بـە ڕێبـازی خـوا و پێغەمبـەرﷺ ئاسـان دەبێـت و

بەردەوام دەبێت لەسەر ڕێبازیاندا، بەڵام هەر کاتێك چاو برسی و ترس لە دڵتدا بـوو ئەوە چاوەڕێی هیچ مەکە.

ئەگەر گووتت بە چ شتێك بتوانم خۆم داماڵم لە چاوبرسیەتی و ترسنۆکی؟

منیش دەڵێم: بە یەکخواناسی و تەوەکول و بڕوا بـوون بـە خـوا، بـشزانیت تـەنها خوا چاکەت بۆ پێش دێنێت، تەنها خوا خراپە لـە مـرۆڤ لا دەبـات، هـەموو شـتێك و بریارێك هی خوایە و هی کەسی تر نیە.

## ڕێگایەکی ئاسان بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خودا

وەرە رووبکە خوا و ماڵی ئاشتی بەبێ شەکەتی و ماندووبوون و کۆڵە مەرگی، بەڵکو بە نزیکترین و ئاسانترین ڕێگادا.

ئەوەش بزانە کە تۆ لە نێوان دوو کاتان دایت، ئەویش تەمەنتە، چونکە تەمەنت بەو کاتانە دەگووترێ کە ئامادەیە و ئەوکاتانەش کە ڕابردووە.

ئەو کاتانەی کە ڕابردووە بە تەوبە و پەشیمانی و داوای لێبووردن و چاکساز دەبێت، ئەوەش نە ماندووبوونی تیایە نە شەکەتی تیایە نە کاریشی تیایە کە هیلاك بیت، بەڵکو ئەو کارانە هەمووی کاری دڵە بە تەنها.

خۆ پاراستن لەو گوناهانەش کە وادێت هیچ ماندووبوونی تیانیە چونکە خۆپاراستنت بۆ داهاتوو کارێك نیەکە بە ئەندامەکانت ئەنجامی بدەی تووشی ماندوویەتیت بکات، بەڵکو ئەمەشیان بەنیەت دەکرێت کە جەستە و دڵت پێی ئاسوودە دەبێت.

کەواتە ئەو کاتانەی ڕابووردووە بەتەوبە چاکساز دەبێت، وە ئەوکاتانەی داهاتووش بە نیەتی خۆ پاراستن و بڕیاردان چاکساز دەبێت، جا لەو دوانەدا ئەندامەکانی لاشە هیچ شەکەتی و ماندوویەتیەك نابینێت، بەڵام تەمەنت تووشی شەکەتی دەبێت، تەمەنیش ئەو کاتانەیە کە لە نێوان ئەو دوو کاتانەدایە، ئەگەر ئەو کاتانەی ئامادەیە بە فیڕۆتدا دەکات بەختەوەری و سەرفرازی خۆت بەفیڕۆدا، بەڵام ئەگەر پاراستت لە کاتێکیشدا کارەکانی ڕابووردوو و داهاتووشت چاکساز کردبێت بەو شێوەی باسمانکرد ئەوکات ڕزگار دەبی و دڵنیایی و کامەرانی و نیعمەت دەبەیەوە.

پاراستنی ئەو کاتانەی کە ئامادەیە زۆر سەختترە لە چاکسازی کردنی کاتەکانی ڕابووردوو و داهاتوو،

چونکە پاراستنی ئەو کاتانە بەوە دەبێت کە نەفست پەیوەست بکەی بەو شتانەی کە سوودمەند و بەکەڵکە و کامەرانیت بۆ بەچەنگ دێنێت.

جا لەوەدا خەڵکی جیاوازیان هەیە، سوێند بەخوا ئەو ڕۆژانەی کە توێشووی تیادا کۆدەکەیەوە بۆ دوا ڕۆژت یان بەرەو بەهەشتت دەبات یان بەرەو دۆزەخت دەبات، ئەگەر ئەو کاتانەت کردە ڕێگایەك بۆ گەیشتن بە خوا بە ئەنجامدانی کاری چاکە دەکات گەیشتووی بە سەرفرازی و بەختەوەریەکی گەورە لەو ماوە کەمەدا کە هیچ بارستەی نیە لە چاو دواڕۆژدا، بەڵام ئەگەر ڕووتکردە ئارەزووات و ڕابواردن و گاڵتە و گەمە و ئەوانەت هەڵبژارد، ئەوکات بەماوەیەکی زۆر کەم ئەمانەت لێ دەبڕێتەوە، ئینجا ئێش و ئازار و ناخۆشی زۆری بە دوا دادێت کە زۆر گرانتر و بەردەوام ترە لە ناڕەحەتی و ئارامگرتن لەسەر قەدەغەکراوەکانی خوا و ئارامگرتن لەسەر بەندایەتی خوا.

نیشانەی دروستی ئیرادەی مرۆڤیش ئەوەیە کە هەموو غەمی ڕەزامەندی پەروەردگاری بێت و خۆی ئامادەی بارەگای خوا کردبێت، خەفەت باربێت لەو کاتانەی کە لە دەستی دەچێت و لە ڕەزامەندی خوا بە کاری نەهێنابێت، کۆی هەموو ئەمانەش ئەوەیە کە کاتێك بەیانی و ئێوارە دەکاتەوە تەنها غەم و مەبەستی خوا بێت.

چونکە مرۆڤ تەنها بە خواوە دەوڵەمەندە، کەوابوو ئەگەر خەڵکی خۆیان دەوڵەمەند دەکرد بە ماڵی دنیا، تۆش خۆت دەوڵەمەند بکە بەخوا، ئەگەر خەڵکی دڵخۆش دەبوون بە دنیا، تۆش دڵخۆش بە بە خوا، ئەگەر خەڵکی هۆگر دەبوون بە خۆشەویستەکانیان، تۆش هۆگریت با لەگەڵ خوابێت، ئەگەر خەڵکی خۆیان خۆشەویست دەکرد لە لای پادشا و سەرکردەکانیان و لێیان نزیك دەبوونەوە تاکو ناو دەرکەن و بەرز ببنەوە، تۆش خۆت خۆشەویست بکە لای خوای گەورە چونکە سەربەرزی و سەرفرازی تەنها لە لایەن خواوەیە.

# ووتەی پەند ئامێز

یەکێ لە زاهیدەکان فەرموویەتی: نەمزانیوە کەسێك گوێبیست بووبێت بەهەشت و دۆزەخ هەیە کەچی کاتەکانی بەیادی خوا یان بە نوێژ یان بە قورئان خوێندن یان بە چاکە سەرف نەکات.

جا پیاوێك پێی ووت: من زۆر دەگریم.

ئەویش فەرمووی: ئەگەر پێبکەنی بەڵام دان بەهەڵەکانت بنێی زۆر چاکترە لەوەی بگرییێت کەچی بە کارەکانت بنازی، چونکە کەسێك بە کاروکردەوەی خۆی بنازێت کردەوەکانی لەسەر سەری بەرزتر نابێتەوە.

جا پیاوەکە پێی ووت: کەوابوو ئامۆژگاریم بکە.

ئەویش فەرمووی: دنیا واز لێبێنە بۆ خاوەنی خۆی کە ئەوانەن ڕوویان تێکردووە هەروەك چۆن ئەوان دوا ڕۆژیان واز لێهێناوە بۆ خاوەنی خۆی، لە دنیادا وەکو هەنگ بە، چونکە هەنگ ئەگەر شت بخوات شتی پاك دەخوات، ئەگەر خۆراك بدا خۆراکی پاك دەدات، ئەگەر بکەوێتە سەر شتێکیش نایشکێنێ و تێکی نادات.

# زوهد و جـۆرەکانی

(الزهد)واتـە: وازهێنان، چەند جۆرێکی هەیە:

* وازهێنان لە حەڕام، ئەمەیان واجبە.

* وازهێنـان لـە شـتی گومـان لێکـراو، ئەوەشـیان بـە پێـی گومانەکـە ڕەفتـاری لەگەڵدا دەکرێت، ئەگەر گومانەکە زۆر بوو، ئەوە واز لێهێنانی بە واجـب دادەنرێت، بەڵام ئەگەر گومانەکە کەم بوو ئەوە وازلێهێنانی بە سوونەت دادەنرێت.

* وازهێنان لە شتی زیادە مەسرەفی.

* وازهێنان لەو شتانەی پەیوەندی بەوەوە نیـە وەکـو قـسەکردن لـە شـتێك کـە پەیوەنـدی بـەوەوە نیـە، یـان سـەیرکردن و پرسـیارکردنی شـتێك کـە پەیوەنـدی بەوەوە نیە و سەردان و چەندان شتی تریش.

* وازهێنان لە خەڵکی.

* وازهێنان لە نەفسی بەدکار بەشێوەیەك کە لەبەر خـاتری خـوا نەفـسی لـەلای هیچ بایەخی نیە.

ئـەوەی لـە هەمووشـیان گـەورەترە کـە کۆکـەرەوەی هـەموو ئـەو زوهدانەیـە، وازهێنانە لە هەموو شتێك جگە لە خوای گەورە، واز هێنانە لە هـەموو ئـەو شـتانەی دوورت دەکاتەوە لە خوا. گەورەترین (زهد)یش شاردنەوە و دەرنەخستنی (زهـد)ە، گرانترین (زهد)یش وازهێنانە لە حەزەکانی.

جیاوازی لە نێوان (الزهد) و (الورع)دا:

جیاوازیەکەی ئەوەیە (الزهد) وازهێنانە لەو شتانەی کە سوودی پێ نابەخشێ لە دوا ڕۆژدا.

(الـورع)یـش وازهێنانـە لـەو شـتانەی کـە مەترسـی ئـەوەی لێـدەکرێ زیـانی پـێ ببەخشێ لە دوا ڕۆژدا، بەڵام دڵێك کە پەیوەست بێـت بـە ئارەزواتـەوە ئـەو دڵـە نـە دەتوانێت زاهید بێت نە دەتوانێت وەرعیش بکات.

## ووتەی پەند ئامێز

(یحیي)ی کوڕی (معاذ) دەفەرمووێ : سەرم لە سێ کەس سووڕماوە:

١. پیاوێك کارێك دەکات تاکو مرۆڤێکی وەکو خـۆی ببینـێ کەچـی کـار ئـەنجام نادات بۆ خوا.

٢. پیاوێك قرچۆکی دەکات لـە ماڵەکـەی کـە پـەروەردگاری بـە قـەرزی داوەتـێ، کەچی ئەو بەقەرزی نادات.

٣. پیاوێك حەز بە دۆستایەتی و خۆشەویستی خەڵکی دەکات، لـە کاتێکـدا خـوا بانگی دەکات بۆ دۆستایەتی و خۆشەیستی خۆی.

# وازهێنان لە فەرمانەکانی خوا

تاوانی زۆر گەورەترە لە ئەنجامدانی گوناه

(سهل)ی کوڕی (عبدللە) دەفەرمووێ: وازهێنان لە فەرمانەکانی خوا تـاوانی زۆر گەورەترە لە ئەنجامدانی گوناه، چونکە دەبینین خوای گەورە ئـادەمی قەدەغـەکرد لەو درەختە نە خوات، بەڵام ئادەم هەڵەی کرد و خواردی پاشانیش تەوبـەی کـرد و خوای گـەورەش تەوبەکـەی لـێ وەرگـرت، بـەڵام دەبیـنین ئیبلـیس فـەرمانی پێکـرا کرنۆش بـۆ ئـادەم بـەرێت کەچـی کرنۆشـی بـۆ نـەبرد و فـەمانی خـوای جـێ بـەجێ نەکردوو شکاندی بۆیە تەوبەی لێوەرنەگیرا.

ابن قیم دەفەرمووێ: منیش دەڵێم: ئـەم بابەتـە زۆر گرینگـە و بایـەخی زۆریـشی هەیە، ئەویش ئەوەیە وازهێنان لە فەرمانـەکانی خـوا تـاوانی زۆر گـەورەترە لـە لای خوا لە ئەنجامدانی گوناه، ئەمەش لە چەند ڕوویەکەوە ڕوون دەبێتەوە:

یەکـەم: وەك ئـەوەی کـە (سـهل) باسـی کـرد لـە باسـی ئـادەم و دووژمـنی خـوا ئیبلیس.

دووەم: ئەنجامدانی شتە قەدەغەکراوەکان سەرچاوەکەی پاڵە پەسـتۆ و هێرشـی هـەواو ئارەزوواتـە بۆیـە مـرۆڤ ئـەو تاوانانـە ئـەنجام دەدات، بـەڵام وازهێنـان لـە فەرمانەکانی خواو ئەنجامنەدانی سەرچاوەکەی فیزو خۆبەگەورە زانینە هەر بۆیەش پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێ: ((لا یدخل الجنة من کان في قلبە مثقـال ذرة مـن الکـبر))[1].

واتـە: ئـەو کەسـە ناچـێتە بەهەشـت ئەگـەر بـە ئەنـدازەی گەردیلەیـەك (کـبر)ی لـە دڵدابێت.

بەڵام ئەو کەسە دەچێتە بەهەشت ئەگەر بمرێ لەسـەر یەکخواناسـی ئەگـەر چـی زیناشی کردبێت و دزیشی کردبێت.

---

(١) صحیح: رواه مسلم (٩١)، و ابو داود (٤٠٩١)، والترمذی (١٩٩٩)، و احمد فی المسند (١/٣٨٥،٤٢٧).

سێیەم: ئەنجامدانی ئەو کارانەی خوا فـەرمانی پێکـردوە زۆر خۆشەویستره لای خوا لە نەکردنی ئەو شتانەی قەدەغەی کردووە، ئەمەش چـەندین بەڵگـەی لەسـەرە ئـەوەتا پێغەمبـەرﷺ دەفـەرمووێ: ((أحـب الاعمـال الى الله الـصلاة علـى وقتهـا))[1]، واتـە: خۆشەویسترین کار لەلای خوای گەورە کردنی نوێژەکانە لە کاتی خۆی.

پێغەمبەرﷺ جارێکیان فـەرمووی: ئایا پێتـان رابگەیـەنم چاکترین کردەوەتـان چیە؟ کە پاکترین و خاوێن تـرین کردەوەیـە لای خـوای گـەورە، کـە پلـەتان پـێ ی بەرزدەکاتەوە، بە جۆرێك ئەو کارە چاکتربێت بۆتان لە بەخشینی زێڕ و زیو، چـاکتر بێت لەوەی بەدووژمنەکانتان بگەن و لەملیان بدەن و سـەریان بپـەڕێنن و ئـەوانیش لـەملتان بـدەن و سـەرتان بپـەڕێنن؟ هـاوەڵان فـەرموویان: بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خواﷺ بڵێ، پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: ((ذِكـرُ اللَّـهِ عَـزَّ وَجَـلَّ ))[2]. ئـەو کـارە زیکـرو یادی خوا کردنە.

بـڕوانن دەبیـنین خـوای گـەورە خۆشەویـستی خـۆی بەسـتۆتەوە بـەو کەسـانەی فەرمانـەکانی ئەنجامـدەدەن هـەروەك خـوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ﴾ (الـــصف: ٤)، واتـــە: بەڕاســـتی خـــوای گـــەورە ئەوکەسانەی خۆش دەوێت کە دەجەنگن لە پێناو ڕێبازی خوا بەیەك ڕیزی.

خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـر دەفـــەرمووێ: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ (ال عمران:١٣٤)، واتـە: خوای گەورە چاکەکاران و چاکسازانی خۆش دەوێت.

هـــەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾(الحجـــرات:٣)، واتـــە: دادپەروەر بن خوای گەورە دادپەروەرانی خۆش دەوێت.

---

(١) صحيح: رواه البخارى (٢/٧)، ومسلم (٨٥)، والترمذى (١٨٩٩)، والنسائى (١/١٩٤).

(٢) رواه احمد فة المسند (٥/٢٣٩)، والترمذى (٣٣٧٤)، وابن ماجه (٣٧٩٠)، وحاكم فى الستدرك (١/٤٩٦) و صححه الحاكم ووافقه الذهبى.

دەفـــەرمووێ: ﴿والله یحب الصابرین﴾(ال عمران:١٤٩)، واتـــە: خـوای گـەورە ئارامگرانی خۆش دەوێت.

بەڵام دەبینین لە بارەی ئەنجام نەدانی قەدەغەکراوەکان زۆری بە نەبوونی خۆشەویستیەوە بەستۆتەوە وەکو خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴾ (البقرة: ٢٠٥، واتـە: خوای گەورە فەسادی خۆش ناوێت.

هـەروەها دەفـەرمووێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴾(الحديد:٢٣)، واتـە: خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە خۆ بەگەورەزانن و فیزاوین.

هـەروەها لـە ئایـەتێکی تردەفـەرمووێ: ﴿وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾ (البقرة:١٩٠)، واتـە: دەستدرێژی مەکەن چونکە خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە دەست درێژی دەکەن.

خـــوای گـــەروە دەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴾(النساء:٣٦)، واتـە: خـوای گـەورە ئـەو کەسانەی خـۆش ناوێـت کـە خۆبەگەورە زان و فیزاوینە.

کە ئەمە زانرا ئـەوکات ئـەو کارانـەی کـە خـوا خۆشـی دەوێـت (مقصود بالذات) واتـە: خودی کارەکە خۆی مەبەستە.

هـەر بۆیـەش خـوای گـەورە ئـەو شـتانەی ناپەسـەندن لای تەقـدیری دەکـات بۆ گەیشتن بەو کارانەی پێی خۆشە، هەروەك گوناه و کوفر و فسق تەقدیر دەکـات بۆ گەیشتن بەو شتانەی پێی خۆشە لە جیهاد و بە دەست هێنانی پلەی شەهیدی.

تاکو بەندە تەوبەبکات، ملکەچ بێت بۆی، دەرکەوتنی دادپـەروەری ولێبووردەی و سزا و توانای خوای بۆ ڕۆشن بێتەوە.

تاکو بەندە خۆشەویستی و ڕق لێبوونـەوەی لەبـەر خـوا بێـت، چـەندینی تـریش بەهۆی ئەو کارە ناپەسەندانە مرۆڤ پێی دەکات.

چوارەم: ئەنجامـدانی ئـەو کارانـەی خـوا فـەرمانی پێکـردووە خـۆی لـە خۆیـدا مەبەسـتە، بـەڵام وازهێنـان لـە قەدەغـەکراوەکان مەبەسـت تیایـدا بـۆ چاکسازی

ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوایە، جا ئەو شتە بۆیە قەدەغەکراوە چونکە زەرەر بە فەرمان پێکراوەکان دەدات و بێ هێز و کەمی دەکات، هەروەك خوای گەورە ئەمەی ڕوون کردۆتەوە لە بارەی قەدەغەکردنی شەراب و قومار چونکە هەردووکیان ڕێگرن لە یادی خوا و نوێژ ئەنجامدان کە دوو کاری فەرمان پێکراوە لەلایەن خواوە.

پێنجەم: ئەنجامدانی کارە فەرمان پێکراوەکان بۆ پاراستنی هێزی ئیمان و مانەوەی ئیمانە، بەڵام وازهێنان لە کارە قەدەغەکراوەکان بۆ پاسەوانی ئەو شتانەیە کە هێزی ئیمان دەشێوێنێ و لاری دەکات.

جا کەوابوو پاراستنی هێزەکە لە پێش پاسەوانی لێ کردنیەتی، چونکە هێز هەرکاتێك زیاد بکات شتە خراپەکان ڕادەماڵێت، هەرکاتێکیش بێ هێزبێت ئەوە شتە خراپەکان بەسەریدا زاڵ دەبێت، بەڵام پاسەوانی بۆ پاراستنی و زیاد بوون و مانەوەی هێزە، جا بۆیە هەرکاتێك هێزی ئیمان پتەوبوو، ئەوە هەموو گەندەڵیەك ڕادەماڵێت و ناهێڵێت زیاد بکات، ئەمەش بە پێی بەهێزی و بێ هێزی ئیمانەکەیە، بەڵام ئەگەر ئیمان بێ هێز بوو ئەوە گەندەڵی بەسەریدا زاڵ دەبێت.

بەجوانی لەم بەشەیان وورد بەوە و بیخوێنەوە بۆت ڕوون دەبێتەوە.

شەشەم: ئەنجامدانی ئەو کارانەی خودا فەرمانی پێکردووە ژیان و خۆراك و جوانی و ئاسوودەیی و چاوگەشی و خۆشی و نیعمەتی دڵ و دەروونە، بەڵام وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان بە بێ ئەنجامدانی فەرمان پێکراوەکان هیچ لەمانەی باسمان کرد دەست ناکەوێت، بۆ نموونە ئەگەر واز لە هەموو قەدەغەکراوەکان بهێنێت کەچی ئیمانی نەبێت و فەرمان پێکراوەکانیش ئەنجام نەدات، ئەوکات وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان هیچ سوودی پێناگەیەنێت بەڵکو بەردەوامیش لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە.

پێنجەم: هەر کەسێك ئەو کارانە ئەنجامبدا کە خودا فەرمانی پێکردووە لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کارانەش ئەنجامیبدا کە قەدەغەش کراوە، ئەو کابرایە یان ڕزگاری دەبێت لە دۆزەخ ئەگەر چاکەکانی زیاتر بوو لە خراپەکانی، یان ڕزگاری دەبێت

ئەویش دوای ئەوەی مافی خەڵکی لێ دەسێندرێتەوە و لەسەر خراپەکانیشی سزا دەدرێت ئینجا ڕزگاری دەبێت، جا بۆیە ڕزگاری دەبێت چونکە فەرمانی خوای ئەنجامداوە.

بەڵام کەسێك واز لەو کارانە بێنێت کە فەرمانی پێکراوە، لەو کارانەش کە قەدەغەکراوە، ئا ئەوە بە هیلاك چووە و ڕزگاری نەبووە، چونکە مرۆڤ بە هیچ شتێ ڕزگاری نابێت لە دۆزەخ تەنها بە ئەنجامدانی ئەو کارانە نەبێت کە فەرمانی پێکراوە ئەویش (التوحید)ە یەکتاپەرستی.

ئەگەر گوترا: ئەوە بۆیە بە هیلاك چووە چونکە شیرکی ئەنجامداوە، لە وەڵامدا گووتراوە: بۆ بە هیلاك چوونی ئەوە بەسە کە یەکتاپەرستی نەبووە کە فەرمانی پێکراوە، ئەگەر چی پێچەوانەکەشی ئەنجام نەدابێت کە شیرکە، بەڵکو هەر کاتێك دڵی خاڵی بوو لە یەکتاپەرستی و خوای بە تەنها نەدەپەرست ئەوە بە هیلاك چووە ئەگەر چی کەسی تریشی نەپەرستبێت لەگەڵ خوادا، بەڵام ئەگەر کەسێکی تریشی پەرست لەگەڵ خوادا، ئەوە سزا دەدرێت لەسەر ئەوەی یەکتاپەرست نەبووە لە کاتێکدا فەرمانی بەمە پێکرابوو، سزاش دەدرێت لەسەر ئەنجامدانی شرکەکەشی کە لەسەری قەدەغەکرابوو.

هەشتەم: ئەگەر کەسێك بڵێت: من خوا نە بەڕاست دەزانم نە بەدرۆشی دەزانم، نەخۆشم دەوێت نە ڕقیشم لێ دەبێتەوە، نە دەی پەرستم و نە کەسی تریش دەپەرستم لە شوێنی خودا، ئا ئەو مرۆڤە بە تەنها بەدان نەهێنان و پشت تێکردنی فەرمانەکانی خودا کافر بووە، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی کە دەڵێت: من پێغەمبەرﷺ بەڕاست دەزانم، خۆشیشم دەوێت، ئیمانیشم پێیەتی، ئەو کارانەش ئەنجامدەدەم کە فەرمانی پێکردووم، بەڵام ئارەزوواتم زاڵ بوونە بەسەرمدا و وام لێدەکەن ئەو کارە قەدەغەکراوانە ئەنجام بدەم، ئەگینا من دەزانم کە ئەو کارانە حەرامە و خوا و پێغەمبەری خوا حەرامیان کردووە، بەڵام من ئارامم لەسەری پێ ناگیرێت، ئا ئەو مرۆڤەیان بە کافر دانانرێت، حوکمیشی وەکو حوکمی ئەوی یەکەم

نیە، چونکە ئەمە لە ڕوویەکەوە گوێڕایەڵـە، بـەڵام کەسـێك کـە بـە تـەواوی وازی لـە فەرمانەکانی خوا هێناوە ئەو لە هیچ ڕوویەکەوە گوێڕایەڵ نیە.

نۆیەم: (عمری کوری العاصي) لە کاتی سەرەمەرگیدا دەیفەرموو: خودایە مـن ئـەو کەسەم کە فەرمانت پێکردم کەچی من بۆ فـەرمانیم کـردی، بـەڵام شـایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لە تۆ.

مەبەست لە ناردنی پێغەمبەران گوێڕایەڵی کردنیانە، گوێڕایەڵیش بە ئەنجامـدانی ئەو کارانە دەکرێت کە فـەرمانیان پێکـردووە، خۆپاراسـتنیش لـە قەدەغـەکراوەکان تەواوکـەری ئەنجامـدانی کـارە فـەرمان پێکراوەکانـە، ئەگـەر هـاتوو کەسـێك خـۆی پاراست لە کارە قەدەغەکراوەکان، بەڵام هیچ کـارێکی فـەرمان پێکراویشی ئـەنجام نەدا ئەوکات ئەو کەسە ناکات گوێڕایەڵی خوایە بەڵکو دەکات یاخیە، بە پێـچەوانەی ئەو کەسەی کە کارە فەرمان پێکراوەکان ئەنجامدەدات، بـەڵام تووشـی ئەنجامـدانی کارە قەدەغەکراوەکانیش دەبێـت، جـا ئـەوە ئەگـەر چـی بـە یـاخی و گوناهبـاریش دادەنرێت بەڵام گوێڕایەڵی فەرمانەکانیشی کردووە، بە پێچەوانەی ئـەو کەسـەی کـە فەرمان پێکراوەکان ئەنجام نادات چونکە ئەو بە خۆپاراستنی لـە قەدەغـەکراوەکان بە گوێڕایەڵی ناژمێردرێت.

دەیـەم: گوێڕایـەڵی فەرمانـەکانی خـوا بەندایـەتی و نزیـك بوونەوەیـە لـە خـوا، گوێڕایەڵی خوا ئەو پەرستشەیە کە مرۆڤ لە پێناوی ئەو دروست کراوە خوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الـذاريات:٥٦). واتـــە: مــن جنۆکە و ئینسانم دروست کردوە تەنها بۆ ئەوەی بم پەرستن.

خوای گەورە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە جنۆکە و ئینسانی درووست کردووە تەنها بۆ بەندایەتی.

بەهـەمان شـێوەش کـە پێغەمبـەرانی ڕەوانـە کـردووە بـۆ مـرۆڤ و کتێبـی بـۆ دابەزاندوون بۆ ئەوەی بیپەرستن.

کەوابوو بەندایەتی خۆی لە خۆیدا مەبەستە کە مرۆڤ و جنۆکە لـە پێنـاوی ئـەودا دروسـت کـراوە، بـۆ ئـەوە دروسـت نـەکراوە تـەنها خـۆی بپارێزێـت لـە گونـاه، چونکەگوناه خۆی لە خۆیدا وجودی نیە مرۆڤ خـۆی گونـاه فەراهـەم دێنێت، گونـاه شتێکە وجودی نەبووە هەر بۆیەش کەماڵیەتیشی پێوە بەند نیە چونکە نـەبوو، بـە پێچەوانەی گوێڕایەڵی فەرمانـەکانی خـودا چـونکە ئـەو شتێکە هـەبووە و خـۆی لـە خۆیدا مەبەست بووە و فەرمانیشی پێکراوە.

یانزەهەم : ئەوەی خوای گەورە داوای کردووە لەمەڕ قەدەغـەکراوەکان ئـەنجام نەدانیەتی کە دەکات خۆی لە خۆیدا هیچ وجودی نیە، بـەڵام ئـەوەی خـوای گـەورە داوای کردووە لەمەڕ فەرمان پێکراوەکان ئەنجامدانیەتی کە دەکـات شـتێك وجـودی هەیە بۆیە خودا فەرمانی پێکردووە، کەوابوو قەدەغەکراوەکان شـتێك نیـە وجـودی هەبێت هەر بۆیە کـەماڵی تیـا نیـە مەگـەر پەیوەسـت بکـرێ بـە شـتێکی هـەبوو کـە فەرمان پێکراوەکانە، کەواتـە شتی هەبوو خوازراو بوو و فەرمان پێکراوە.

دوانزەم: زانایان ئیختلافیان هەیە لەسەر کارە قەدەغەکراوەکان بە چەند ڕایەك: وا خوازراوە لە قەدەغەکراوەکان دەستی لـێ هـەڵگیرێت و خـۆی لـێ بگیرێتـەوە، ئەمەش دیارە شتێکە کە هەیە دەڵێن: چونکە داوا لـە شـتێك دەکرێـت کـە ئـەنجام بـدرێت کـە تەقـدیر کرابێـت، وە شـتێکیش کـە نـەبێت (مقدور) نیـە، ئەمـە ووتـەی جمهورە.

(ابـو هاشـم) و چـەندینی تـریش دەفـەرموون: خـوازرا و لـە قەدەغـەکراوەکان نەبوونی کارە، جا هەر بۆیە مرۆڤ بە نەکردنی دەگات بە مەبەست، نەك بەدەست لێ هەڵگرتنی بگات بە مەبەست، ئەگەر بێتوو دەست لێ هەڵگرتن خوازرا بێت، دەکـات ئەگەر نەیکات گوناهبار دەبێت، هەر بۆیەش خەڵکی ئـەو کەسـە مـەدح دەکـەن کـە کردنی خراپەی بەخەیاڵدا نایەت، ئەمە ڕایەکی (القاضي ابي بكر)ە هەر بۆیە ئەنجام نەدانی (مقدور)ە بۆ مرۆڤ .

دەفەرمووێ: مەبەست لە قەدەغەکراو مانەوەیەتی هەر لەسەر نەبوونی بنەرەتی خۆی ئائەوە (مقدور)ە.

گروهێکـی تـر فەرموویانــە: وا خــوازراوە لــە قەدەغــەکراوەکان ئەنجامــدانی پێچەوانەکەی کە ئەوە مەبەستە بۆ قەدەغەلێکراوەکە، وەك ئـەوەی قەدەغـەکراوە لە فاحیشە بە مەبەستی ئەنجامدانی داوێن پاکی کە فەرمان پێکراوە، قەدەغـەکراوە لە ستەم بە مەبەستی ئەنجامدانی دادپەروەری کە فەرمانی پێکراوە، قەدەغـەکراوە لــە درۆ بەمەبەســتی ئەنجامــدانی ڕاســتگۆیی کــە فــەرمانی پێکــراوە، هــەموو قەدەغەکراوەکان بەهەمان شێوەیە، لەلای ئەوانـەدا مەبەسـت لـە قەدەغـەکراوەکان ئەنجامـدانی پێـچەوانەکەی داوا کـراوە، کەواتـە کارەکـە گـەڕاوە سـەر ئـەوەی کـە مەبەست لە داواکراو ئەنجامدانی ئەو کارانەیە کە فەرمانی پێکراوە.

سێنزەهەم: خوای گەورە پاداشتی ئەنجامدانی کاری خێری یەك بە دە دانـــاوە، بەڵام پاداشتی وازهێنانی لە کاری خراپەی یەك بە یەك دانـــاوە.

ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەنجامـدانی ئـەو کارانـەی خـوا فـەرمانی پێکـردووە زۆر لەلای خۆشەویستترە لە وازهێنانی ئەو کارانەی قەدەغەی کردووە.

ئەگەر وا نەبایە ئەوە خراپە یەك بە دە دەبوو، چاکەش یەك بە یەك دەبوو.

چـواردەهەم: مەبەسـت لـە قەدەغـەکراوەکان ئـەنجام نەدانیـەتی، جـا نیـەتی ئەنجامدانی هەبێت یان نا، وە بە خەیاڵیدا هاتبێت یان نـا، تـەنها مەبەسـت ئەوەیە ئەنجامی نەدات، بەڵام مەبەسـت لـە فـەرمان پێکراوەکـان ئەنجامدانیـەتی بەنیـەت و کـردەوە، نهـێنی ئەمـەش لەوەدایـە: کـە ئەنجامـدانی ئـەو کـارەی خـودا فـەرمانی پێکردووە زۆر لـەلای خۆشەویـستترە لـە واز هێنـان لـەو کـارەی قەدەغـەیکردووە، کـەوابوو کارێـك کـە فـەرمانی پێکـردووە زۆر لـە لای خۆشەویـستترە لـە کارێـك کـە قەدەغەی کردووە.

پانزەهەم: بێگومان ئەو کارانە کە خوا پێـی خۆشـە و مرۆڤـی لەسـەر هانـدەدا و پاداشتیان لەسـەر دەدات و مـەدح و ستایـشی لەسـەر کـردووە ئـەوە لـە ڕەحمـەتی خواوەیە، ئەو کارانەش کە خـوا پێـی ناخۆشـە و سـزای بـۆ دانـاوە و زەم و ئـێش و

ئازاری بەدوا دادێت ئەوە لە تووڕەیی خواوەیە. وە ڕەحمەتی خواش پێش تووڕەیی خوا کەووتوە، چونکە خوا بەردەوام بەرەحمـە، ڕەحمـەت لـە سیفاتی زاتـی خوایـە وەك زانست و توانا و ژیان و بیستن و بینین و چاکەی خوا، ناگونجێ بە پێچەوانەی ئەوە بێت، نابێت تووڕەیش بەم شێوەبێت، چونکە تووڕەیی لـە سیفاتی زاتـی نیـە کە بەردەوام تووره بێت و لێی جیا نەبێتەوە، بەڵکو نێردراوەکەی وای فەرمووە کـە شارەزاترین کەسە بەو لە ڕۆژی قیامەت کە دەفـەرمووێ: ((ان ربي قـد غـضب اليـوم غضبا لم يغضب قبله مثله ولن يغضب بعده مثلـه))[1]. واتـە: بەڕاسـتی پـەروەردگارم لەو ڕۆژەدا ئاوا تـووڕە بـووە کـە هـەرگیز نە پێشتر و نـە پاشـتریش بـەم شـێوەیە تووەڕە نەبووە.

ڕەحمەتی خوا هـەموو شـتێکی گرتۆتـەوە، بـەڵام تووڕەیەکـەی هـەموو شـتێکی نەگرتۆتەوە، خوای گەورە لەسەر خۆی نووسیوە بە ڕەحم بێت نەینووسیوە تـووره بێت، ڕەحمەت و زانستی خوا هەموو شتێکی گرتۆتەوە بەڵام تووڕەیی و سزای خـوا هـەموو شـتێکی نەگرتۆتـەوە. ڕەحمــەت و شـوێنەوار و تایبەتمەندیـەکانی بەسـەر تووڕەی و شوێنەوارەکانی دەکەوێت.

هەر شتێك پەیوەست بێت بە ڕەحمەتی خوا زۆر خۆشەویسترە لـەلای خـوا لـەو شتانەی پەیوەستە بە توورەی خوا هەربۆیە خوا ڕەحمەتی زۆر پێ خۆشترە لە سزا دان، لێبووردنی زۆر پێخۆشترە لە تۆڵـە سـەندنەوە، ئەنجامـدانی ئـەو کارانـەی زۆر لەلا خۆشەویسترە لەواز هێنانی ئەوکارانەی پێی ناخۆشە، بە تایبـەت لـە کـاتی واز هێنان لە قەدەغەکراوەکاندا، ئەو کارانەش بفەوتێ کـە پەیوسـتە بـەو کارانـەی خـوا خۆشی دەوێت، چونکە ئەویش بە هەمان شێوە پێی ناخۆشە.

شانزەهەم: شوێنەواری ئەو شتانەی خوا پێی ناخۆشە کە قەدەغەکراوەکانە بـەو شتانە زوو لادەچێت کە خوا پێی خۆشە، بێگومان خوای گەورە بە لێبووردنی خـۆی

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٦/٢٦٤)، و مسلم (١٩٤١)، والترمذي (٢٤٣٦)، و احمد في المسند (٢/٤٣٥).

لێی لادەبات، بەتەوبە و گەڕانەوە و کاری چاکە و تاقی کردنەوە و شەفاعەت و ئـەو کارە چاکانەی خراپە لا دەبەن لادەچێت، ئەگەرچی گوناهەکانی بەندە بگاتە تـاقی ئاسمانیش ئەگەر داوای لێبووردن لە خوا بکات خوا لێی دەبوورێت، ئەگەر بەندە بە ئەندازەی زەوی گونـاهی هـەبێت، ئینجا بـە خـوا بگاتـەوە شـەریکی بـۆ خـوا بڕیـار نەدابێت ئەوە خوا بە ئەندازەی زەوی لێبووردنی بۆ ئامادە دەکات.

خوای گەورە لە گوناه دەبوورێت ئەگەرچی گەورەش بێت، شوێنەواری گوناه بـە کەمترین هەوڵدانی بەندە دەسڕێتەوە، بە تەوبەی ڕاسـتگۆیانە و پەشـیمان بوونـەوە لەسەر ئەوەی ئەنجامی داوە لێی دەبوورێت، ئەمەش تەنها لەبـەر ئـەو کارانەیـە کـە پێی خۆشە کە تەوبەکردنی بەندەیە و گوێڕایەڵی و یەکتاپەرستیە، ئەوەش بەڵگەیـە لەسەر ئەوەی هەبوونی ئەو کارانەی زۆر پێخۆشە.

حەفدەهەم: خوای گەورە ئەو کارانەی تەقدیر کردووە کـە پێـی ناخۆشـە و لێـی تووڕەیە بۆ گەیشتنە بەو شتانەی کە پێی خۆشە و فەرمانی پێکردووە.

دەبینین خوای گەورە بە تەوبـەی بەندەکـەی زۆر خۆشـحاڵترە لـەو کەسـەی کـە شتێکی لـی وون بـووە پاشـان دەیدۆزێتـەوە، وە لـەو کەسـەی کـە منـداڵیان نابێـت پاشان منداڵیان دەبێت، وە لەو کەسەی کە ڕێی لێ وون بووە پاشان دەیدۆزێتەوە.

پێغەمبەریش ﷺ نموونەیەك بە خۆشحاڵی خـوا دێنێتـەوە کاتێـك کـە بەندەکـەی تەوبە دەکات کە وێنەی نیە ئەو خۆش حاڵیەی خواش مرۆڤ بەو کارانە دەیگاتێ کـە فەرمانیان پێکراوە کە تەوبەیە.

خوا گوناه تەقدیر دەکات بۆ گەیشتن بەو شتەی کە پێـی خۆشـە، جـا مەبەسـت بەو خۆش حاڵیەی خوا بـە تەوبـەکردنی بەندەکەیـەتی کـە هـیچ خـۆش حالیـەکیش وێنەی ئەم خـۆش حالیـە نیـە، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئەنجامـدانی فـەرمان پێکراوەکان زۆر خۆشەویستترە لای خوا لە وازهێنان لەقەدەغەکراوەکان کە تەوبـەو شوێنەواری تەوبەشی پێ دەفەوتێ.

ئەگەر گووترا: خوا خـۆش حاڵـە بـە تەوبـەی بەندەکـەی تەوبـەش وازهێنانـە لـە قەدەغەکراوەکان، کەواتـە دەکات خوا خۆش حاڵە بە وازهێـنانی قەدەغـەکراوەکان،

لەوەلامـدا گـووتراوە: ئەمـە بـەم شـێوەیە نیـە، چـونکە بـە تـەنها وازهێنـان لـە قەدەغەکراوەکان ئەم خۆشحاڵیە ناگەیەنێت، مەدحیش ناکرێ و پاداشتیشی لەسەر وەرناگیرێت، تەوبـەش بـە تـەنها وازهێنـان نیـە لـە قەدەغـەکراوەکان، ئەگـەر چـی وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان یەکێکە لـە تایبـەت مەندیـەکانی تەوبـە، بـەڵام تەوبـە ئەنجامدانی کارە کە تەوبـەکار ڕوو دەکاتـە پـەروەردگاری و پەشـیمان دەبێتـەوە و گوێڕایـەڵی خـوا دەکـات. یـەکێکیش لـە تایبـەت مەندیـەکانی تەوبـە وازهێنـان لـە قەدەغەکراوەکانـە بۆیـە خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ﴾ (هود:٣). واتـە: داوای لێخۆشـبوون لـە پـەروەردگارتان بکـەن، پاشـان تەوبـە بکەن و بگەڕێنەوە لای.

تەوبەکردن تەنها وازهێنان نیە لە قەدەغەکراوەکان، بەڵکو وازهێنانە لـەو شـتەی کە خوا پێی ناخۆشە بۆ ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە خوا پێی خۆشە، چونکە ئەگەر کەسێك تەنها واز لە گوناه بێنێت، ڕوو نەکاتە ئەو کارانەی کە خوا پێی خۆشە پێـی ناگوترێ تەوبەکار، کەواتە تەوبەکردن تەنها وازهێنان نیە لە گوناه بـەڵکو وازهێنانـە لە گوناهەکە و ڕووکردنە خوا و پەشیمان بوونەوەشە.

هەژدەهەم: فەرمان پێکراوەکان ئەگەر مـرۆڤ ئـەنجامی نـەدات دەکـات ژیـانی لـە دەست داوە حیسابی مردووی بۆ دەکرێت خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفـەرمووێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾(الأنفـــال: ٢٤). واتـە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە وەڵامی بانگەوازی خـوا و پێغەمبـەر بدەنەوە کاتێك بانگتان دەکەن بۆ شتێك کە دەتانژێنێتەوە و ژیان لای ئێوەی پێوە بەندە.

دەفــــەرمووێ: ﴿أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَـٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَـٰتِ﴾(الانعام: ١٢٢). واتـە: ئایا ئـەو کەسـەی کـە مـردوو بـوو بـە هـۆی بـێ باوەڕیـەوە، ئینجـا بـە هـۆی ئیمانـەوە زینـدوومان کـردەوە و نـوور و ڕووناکیمـان بـۆ سـاز کـرد لـە ژیانیـدا کـە قورئانـە لـە نـاو خەڵکیـدا هەڵسوکەوتی

پێدەکات، وەکو ئەو کەسە وایە کە لە ناو تاریکاییدا گیری خواردووە و لێی دەرناچێت.

لەبارەی کافرەکانەوەش دەفەرمووێ: ﴿أَمْوَٰتٌ غَيْرُ أَحْيَآءٍ﴾(النحل:٢١).

واتە: ئەوانە مردوون زیندوو نین.

خوای گەورەدەفەرمووێ: ﴿إِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ﴾(النمل:٨٠).

واتە: تۆ ناتوانی مردوو ببیستێنی.

بەڵام قەدەغەکراوەکان ئەگەر مرۆڤ ئەنجامی بدات، ئەوە تووشی نەخۆشی دەروونی دەکات، بەڵام ژیان بە نەخۆشیەوەش بێت هەر باشترە لە مردن.

جا ئەگەر گوترا: هێندێ لە قەدەغەکراوەکان هەیە ئەگەر مرۆڤ ئەنجامی بدات بە هیلاکی دەبات ئەویش شیرك بڕیاردانە بۆ خوا، لە وەڵامدا گوترا: مرۆڤ بە ئەنجام نەدانی یەکتاپەرستی بە هیلاك دەچێت ئەم یەکتاپەرستیەش فەرمانی پێکراوە و ژیانی مرۆڤی پێوەیە، کەواتە هەر کاتێك پشتی لە یەکتاپەرستی کرد بە هیلاك دەچێت، ئەمەش بۆیە بە هیلاك چووە چونکە دەستی لە فەرمان پێکراو هەڵگرتووەو ئەنجامی نەداوە.

بیستەم: ئەنجام نەدانی فەرمان پێکراوەکان مرۆڤ تووشی سەرگەردانی و هیلاکی بەردەوام دەکات، بەڵام قەدەغەکراوەکان بەم شێوە نیە.

بیست ویەکەم: ئەنجامدانی ئەو کارانەی خودا فەرمانی پێکردووە وا لە مرۆڤ دەکات قەدەغەکراوەکان واز لێ بهێنێت ئەگەر مرۆڤ بە ئیخلاص و شەرعیانە فەرمان پێکراوەکان ئەنجام بدات خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾(العنکبوت:٤٥). واتە: بێگومان ئەنجام دانی نوێژ مرۆڤ دوور دەکاتەوە لە گوناه و شتی خراپ.

بەڵام وازهێنان لە قەدەغەکراوەکان وا لە مرۆڤ ناکات کاری چاکە ئەنجام بدات.

بیـست و دووەم: ئـەو کارانــەی کـە خـوا پێـی خۆشــە و فــەرمانی پێکــردووە پەیوەستە بە سیفاتی خـواوە، ئـەو کارانـەش کـە خـوا پێـی ناخۆشـە و قەدەغـەی کـردووە پەیوەسـتە بـە کارتێکراوەکـان، ئەمـە باسـێکی گرنگـە پێویـستی بـە ڕوون کردنـەوە هەیـە بۆیـە دەڵـێین: قەدەغـەکراوەکان خراپەیـە سـەریش دەکێـشێت بـۆ خراپە، فەرمان پێکراوەکان چاکەیە سـەریش دەکێـشێت بـۆ چـاکە، هـەموو خێـر و چاکەیەکیش بەدەستی خوای گەورەیـە، بـەڵام شـەڕ و خراپـە پاڵنادرێتـە لای خـوا، چـونکە شــەڕ و خراپــە لــە ســیفات و کــارو ناوەکــانی خــودا نیــە، بــەڵکو لــە کارتێکراوەکاندایـە لەگـەڵ ئەوەشـدا شـەڕە بـە نیـسبەت بەنـدەوە، بـەڵام لـە ڕووی پاڵدانە لای خـواوە ئـەوە شـەڕ نیـە، جـا ئەنجامـدانی قەدەغـەکراوەکان بەنیـسبەت بەندەوە شـەڕی بـۆ سـاز دەکـا، ئـەنجام نـەدانی فـەرمان پێکراوەکـان و لـە چـەنگ چوونیان، خێرو چاکەی لە چەنگ دەچێت کە بە نەمانی شەڕی بۆ فەراهەم دێت.

# باسی زیکری خوا و شوکرانە بژێری

دین بیناکراوە لەسەر دوو بنچینە:

١. الذکر: زیکری خـــوا.

٢. الشکر: شوکرانە بژێری.

خـــوای گـــەورە دەفــــەرمووێ: ﴿فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ﴾ (البقرة:١٥٢)، واتـە: ئەگەر یادی من بکەن منـیش یـادی ئێـوە دەکـەم، وە شـوکرانە بژێری من بکەن کوفرانەم مەکەن.

پێغەمبەرﷺ بە (معاذ)ی فـەرموو: (( واللە إِنِّی لأُحِبُّكَ فلا تنـسی أن تقول دُبُـرِ كُـلِّ صلاة، اللَّهُمَّ أعِنِّی عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ))[1]. واتـە: سوێند بـە خـوا –ئـەی معاذ ــ من تۆم خۆش دەوێت، نەکەی لـە بـیر کـەی دوای هـەموو نوێـژەکانت بڵـێ: خوایە یارمەتیم بدە لەسەر یاد کردنت و سوپاس کردنت و چاك پەرستنت.

جا مەبەست بە زیکری خـــوا تەنها زیکر نیە بە زمان، بـەڵکو مەبەسـت بـە زیکـر زیکری دڵ و زمانیشە.

زیکر و یادی خوا ئەمانە هەمووی دەگرێتەوە یادکردنی ناو و سـیفاتەکانی خـوا و ئەنجامــدانی فــەرمان پێکراوەکــان و وازهێنــان لــە قەدەغــەکراوەکان و قورئــان خوێندنیش دەگرێتەوە.

جا ئەم یادکردنە بەم شێوە سەردەکێشێت بۆ ناسینی خـوا و ئیمـان پێهێنـانی و ناسینی سیفاتە بەرز وبڵندەکانی و سـوپاس و سـتایش کردنـی بـە هـەموو جۆرێـك، ئەمانەش تەنها بە یەکتاپەرستی خوا پتەو دەبێت.

---

(١) صحیح: رواه النسائی (٣/٥٣)، و ابو داود (١٥٢٢)، و احمد فی المسند (٥/٢٤٥و٢٤٧)،.

زیکر کردنی ڕاستەقینەی خوا دەبێت بەم شێوەبێت، دەبێت باسی نیعمەت و چاکە و بەخششەکانی خوا بۆ خەڵکی ڕۆشن بکاتەوە.

بەڵام شوکرانە بژێری هەڵسانە بە گوێڕایەڵی کردنی خوا و ئەنجامدانی ئەو کارانەی لە خوات نزیك دەکات بە دڵ و لاشە.

کەواتە: ئەو دووانە (الذکر)و(الشکر) کۆکەرەوەی دینن، چونکە بە زیکرکردنی خودا مرۆڤ دەگات بە خواناسی، شوکرانە بژێریشی گوێڕایەڵی و بەندایەتی خوای لە خۆ گرتووە.

هەر لە پێناوی ئەم دووانەش جنۆکە و ئینسان و ئاسمانەکان و زەوی دروست کراوە، هەر لە پێناوی ئەم دووانەشە پاداشت و سزا دانراوە، خوا کتێبەکانی ڕەوانەکردووە، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) ڕەوانەکراون، هەر ئەمەش حەق و ڕاستە کە ئاسمانەکان و زەوی لە پێناویدا دروست کرێت، ئەوەی پێچەوانەی ئەوەیە هەمووی پوچە و گومانی دووژمنانی خوایە.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ (ص: ٢٧). واتە: ئێمە ئاسمان و زەوی و دروست کراوەکانی نێوانیان بێ هوودە و هەڕەمەکی دروست نەکردووە، بەڵکو ئەوە گومانی ئەو کەسانەیە کە کافر و بێ بڕوان.

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ (الدخان: ٣٨). واتە: ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لە نێوانیشیان دایە بە گاڵتە و بێ هوودە دروست نەکردووە، بەڵکو لەسەر حەق و ڕاستی دروستمان کردوون.

لە ئایەتێکی تر دەفەرمووێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ﴾ (الحجر:٨٥). واتە: ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە نێوانیشیاندا هەیە بە حەق و ڕاستی دروستمان کردووە، بێگومان ڕۆژی قیامەتیش بەڕێوەیە و دێت.

خوای گەورە لە سوورەتی (یونس) دوای ئەوەی باسی بەڵگە و نیشانەکانی خۆی دەکات ئینجا دەفـەرمووێ: ﴿مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾(یونس:٥). واتـە: خوای گەورە ئەوانەی بێ هوودەدروست نەکردووە،بەڵکو هەمووی لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی بەدیهێناوە.

هـەروەها دەفــەرمووێ: ﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾ (القیامـة:٣٦)، واتـە: ئایـا ئینسان وا دەزانێت پشت گوێ دەخرێ و لێ پرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت؟

خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـر دەفــەرمووێ:﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾ (المؤمنون:١١٥)، واتـە: ئایا وا گومان دەبەن کـە ئێوەمـان بێ هوودە دروست کردووە، ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە؟

هـەروەها دەفــەرمووێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾(الـذاریات:٥٦)، واتـە: من جنۆکە و ئینسانم تەنها بۆ بەندایەتی دروست کرووە.

خوای گەورە لە ئایەتێکی تر دەفــەرمووێ ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا﴾ (الطلاق: ١٢)، واتـە: خـوای گـەورە حـەوت چـین ئاسمـانی دروسـتکردووە، زەویشی بە وێنەی ئەوان دروستکردووە، فـەرمانی خـوا لـە نێوانیانـدا دادەبـەزێت و جێبـەجێ دەبێـت، بـۆ ئـەوەی بـزانن کـە بەڕاسـتی خـوا دەسـەڵاتی بەسـەر هـەموو شتێکدا هەیە، بێگومان خوای گەورە بە زانسـت و زانیـاری خـۆی گـەمارۆی هـەموو شتێکی داوە.

خوای گەورە لـە ئایـەتێکی تـر دەفــەرمووێ: ﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ۚ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾ (المائدة:٩٧)، واتـە: خـوای گـەورە کەعبـە کـە (البیـت الحـرام)ە کردوویـەتی بـەهۆی هەسـتانەوە و بوژاندنـەوەی خـەڵکی ـــ

لەهەردوو دنیـادا ــ هـەروەها مانگـە حەرامـەکانیش و دیـاریی و قوربانیـە دیـاری کراوەکانیش، ئەوەش بۆ ئەوەیە کە بزانن و دڵنیا بن کە خوا ئاگادارە بەهەرچـی لـە ئاسمانەکاندایە و هەرچی لە زەویدا هەیە، بەڕاستی خوا بە هەموو شـتێك بـە ئاگـا و زانایە.

کەواتە لەوەی ڕابردوو بۆمان دەرکـەوت کـە دروسـتکردنی بوونـەوەر بـۆ ئەوەیـە زیکری خوا بکەن و شوکرانە بـژێری خـوا بکـەن، دەبێـت یـادی خـوا بکرێـت لـە بـیر نەکرێت، سوپاسی بکرێت و کوفرانـەی نـەکرێت، بێگومـان خـوای گـەورە یـادی ئـەو کەسە دەکات کە یادی دەکات، سوپاسی ئەو کەسە دەکات کە سوپاسـی دەکـات، جا یادکردنی خوا هۆیەکە بۆ یادکردنی مرۆڤ، سوپاس کردنی خوا هۆیەکە بـۆ زیـاتر پێ بەخشینی.

زیکری خوا پەیوەستە بە دڵ و زمان، سـوپاس کردنـی خـواش پەیوەسـتە بەدڵ و خۆشەویستی و پەشیمانی، ستایش و حەمـدیش پەیوەسـتە بـە زمـان، گوێڕایەڵی و ملکەچی پەیوەستە بە ئەندامەکانی لاشە.

# ڕێگای سەرفرازیی و گومڕایی

کاروکردەوە جا بە دڵ بێت یان بە لاشە ئەگەر باشە بێت هۆیەکە بۆ هیدایەت، ئەگەر خراپەش بێت هۆیەکە بۆ گومڕایی، مرۆڤ چەند کاروکردەوەیەك بە دڵ یان لاشە ئەنجام دەدات سەر دەکێشێت بۆ هیدایەت، یان بۆ گومڕایی.

کەواتە: کاروکردەوەی چاکە بەروبوومەکەی ئەوەیە سەردەکێشێت بۆ هیدایەت، هەرکاتێك مرۆڤ کاروکردەوەی چاکەی زیاتر بێت خوا زیاتر هیدایەتی دەدات.

کاروکردەوەی خراپەش بەروبوومەکەی ئەوەیە سەردەکێشێت بۆ گومڕایی، چونکە خوای گەورە کاری چاکەی خۆشدەوێت و بۆیە لە پاداشتی ئەم کارە چاکانە پاداشتی مرۆڤ بە هیدایەت و سەرفرازی دەداتەوە، ڕقیشی لە کاری خراپەیە جا بۆیە لە پاداشتی ئەم کارە خراپانە سزای مرۆڤ بە گومڕایی و سەرگەردانی دەداتەوە، چونکە خوای گەورە بۆ خۆی چاکەکارە، چاکەکاریشی خۆش دەوێت، دڵی چاکەکارانیش لە خۆی نزیك دەکاتەوە بە ئەندازەی چاکەکانیان، ڕقیشی لە خراپە و خراپەکارانە دڵی خراپەکارانیش لە خۆی دوور دەکاتەوە بە ئەندازەی خراپەکانیان.

بەڵگە لەسەر بنچینەی یەکەم: کە کاروکردەوەی چاکەیە و سەردەکێشێت بۆ هیدایەت خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢﴾ (البقرة: ١ـ٢)، واتە: ئەم کتێبە ـ کە قورئانە ـ هیچ گومانی تیا نیە هیدایەت و ڕێنمویی کارە بۆ چاکەکاران و تەقواکاران.

ئەمە دوو شتی لە خۆ گرتووە:

یەکەم: خوای گەورە بەم قورئانە ئەو کەسانە هیدایەت دەدات کە پێش ئەوەی کتێبی خوا نازل بێت ئەوان کاری چاك و باشیان ئەنجامداوە، چونکە هەموو چینەکانی خەڵکی ئەوە دەزانن کە خوا ڕقی لە ستەم و داوێن پیسی و فەساد

بڵاوکردنەوەیە لەسەر زەویدا و ئەوەی ئەو کارە دەکات خۆشی ناوێت، بەڵکو پێی خۆشە دادپەروەری و چاکە و ڕاستگۆیی و چاکسازی لەسەر زەویدا بڵاوبێتەوە، ئەوەی ئەو کارەش ئەنجام بدات خۆشی دەوێت.

کاتێك قورئانی نازڵ کرد، هیدایەتی ئەو چاکەکارانەی دا بۆ ئیمان لە پاداشتی ئەو چاکانەی ئەنجامیان دەدا و گوێڕایەڵی خوایان دەکرد.

ئەو کەسانەش کە خراپەکار و داوێن پیس و ستەم کاربوون گومڕای دەکردن و هیدایەتی نەدەدان.

دووەمیشیان: بەندە کە ئیمانی بە قورئان هێنا و بەڕاستی زانی و گوێڕایەڵی کرد، ئەوە بە گوێرەی ئەم قورئانە هیدایەت وەردەگرێت، ئا ئەو ئیمان هێنانەی هۆیەکە بۆ سەرکێشان بۆ هیدایەتی تر، چونکە هیدایەت کۆتایی نایەت ئەگەرچی بەندە بشگاتە چەڵەپۆپەش، لەبەر ئەوەی لەسەر هیدایەتی خۆی هیدایەتی تری بەدوا دا دێت لە دوای ئەویش هیدایەتی تر بەدوا دا دێت تا کۆتایی نایەت.

کەواتە: هەر کاتێك بەندە زیاتر تەقوای پەروەردگاری بکات زیاتر بەرز دەبێتەوە بۆ هیدایەتی تر، بەو جۆرە بەردەوام هیدایەتی زیاتر دەبێت مادام بەندە تەقوای زیاتر بێت.

هەر کاتێکیش تەقوای کەمتر بێت هیدایەتیشی کەمتر دەبێت بە پێی نەمانی تەقواکەی، هەر کاتێ زیاتر تەقوای خوا بکات ئەوە هیدایەتی زیاتر دەبێت هەر کاتێ هیدایەتی زیاتر بێت تەقوای زیاتر دەبێت خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ ۚ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَـٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَـٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ (المائدة:١٥ـ١٦)، واتە: بێگومان ئێوە لەلایەن خوداوە بە ناردنی ئەو پێغەمبەرە رووناکیەکی گەورە و ئاشکراتان بۆ هاتووە, بەهۆی ئەم قورئانەوە خودا هیدایەتی ئەو کەسانە دەدات کە

خۆیان دەیانەوێت شوێن ڕەزامەندی خودای پەروەردگار بکەون, هیدایەتیان دەدات بەرەو ڕێگایەکی ئاشتی و دلنیایی, هەروەها خودا ئیمان دەخاتە دڵیان و بە فەرمانی خۆی لە تاریکایی ڕێگاو ڕێبازە تاریك و چەوتەکان دەریان دەهێنێت ودەیانخاتە ناو ڕووناکی باوەڕ و ئایینی ڕاستەوە, ڕێگای ڕاستی ژیانیان بۆ ڕوون دەکاتەوە ڕێنماییان دەکات بۆ سەر ئەو ڕاستە شەقامە و هیدایەتیان پێ دەبەخشێت تابیگرنە بەر و لێی لانەدەن.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾ (الشورى: ١٣)، واتــە:خـوای گـەورە کەسـانی شایستە هەڵدەبـژێرێت بـۆ گەیانـدنی ئاینەکـەی و ڕێنمـوویی خـەڵکانێك دەکـات کـە بگەڕێنـەوە بـۆ لای بەرنامەکەی.

هەروەها دەفـەرمووێ: ﴿سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ﴾(الاعلى:١٠)، واتـە: بێگومان ئەوەی لـە خوا بترسێت سوود لە ئامۆژگاریەکانت وەردەگرێت.

خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـر دەفـەرمووێ: ﴿وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ﴾ (غافر:١٣)، واتــە: کـەس بـیر ناکاتـەوە و پەنـد وەرنـاگرێ مەگـەر کەسـێکی ڕوو لـە خودابێ

خـــوای گەورەدەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَـٰنِهِمْ﴾ (یـونس:٩)، واتــە: بەڕاسـتی ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوە و کـار و کردەوەی چـاکیان ئەنجامـداوە، بـەو ئیمانـەی کـە هەیانـە پـەروەردگاریان ڕێگایـان نیشان دەدات.

یەکەمجار خوا ڕێنمووییی کردوون بۆ ئیمان، جا کاتێك کە ئیمانیان هێناوە دیسان هیدایەتیان دەدات بۆ ئیمان، وێنەی ئەمە ئەو ئایەتەیـە کـە دەفـــەرمووێ: ﴿وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ هُدًى﴾ (مریم:٧٦)، واتـە: ئەوانەی ڕێبـازی هیدایـەتیان گرتۆتـە بەر خوا زیاتر هیدایەتیان دەدات.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا ﴾ (الانفال:٢٩)، واتــە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتـان هێنـاوە، ئەگـەر تـەقوای خوا بکەن، ئەوە خوا بەرچاو ڕۆشنایەکی تەواوتان بۆ فەراهەم دێنێت ـ کە حـەق و ناحەقی پێ بناسن.

لە تایبەت مەندیەکانی (الفرقان) ئەوەیە کە نوورێك بە مرۆڤ دەبەخشێت حـەق و ناحەقی پێ جیا بکاتەوە، عیزەت و سەرکەوتن بە مـرۆڤ دەبەخـشێ کـە حـەقی پـێ سەردەکەوێت و نا حەقی پێ دەتوێتەوە، بەهەمان شێوەش قورئان بەو دووانە ڕاڤە کراوە.

خـوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾(سـبأ: ٩)، واتــە: بەڕاسـتی لەمانــەدا نیـشانەی ڕوون و ئاشـکرا هەیــە، بـۆ هــەر بەندەیــەك گەڕابێتەوە لای خوا.

هــەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأَيَـٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ﴾(لقمـان:٣١)، واتـە: بەڕاستی لەوانەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە، بۆ کەسێك کـە زۆر ئـارامگر و شوکرانە بژێربێت.

خوای گـەورە ئـەوە ڕوون دەکاتــەوە کـە کەسـانێك سـوود لـەم بەڵگـە و نیـشانە بەرچاوانە وەردەگـرن کـە ئـارامگر و شـوکرانە بـژێر بن، هـەروەکو چـۆن ڕوونیشی کردۆتەوە کە کەسانێك سوود لە ئایەتـەکانی قورئـان وەردەگـرن کـە تـەقوادار و لـە خوا ترس بن و پەزامەندی خوایان مەبەست بێـت، کەسـێك یادەوەری ئـەم قورئانـە وەردەگرێت کە ترسـی خـوای لـە دڵدا بێت هـەر وەك خـوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴿٣﴾﴾(طـە:١ ـــ ٣)، واتــە: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ ئێمـە ئـەو قورئانـەمان دانەبەزاندۆتـە سـەر تـۆ تـا تووشی پـەژارە بیت، بـەڵکو ئـەو قورئانـە یادخەرەوەیە، بۆ کەسێك کـە لـە خـوا دەترسێت.

خــوای گــەورە لــەبارەی قیامەتــەوە دەفــەرمووێ: ﴿إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا﴾ (النازعات:٤٥)، واتــە: بێگومان ئەرکی تۆ تەنها بێدار کردنەوەی ئەو کەسانەیە کە لـە قیامەت دەترسێن.

بەڵام کەسێك کـە ئیمـانی بـەو ڕۆژە نـەبێ و خـۆی بـۆ ئامـادە نـەکردبێ و لیێـی نەترسـێ، ئـەوە نەسـوود لـە بەڵگـە و نیـشانەکانی خـوا وەردەگرێـت نـە سـوود لـە ئایەتەکانی قوورئانیش وەردەگرێت، هـەر لەبـەر ئەمەشـە خـوای گـەورە کاتێـك لـە سـورەتی (هـود) باسـی سـزادانی ئـەو گەلانـە دەکـات کـە پێغەمبـەرانیان بـە درۆخستۆتەوە لە تۆڵەی ئەوەش خوای گەورە هـەر لـە دنیـادا لـەناوی بـردن، پـاش ئـــەم بەســـەرهاتە دەفـــەرمووێ: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ ٱلْءَاخِرَةِ﴾ (هو:١٠٣)، واتـە: بەڕاستی لەو بەسەرهاتانەدا نیشانە و پەند و ئامۆژگـاری هەیـە بـۆ کەسێك کە لە سزای دوا ڕۆژ بترسێت.

لێرەدا خوای گەورە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەو گەلانەی بـەم شـێوە سـزا داوە تاکو ببێت بە پەند بۆ ئەوانەی لە سزای دوا ڕۆژ دەترسێن، بەڵام ئـەم بەسـەرهاتانە نابێت بە پەند بۆ کەسێك کە ئیمـانی بـە دوا ڕۆژ نـەبێ و لـە سـزای خـوا نەترسـێت، بەڵکو کاتێك شتی وا ببیـستێ دەڵێـت: ئەمـە زەمانـە شـتی چـاك و خراپـی تیـا ڕوو دەدات، خۆشی و ناخۆشی تیا ڕوودەدات، ئاسوودەیی و ناڕەحەتی تیا دەبینرێت.

دەڵێت: لەوانەیە هۆیەکی گەردوونی بێـت ئـەم کارەسـاتە ڕووی دابێـت، چـەندین قسەی پڕووپوچی لەم شێوەیە دەکەن.

جا ئەوەش بزانە ئـارامگرتن و شـوکرانە بـژێری هۆیـەکن بـۆ سـوود وەرگـرتن لـە نیشانە و ئایەتەکانی خوا، چونکە ئیمـان بینـا کـراوە لەسـەر ئـارامگرتن و شـوکرانە بژێری، دەکات نیوەی ئیمان پێکهاتووە لە ئارامگرتن و نیوەکـەی تریـشی شـوکرانە بژێریە، جا هێزی ئیمانی بەندە بە ئەندازەی ئارامگرتن و شوکرانە بژێریەکەیەتی.

کەواتـە: کەسێك سوود لە ئایەت و نیشانەکانی خوا وەردەگرێت کـە ئیمـانی بـە خوا هەبێت، ئیمانیشی کامل نابێت مەگەر بە ئارامگرتن و شـوکرانە بـژێری نـەبێت،

چونکە سەری شوکرانە بژێری یەکتاپەرستیە، سەری ئارامگرتنیش وەڵام نەدانەوەی بانگ خوازی ڕێبازی هەوا و ئارەزوواتە.

بـەڵام ئەگـەر موشـریك بـوو و شـوێنی هـەوا و ئـارەزوواتی خـۆی کـەوت ناکـات ئـارامگرو شـوکرانە بـژێرە، ئایـات و نیـشانەکانی خـواش سـوودی پـێ ناگەیـەنن و کاریشی تێناکەن بۆ ئیمان.

بەڵگـەش لەسـەر بنـچینەی دووەم: ئـەویش ئەوەیـە کـە خراپـەکاری و خـۆ بـە گەورەزانی و درۆ سەر دەکێشێت بۆ گومڕایی هەر وەك خوای گـەورە دەفــەرمووێ: ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾(البقـرة:٢٦ــ٢٧)، واتــە: زۆرێکـی پـێ گـومڕا دەکات و زۆرێکی تریشی پێ هیدایەت دەدات، بەڵام دیارە جگە لە تاوانباران کەسی تر گومڕا ناکـات، ئەوانـەی پـەیمانی خـوا هەڵدەوەشـێننەوە دوای پتـەوبوونی، ئـەو پەیوەندیانەش دەپسێنن کـە خـوا فـەرمانی گەیانـدنی داوە، لـە زەویشدا تـاوان و خراپە دەچێنن، ئا ئەوانە خۆیان زەرەرمەند و خەسارەت مەندن.

خوای گەورە لە ئایەتێکی تردەفـەرمووێ: ﴿يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾ (ابراهيم:٢٧)، واتـە: خوای گەورە لە دنیا و قیامەتدا، بە قسەی پتەو ئیمانداران ڕاگیر دەکات، ستەم کارانیش گومڕا دەکات، خودا چۆنی بوێت وا دەکات.

هــــــەروەها دەفـــــــەرمووێ: ﴿فَمَا لَكُمْ فِى ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيْنِ وَٱللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓا۟﴾(النـساء: ٨٨)، واتــە: ئـەوە چـیتانە دەربارەی منافقـەکان بـوون بـە دوو دەستەوە؟! لە کاتێکدا خوا وەری گێڕاونەتەوە بۆ سـەر بـێ بـاوەڕی بـە هـۆی ئـەو کردەوانەی کە کردویانە.

خـــوای گـــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ﴾(البقرة:٨٨)، واتـە: ـ جوولەکەکان ـ دەیان گوت: دڵەکانمان داخراوە ـ لە ئاست گوفتاری تۆدا ـ نەخێر وانیە، ئەوانە خوا نەفرینی لێکردوون بەهۆی کوفر و خوا نەناسیانەوە، کەوا بوو بە کەم شت بڕوا دەکەن.

هەروەها دەفـەرمووێ: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾ (الانعام: ١١٠)، واتـە: دڵ و دیدەی ئەوان لە کار دەخەین، هەر وەك چۆن یەکـەمجار ئیمانیان بە قورئان نەهێنا.

خـوای گـەورە لێـرەدا ئـەوە ڕوون دەکاتـەوە کـە سـزای داون، چـونکە کاتێـك حەقیات بۆ هات کە قورئانە پشتیان تێکرد و ئیمانیـان پـێ نـەهێنا، جا بۆیـە دڵ و دیدەی لە کارخستن و دووری کردن لە ئیمان هەر وەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ﴾(الانفال:٢٤)، واتـە: ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێنـاوە وەڵامی بانگەوازی خوا و پێغەمبەرﷺ بدەنەوە کاتێك بانگتـان دەکـەن بۆ ڕێبازێـك کە ژیانەوەی ئێوەی تیایە، چاك بزانن بەڕاستی خوا دەتوانێـت دەسـەڵاتی بکەوێتـە نێوان ئادەمیزاد و ـ ئاواتەکانی ـ دڵیەوە.

لێـرەدا خـوای گـەورە فـەرمان بـە مـرۆڤ دەکـات کـە وەڵامـی بانگـەوازی خـوا و پێغەمبەرﷺ بدەنەوە کاتێك بانگیان دەکەن بۆ شتێك کـە ژیانـەوەی ئـەوانی تیایـە ـ کە ئیسلامە ـ پاشان ئاگاداریان دەکاتەوە کە نەکەن ئەم بانگەوازە پـشت گـوێ بخەن و لێی لادەن و وەڵامی نەدەنەوە، چونکە ئەوە دەبێت بەهۆی ئەوەی ببێت بە لەمپە لە نێوان ئادەمیزاد و دڵیدا.

خـــوای گـــەورە دەفـــــەرمووێ: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾(الـصف:٥)، واتــە: کاتێـك ئـەوان گوێیـان بـۆ ڕاسـتی نـەگرت و لـە حـەق لایاندا، خوای گەورەش دڵەکانیانی لـە خـشتە بـرد و مـۆری پێوەنـا، چـونکە خـوای گەورە ڕێنموویی گەلێك ناکات کە تاوانبار و لە سنوور دەرچووبن.

هــەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾(المطففــين:١٤)، واتـــە: نـەخێر، وانیـە بـەڵكو دڵیـان ژەنگـی هێنـاوە، لەسـەر ئـەنجامی ئـەو كـارو كردەوانەی كە دەیانكرد.

خوای گەورە لێرەدا ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە ئەو كاروكردەوانەیان بۆتە پەردە و دڵی داپۆشیون، بە جۆرێك وای لێكردوون ئیمان بە ئایەتەكانی خوا نەهێنن بۆیە بـە قورئانیــان دەگــووت: ﴿أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾ (المطففــین:١٣)، واتـــە: ئەمــە ئەفـسانەی پێشینانە و باوی نەماوە.

خوای گەورە دەربارەی مونافیقەكان دەفـەرمووێ: ﴿نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ﴾ (التوبة: ٦٧)، واتـە: ئەوانە خوایـان فـەرامۆش كـردووە و لـە بـیر خۆیـان بردۆتـەوە، جا لـە سزای ئەوەی خوایان لە بیر كردووە خوای گەورەش فەرامۆشی كردن لە هیدایـەت و رەحمەتی خۆی.

خوای گەورە لێرەدا ئەوە ڕوون دەكاتەوە كە وای لێكردن خۆیان لە بیر بكەن بەوەی كە داوای زانیاری بەسوود و كردەوەی چاك نەكەن كە ئەم دووانە هیدایەتن بۆ مرۆڤ، جا بۆیە داواكاری و خۆشەویستی و ناسینی ئەمەیان لەبیر چووە لە سزای ئەوەیە كە خوایان فەرامۆش كردووە خوای گەورە دەربارەیان دەفـەرمووێ: ﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ ﴿١٦﴾ وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ﴾ (محمد:١٦ـ١٧). واتـە: خودا مۆری بەسەردڵیانەوە ناوە و شوێن هەواو ئارەزوواتی خۆیان كەوتن، ئەوانەش كە هاتونەتە سەر ڕاستە ڕێ، زیاتر شارەزایان دەكات و ترسی خۆیان دەخاتە دڵــەوە.

لێرەشدا خوای گەورە شوێنكەوتنی هــەواو گـومڕایی پێكـەوە كۆكردۆتـەوە، بەڵام بۆ ئەوكەسانەی كە ئیماندارن تەقوا و هیدایـەتی پێكەوە كۆكردۆتەوە.

# کۆکردنەوەی هیدایەت و ڕەحمەت پێکەوە، کۆکردنەوەی گومڕایی و بەدکاریش پێکەوە

خوای گەورە لە قورئاندا هیدایەت و ڕەحمەتی پێکەوە کۆکردۆتەوە، بە هەمان شێوەش گومڕایی و بەدکاریشی پێکەوە کۆکردۆتەوە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ﴾ (البقرة:١٥٧)، واتە: ئا ئەوانە چەندەها ستایش و ڕەحمەت بەسەریاندا دەبارێت لەلایەن پەروەردگاریانەوە و ئەوانە ئەو کەسانەن کە ڕێبازی هیدایەتیان وەرگرتووە.

دەربارەی ئیماندارانەوە دەفەرمووێ: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ﴾(ال عمران:٨)، واتە: ئیمانداران دەڵێن: پەروەردگار دوای ئەوەی کە هیدایەتت داین و ڕێنموینیت کردین، دڵەکانمان لامەدە لە ڕێگەی ڕاست و لە ڕەحمەت و بەخششی تایبەتی خۆت، بەهرەوەرمان بکە، چونکە بەڕاستی تۆ بەخشندە و بەخشێنەری.

یاوەرانی ئەشکەوتەکە دەیانگووت: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةٗ وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا﴾(الكهف:١٠)، واتە: پەروەردگارا لەلایەن خۆتەوە رەحمەت و میهرەبانی تایبەتمان پێ ببەخشە و لە سۆزی خۆت بەهرەوەرمان بکە و ڕێگەی ڕزگاری و سەرفرازیمان بۆ بسازێنە لەم کارەماندا.

هەروەها دەفەرمووێ: ﴿لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ مَا كَانَ حَدِيثٗا يُفۡتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَتَفۡصِيلَ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾(یوسف:١١١)، واتە: بێگومان لە بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەند و ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانێك کە ژیر و هۆشمەند بن، وە نەبێت ئەم قورئانە *قسە و باسێك بێت هەڵبەستراوبێت، بەڵکو (ڕاستە) باوەڕدەکا بەوەی لەبەردەستی*

دایە و شیکەرەوەی هەموو شتێکە، وە ڕێ پیشاندەر و ڕەحمەتـە بۆ کەسانێك کـە ئیمانیان هێناوە.

لــە ئایــەتێکی تردەفـــەرمووێ: ﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ (النحل:٦٤)، واتــە: ئـەم قورئانـەمان بۆ دابەزاندووی تاکو بیکەی بە شیکەرەوەی کێشەی خەڵکی و هیدایەت و ڕەحمەتـە بۆ کەسانێك کە ئیمانیان هێنابێت.

هـــــەروەها دەفـــــەرمووێ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ تِبْيَـٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾ (النحل:٨٩)، واتــە: ئەو قورئانەمان بۆ ڕەوانـە کـردووی کـە ڕوون کـەرەوەی هـەموو شـتێکە و هیدایـەت و ڕەحمەتـە و مـژدە دەریشە بـۆ موسڵمانان.

خـوای گـەورە دەفــەرمووێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (یــونس:٥٧)، واتـــە: ئـــەی خەڵکینـــە، بەڕاسـتی ئێـوە ئامۆژگاریـەکی گـەورە و گرنگتـان لـە لایـەن پەروەردگارتانـەوە بـۆ هاتوە ـ کە قورئانە ـ شیفایە بۆ دڵەکانتان، هیدایەت و ڕەحمەتیشە بۆ ئیمانداران.

پاشان خوای گەورە دیسان دووبارەی دەکاتەوە و دەفــەرمووێ: ﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ ﴾ (یونس:٥٨)، واتـە: ئەی پێغەمبـەرﷺ بڵـێ: بـە فـەزڵ و ڕەحمەتی خوا کەیف خۆش بن.

زانایـانی سـەلەف چـەند تەفـسیرێکیان بـۆ (الفـضل و الرحمـة) کـردووە، بـەڵام تەفسیری ڕاست لە بارەی (الفضل و الرحمة)ئەوەیـە کـە دەکاتـە (الهـدی و النعمـة) واتــە: هیدایەت و بەخششی خوایە.

کەواتــە: (الفـضل)ی خـوا دەکـات بەرانبـەر هیدایـەتی خـوا، (الرحمـة)ی خـواش دەکات بەرانبەر بەخششی خوایە، هەر بۆیەش هیدایـەت و بەخـششی خـوا پێکـەوە

هـاتووە، هـەر وەك خـوای گـەورە لـە سـوورەتی (الفاتحـة)دا دەفــەرمووێ: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾ (الفاتحـة: ٦)، واتــە: خودایـە هیدایـەتی سەر ڕێگای ڕاستمان بدە، ڕێگای ئەو کەسانەی بەخششت لەگەڵدا کردوون.

هەروەها خـوای گـەورە بەخشـشەکانی خـۆی بـیری پێغەمبەرەکـەی دێنێتـەوە و دەفـــــەرمووێ: ﴿ أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ۝٦ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ۝٧ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ ﴾(الضحى:٦ ـ ٨)، واتـە: ئایا تۆ هەتیو نەبووی پەروەردگارت پەنایدای، ئـەی سەرگەردان نەبووی هیدایەتی دای لە هەژاری دەولەمەندی کردی.

لێرەدا خوای گەورە هیدایەت دانی و بەخشش لەگەڵ کردنـی پێکـەوە لکانـدووە، بەوەی کە پەنایداوە و دەوڵەمەندی کردووە.

وتەکەی (نوح)یش هەر لەم بارەیەوەیە کە بە گەلەکەی دەفــەرموو: ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَءَاتَىٰنِى رَحْمَةً مِّنْ عِندِهِۦ ﴾(هـود:٢٨)، واتــە: ـ نـوح ـ فەرمووی: ئـەی گەلەکـەم ئەگـەر بێـژم پـەروەردگارم ڕەحمـەتی بـە مـن داهـاتبێ و نیشانەی ئەوم لەلایە و ئێوە ئاگاتان لێ نیە، چۆن دەبینن؟

(شـعیب)یـش بــە گەلەکــەی دەفـــەرموو: ﴿ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ﴾(هود: ٨٨)، واتـە: گەلەکەم ئەگەر بێژم بەڵگەیەکی بەهێزم لە پەروەردگارمەوە لەلایە و هەر ئەویشە بژێوی باشی پێداوم، چۆن دەبینن؟

خوای گەورە لە بارەی (خـضر)یـشەوە دەفــەرمووێ: ﴿ فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَآ ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴾(الكهف: ٦٥)، واتـە: لەوێ بە ندەیـەك لـە بەنـدەکانی ئێمـە ئاشـنا بـوو کـە لـە ڕەحمـەتی تایبـەتی خۆمـان بـەهرەوەرمان کردبوو و زانست و زانیاری تایبەتی خۆمانمان پێ بەخشی بوو.

خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی فـەرموو: ﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ۝٢ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ

﴿نَصۡرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾﴾ (الفـتح:١ ـــ ٣)، واتـــە: ئـــەی پێغەمبـــەرﷺ بەڕاســـتی ئێمـــە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێبەخشیت، تـاکو خـوا لـە هـەموو گونـاهی رابـووردوو و ئایندەشت خۆش بێت و بەخشینەکانی لەسەرت تەواو بکات و بتخاتـە سـەر ڕێگـەی ڕاست و دروست، تاکو سەرکەوتنێکی بەهێزت پێ ببەخشێت.

هـــەروەها دەفــــەرمووێ: ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا﴾ (النـــساء:١١٣)، واتـــــە: ئـــــەی پێغەمبەرﷺ خوای گەورە قورئان و حیکمەتی بۆ دابەزاندوویت و فێری ئەوشتانەی کردوویت کە جاران نەتدەزانی، بەردەوامیش فەزڵی خوا لەسەر تۆ زۆرە.

دەفــەرمووێ: ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا﴾(النـور:٢١)، واتــە: ئەگـەر فـەزڵ و ڕەحمـەتی خـوا نەبایـە لەسـەرتان، ئـەوە هـەرگیز کەسـتان ڕزگاری نەدەبوو و پاك نەدەبۆوە.

جا (الفضل)ی خوا لەم ئایەتەدا هیدایەتی خوایـە، وە (رحمـة)ی خـواش دەکاتـە بەخشش و چاکەی خوا بۆیـان خـوای گـەورە دەفــەرمووێ:﴿فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ﴾ (طە:١٢٣)، واتـە: ئەگەر هیدایـەتی مـن بۆ ئێوە هـات، هـەر کەسێك شـوێنی هیدایـەتی مـن بکـەوێت نـەگومڕا دەبێـت و نـە نارەحەتیش دەبێت.

گـەر خـوای گـەورە هیدایـەت لـە کەسـێك بگرێتـەوە تووشـی گـومڕای دەبێـت، ڕەحمەتیش لە کەسێك بگرێتەوە تووشی نەگبەتی دەبێت.

خـــوای گـــەورە ئـــا ئەمـــەی لەســـەرەتای ســـوورەتی (طـــە)دا باســـکردووە کـــە دەفـــــەرمووێ: ﴿طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ﴿٢﴾﴾(طــە:١ ـــ ٢)، واتـــە: ئێمە ئەو قورئانەمان بۆ نازل نەکردووی تاکو تووشی نەگبەتی بیت.

لێرەدا خوای گەورە نازل کردنی قورئان و نەفسی شەقاوەتی پێکەوە لکانـدووە، هەر وەك لە کۆتـایی ئـەوە ڕوون دەکاتـەوە کـە هـەر کەسـێك شـوێنی ئـەم قورئانـە

بکـــەوێت تووشـــی نەگبـــەتی نابێـــت کـــە دەفـــەرمووێ: ﴿فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ﴾ (طه:١٢٣).

جا هیدایەت و فەزڵ و نیعمەت و ڕەحمەت پێکەو لکاوون لێك جیا نابنـەوە، هـەر وەکو چۆن گومڕای و شـەقاوەت پێکـەوە لکـاوون لێـك جیـا نابنـەوە خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ﴾(القمر:٤٧)، واتـە: بێگومـان تاوانبـاران لە گومڕای و (سعر) دانە.

(الـسعر) کـۆی (سـعیر) ئـەو سـزایەیە کـە مـرۆڤ بـە هـۆی شـەقاوەتەوە تووشـی دەبێت.

خوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ﴾(الاعـراف:١٧٩)، واتـــە: بێگومـان ئێمـە زۆرێـك لـە جنۆکە و مرۆڤمان بۆ دۆزخ داناوە، ئەوانە دڵیان هەیە کەچی حەقی پێی تێناگـەن ، چاویشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە بەڵام حەقی پێ نابیستن، ئا ئەوانە وەکو ئاژەڵ وانە، بەڵکو لە ئاژەڵیش خراپترن، ئەوانە بێ ئاگان لەحەق.

خـوای گـەورە دەربـارەی ئەوانـە دەفـــەرمووێ: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ (الملك:١٠)، واتـە: ئەوانە لە دۆزەخدا دەڵێن: ئەگەر ئێمـە گوێمـان بگرتایـە و بـیر و هۆشمـان بەرانبـەر بـە حـەق بەکاربهێنابایـە نەدەبووینـە هـاورێی دۆزەخ.

هـــەروەها خـــوای گـــەورە هیدایـــەت و دڵخۆشـــی و ژیـــان و کامـــەرانی پێکـــەوە کۆکردۆتـــەوە، گـــومڕای و دڵ تـــەنگی و ژیـــان ناخۆشیشی پێکـــەوە کۆکردۆتـــەوە کـــە دەفـــــــەرمووێ: ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا﴾ (الانعـام: ١٢٥)، واتـــە: هـــەر کەسـێك خـوا حـەز بکـات

هیدایەتی بدات سینەی ئامادە دەکات بۆ ئیسلام، هەر کەسێك خوا بیەوێت گومڕای بکات لەبەرنەشیاوی خۆی دڵی توند دەکات.

هەروەها خوای گەورە هیدایـەت و گەڕانـەوە و پـەشمانی پێکـەوە کۆکردۆتـەوە، گومڕایی و دڵ ڕەقیشی پێکەوە کۆکردۆتەوە کە خـوای گـەورە دەفــەرمووێ: ﴿ٱللَّهُ يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ﴾(الشورى:١٣)، واتـە: خـوای گـەورە کەسـانی شایـستە هەڵدەبـژێرێت بـۆ گەیانـدنی ئاینەکـەی، هیدایـەتی کەسـانێکیش دەدات کە بگەڕێنەوە بۆ لای بەرنامەکەی.

خـوای گەورەدەفــەرمووێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾ (الزمر:٢٢)، واتـە: هاوار بۆ ئەوکەسانەی کە دڵیان ڕەقە لە ئاستی قورئـان و یادی خوا، ئا ئەوانە لە گومڕایی ئاشکرادان.

هیدایەت و ڕەحمەت، ئـەوەی پەیوەستە بـە وانـەش لـە فـەزڵ و نیعمـەت، هـەر هـەمووی پەیوەسـتە بـە سـیفەتی (العطـاء) بەخشـشی خـواوە، گـومڕایی و سـزا و ئەوەی پەیوەستە بەوانـەوەش، پەیوەسـتە بـە سـیفەتی (المنـع) گرتنـەوەی خـوای گەورە.

خـــوای گـــەورە خـــۆی بەنـــدەکانی هەڵدەســـووڕێنێت لـــە نێـــوان ســـیفەتی (العطاء)و(المنع)دا ئەمانەش هەر هەمووی خوای گەورە بـە حیکمـەتی بـێ سنووری خۆی بەڕێوەی دەبات.

# زیانەکانی درۆ

ئەی مرۆڤی ژیر خۆت بپارێزە لە درۆ، چونکە درۆ شتەکانت لێ تێك دەدات، کارەکانت لێ ئاڵۆز دەکات، ڕاستەقینەی کارەکانی تۆش لە خەڵکی تێك دەچێت، چونکە درۆزن شتی نەبوو بە هەبوو پیشان دەدات، شتی هەبوو بە نەبوو پیشان دەدات، حەق بە ناحەق پیشان دەدات، ناحەقیش بە حەق پیشان دەدات، خێروچاکە بە شەڕوخراپە پیشان دەدات، شەڕوخراپەش بە خێروچاکە پیشان دەدات، جا بۆیە لە سزای ئەوەدا زانست و کارەکانی لێ دەشێوێن، پاشان بەم شێوەش ئەم شتانە پیشانی ئەو خەڵکە دەدات کە پێی خەڵەتاوە، جا مرۆڤی درۆزن لە بوونی حەق و ڕاستی لادەدات و ڕوو دەکاتە ناحەق و گەندەڵی.

کەواتە: هەر کاتێك بۆچوون و زانستەکەی بە فەساد چوو کە سەرچاوەی هەموو نیاز و کارەکانیەتی، ئەوە فەساد و گەندەڵی سەردەکێشێت بۆ هەموو کارو کردەوەکانی، ئەوکات نەسوود لە زمانی وەردەگیرێت نە لە کارەکانی.

هەر بۆیەش دەگوترێ درۆ سەرچاوەی هەموو کاروکردەوەیەکی خراپە، هەر وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((إِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ))[1]، واتە: درۆ سەردەکێشێت بۆ خراپەکاری، خراپەکاریش سەردەکێشێت بۆ ئاگری دۆزەخ.

دروستبوونی درۆ سەرەتا لە دەروونەوە سەرهەڵدەدات و هەڵدەقوڵێت بۆ زمان، ئینجا بە زمان درۆیەکە دەسەلمێنێت، پاشان لە زمانەوە سەردەکێشێت بۆ ئەندامەکانی لاشەی، ئەوکات کاروکردەوەکانی بە فەساد دەبات هەر وەك چۆن

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٤٢٢/١٠)، ومسلم (٢٦٠٧)، و ابو داود (٤٩٨٩)، والترمذي (١٩٧٢)، و احمد في المسند (٣٨٤/١و٤٣٢)،

زمانی بـە فەساد بـرد، تـا وای لێـدێت درۆ هـەموو ژیـان و کـاروکردەوە و گوفتـاری دەگرێتەوە، ئەو مرۆڤە وای لێدێت فەساد و گەندەڵی باڵی بەسـەردا دەکێـشێت و بـەرەو فـەوتانی دەبـات، ئەگـەر خـوای گـەورە فریـای نەکـەوێت ئـەو مرۆڤـەش بـە دەرمانی ڕاستگۆیی چارەسەری خۆی نەکات.

ئەوەش بزانــە ڕاستگۆیی سەرچاوەی زۆربـەی زۆری نەخۆشـیەکانی دڵـــە، وەك لە ڕیبا و لە خۆبایی بوون و خۆبەگەورەزانی و شـارەدنەوەی حـەق و بـێ توانـایی و لاوازی و ترس و بێ نرخی و چەندین شتی تریش کە لە درۆیدا هەڵدەقوڵێن.

بەڵێ: هەموو کردەوەیەکی چاکی مرۆڤ لـــە ڕاسـتگۆییەوە هەڵدەقوڵێت، هـەموو کردەوەیەکی خراپی مرۆڤیش لــە درۆوە هەڵدەقوڵێت.

خوای گەورە سزای درۆزن بەوە دەدات کە وێڵی دەکات لە چاکەکانی، پاداشـتی ڕاستگۆش بـەوە دەداتـەوە کـە سـەرکەوتووی دەکـات بـۆ کـاری چـاکە لـە دنیـا و قیامەت.

هیچ شتێك نیە وەکو ڕاستگۆی سوود بەخش بێت بۆ دنیا و دواڕۆژی مرۆڤ، هـیچ شـتێکیش نیـە وەکـو درۆ زەرەرمەنـد بێـت بـۆ دنیـاو دواڕۆژی مـرۆڤ خـوای گـەورە دەفـــــــــــەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ (التوبة:١١٩)، واتــە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە لە خوابترسن و تەقوای خـوا بکەن و لەگەڵ ڕاستگۆیان دابن.

هــەروەها دەفــەرمووێ: ﴿هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡ﴾(المائـدة:١١٩)، واتـــە: ئەمە ڕۆژێکە کە ڕاستگۆیان ڕاستیەکەیان سوودیان پێ دەگەیەنێت.

خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـر دەفـــەرمووێ: ﴿فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ﴾(محمد:٢١)، واتـە: کاتی کـار گەیـشتە قـایمی ئەگـەر لەگـەڵ خـوادا ڕاستگۆ بوانایا، ئەوە چاکتر بوو بۆیان.

هــەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾(التوبـة:٩٠)، واتـــە:

پاکانەکاران لە بیابانی نیشتمانی عـەرەب هاتنـە خزمـەت پێغەمبـەرﷺ بـۆ ئـەوەی مۆڵەتیان بدرێت کە نەچن بۆ جیهاد، هـەروەها بەوانـەش کـە درۆیـان لەگـەڵ خـوا و پێغەمبەردا دەکرد دانیشتن و بەشداری غەزاکەیان نەکرد، ئەوانەی کەبێ بـاوەڕبوون لەناو ئەوانەی لە ئایندەدا سزایەکی پر ئێش و ئازاریان تووش دەبێت.

# چەند نهێنی کە ئەم ئایەتە لە خۆی گرتووە: (وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ...)

لـــەم ئایەتـــەدا ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ﴾(البقـــرة:٢١٦)، واتـــە: لەوانەیـــە ئێـــوە شتێکتان پێ ناخۆش بێت کەچی خێری تیابێت بۆتان، یان شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕی تیابێت بۆتان، بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت خێر لەچی دایە ئێوە نازانن.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا چەند سوود و نهێنی و حیکمەتی تیایە بۆ بەندە، جا ئەگەر بەندە زانی ناخۆشی خۆشی بەدوای خۆی دادێنێت، خۆشیش ناخۆشی بەدوای خۆی دادێت، ئەوکات بێ ئومێد نەدەبوو کە کامەرانی بۆ بێت لە تەنیشت نەهامەتیەوە لەبەر نەزانینی چارەنووسی کارەکانی، چونکە ئەوەی خوا دەیزانێت بەندە نایزانێت ئەوە چەند شتێك بۆ بەندە فەراهەم دێت:

- گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی خوا چاکترین شتە کە سوودی پێ بگەیەنێت، ئەگەرچی لەسەرەتادا ئەنجامدانی لەسەری گران بێت نەفسیش پێی ناخۆش بێت، چونکە دوای هەموو فەرمان پێکراوەکان خێر و کامەرانی و لەزەت و شادمانیە.

بەهەمان شێوەش ئەنجامدانی قەدەغەکراوەکان لە هەموو شتێك زیاتر زیانی بۆی هەیە، ئەگەرچی نەفسیش بۆی بچێت و پێی خۆش بێت، چونکە دوای هەموو قەدەغەکراوەکان ئێش و ئازار و خەفەت و شەڕ و نەهامەتی بەدواوەیە.

مرۆڤی عاقڵیش ئەوەیە کە ئارام بگرێت لەسەر ئێش و ئازارێکی کەم کە لەزەت و خێر و خۆشیەکی زۆری بەدواوە دێت، خۆی دەپارێزێت لە تام و چێژێکی کەم کە ناخۆشی و ئێش و ئازارێکی زۆری بەدواوە دێت.

بەڵام مرۆڤی نەفام و نەزان سەیری چارەنووسی کارەکانی ناکات، تەنها مرۆڤی عاقل و ژیر بەردەوام سەیری چارەنووسی کارەکانی دەکات، بە جۆرێك کە لەدوای ئەم کارانەیەوە چارەنووسی چاکە و خراپە بەدی دەکات.

چونکە مرۆڤی ژیر قەدەغەکراوەکان وەك خواردنێکی خۆش و بەلەزەت دەبینێت کە ژەهری کوشندەی تێکەڵ کرابێت، بۆیە هەر کاتێك دەیەوێت دەستی بۆ درێژ بکات کە ژەهرەکە دەبینێت دەستی دەکشێنێتەوە، فەرمان پێکراوەکانیش وەك دەرمانێکی تام ناخۆش دەبینێت کە پێی چاك دەبێتەوە، بۆیە هەر کاتێك لەبەر تام ناخۆشی دەیەوێت نەیخوات ئەوە سوودی چاك بوونەوەکەی بیر دەکەوێتەوە بۆیە تاڵیەکەی بیر دەچێت.

بەڵام ئەمە پێویستی بەوە هەیە کە بزانێت چارەنووسی کارەکان چیە، پێویستی بە ئارامی هەیە کە نەفسی خۆی جێگیر بکات لەسەر تەنگ و چەڵەمەکانی گەیشتن بە ئامانجی، چونکە ئەگەر یەقین و ئارامی لەدەستدا ئەوە کارەکەی لێ ئاستەم دەبێت، بەڵام ئەگەر یەقین و ئارامی بەهێز بوو ئەوە تەنگ و چەڵەمەکانی لەسەر ئاسان دەبێت و لە پێناوی خێر و لەزەتێکی بەردەوام ئارامی لەسەر دەگرێت.

◈ لە نهێنیەکانی ئەو ئایەتە ئەوەیە کەوا دەخوازێت مرۆڤ کارەکانی بسپێرێتە ئەو خوایەی کە چارەنووسی هەموو شتێك دەزانێت، ڕازی بێت بەو کارانەی کە خودا بۆی هەڵدەبژێرێت و بڕیاری بەسەردادەدات.

◈ لە نهێنیەکانی ئەو ئایەتە ئەوەیە ئەو مرۆڤە داوا لە خوا ناکات شتێکی بدات کە زانستی پێی نەبێت، چونکە لەوانەیە ئەو شتەی ئەو داوای دەکات زیان و زەرەری پێوەیە بۆی بەڵام ئەو پێی نازانێت، جا بۆیە هیچ شتێك لەسەر خوا داوا ناکات و هەڵنابژێرێت، بەڵکو داوای ئەوە لە خوا دەکات چاکەی بۆ بێنێتە ڕێ، بەوە ڕازی دەبێت کە خوا بۆی هەڵدەبژێرێت، دەزانێت خوا بۆی دیاری کردووە ئەوە چاکترین شتە بۆ ئەو.

◈ لـە نهێنیـەکانی ئـەو ئایەتـە ئەوەیـە ئەگـەر بەنـدە کارەکـانی سـپاردە پـەروەردگاری و ڕازی بـوو بـەوەی کـە خـوا بـۆی هەڵبـژاردووە، ئـەوکات خـودا لـەو شتەی بۆی هەڵبژاردووە هێـز و عەزیمـەت و ئـارامی پـێ دەبەخـشێ، نەهامـەتی لـێ لادەبات، ئەو نەهامەتیەی کە تووشی ئەو کەسانە دێت کـە خۆیـان کـار بـۆ خۆیـان هەڵدەبژێرن.

◈ لە نهێنیەکانی ئەو ئایەتە ئەوەیە ئیسراحەت دەکات لەو خەیاڵاتانەی کە لـە بواری هەڵبژاردنی کارەکانیەوە ماندووی کردووە، دڵی چۆل دەبێت لەو بیر کردنەوە و هێنـان و بردنـەوەی کـە تووشـی تـەنگ و چـەڵەمەی کـردووە، لەگـەڵ ئەوەشـدا ناتوانێت لەوە دەربچێت کە خوا بۆی دیاری کردووە، جا ئەگـەر هـاتوو مـرۆڤ کاتێـك قەدەری خوا دەیگـاتێ بـە بـەش و قـەدەری خـوا ڕازی بێـت ئـەوە شـتێکی چـاك و سوپاسکراوی کردووە بۆیە شیاوی بەزەی پیا هاتنەوەی خوایە، بەڵام ئەگەر هـاتوو قەدەری خوا بەسەری داهات ئەویش بە بـەش و قـەدەری خـوا ڕازی نـەبوو، لەگـەڵ ئەوەشدا قەدەری خوا هەر بەسەریدا هاتووە، ئەوە شتێکی خـراپ و لۆمـە لێکـراوی کردوو بۆیە شیاوی بەزەی پیا هاتنـەوەی خـوا نیـە، جـا هـەرکاتێك مـرۆڤ بەڕاسـتی کارەکانی بسپێرێتە خوا و بە فەرمانی خوا ڕازی بێـت خـودا لـە تەقـدیر کراوەکانـدا یارمـەتی دەدا و بـەزەی پێـدا دێتـەوە و لوتفیـشی پـێ دەکـات، بەنـدە لـە نێـوان بـەزەیی و لـوتفی خـودا دەبێـت، بـە زەیـی خـودا دەیپارێزێـت لـەوەی ئاگـاداری کردۆتەوە، لوتفی خوداش ئەوەی لەسەری تەقدیر کردووە بۆی ئاسان دەکات.

# نەفسی خۆت بناسی خواش دەناسی

مرۆڤ سوود لە نیعمەتی خوا و لە ئیمان و زانست وەرناگرێت ئەگەر نەفسی خۆی بە چاکی نەناسێت، بە جۆرێك کە لە شوێنی خۆی بەکاری بهێنێت و لە سنوور تێنەپەڕێنێت، کارەکان بە هی خۆی نەزانێت، بڕوایەکی پتەوی هەبێت کە هی خوایەو لە خواوەیە و بە خواوەیە، کە خودایە منەتی لەسەر بەندەکەی کردووە بەبێ هیچ بەرانبەرێك.

جا مرۆڤ ئەو نیعمەتە ملکەچی دەکات کەوا دەبینێت هەرگیز نەفسی خۆی هیچی لە دەست نایەت، ئەو خێر و چاکەی تووشی هاتووە مولکی خوایە و بە خواوەیە و لە خواوەیە، ئەوکات ئەم بەخششە وا ملکەچی دەکات کە تەعبیر ناکرێت، هەر کاتێك بەخششەکەی بەسەردا تازەبێتەوە ئەوە ملکەچ و خشوع و خۆشەویستی و ترس و ڕەجای بۆ خوا زیاتر دەبێت.

ئەمەش بەروبوومی ئەو دوو زانستە بە نرخەیە:

یەکەم: زانست و زانیاری بە پەروەردگاری هەبێت،بزانێت وشارەزابێت لەکاملی و چاکە و دەوڵەمەندی و بەخشندەی و باشی و ڕەحمەتی خوا، یەقینی وابێت هەموو خێر و چاکەیەك تەنها لە دەست خودا دایە، خودا مولك و سامانی خۆیەتی بە هەر کەسێك حەز بکات دەیبەخشێ، هەر کەسێکیش حەز نەکات نایبەخشێ، لەسەر ئەوەشدا سوپاسی دەوێت، بەڕاستی ئەوە شیاوی سوپاس و ستایشی ڕاستەقینەیە.

دووەم: زانست و زانیاری مرۆڤ بە نەفسی خۆی، مرۆڤ بزانێت نەفسی کەمتەرخەمە و ستەمکارە و نەفامە، بزانێت هیچ خێرێك لە نەفسیدا نیە و پێوەی نیە و لێوەی نیە، بزانێت کە نەفسی هیچی لە دەست نایەت، بەڵکو هەرچی خێر و بێرێك هەیە هەمووی لە خواوەیە هیچ باڵادەستی نەفسی تیا نیە.

جا هەرکاتێك ئەم دوو زانستە ڕەنگی دایەوە لەسەر دڵی مرۆڤدا نەك تەنها لەسەر زمانی ئـەوکات دەزانێـت کـە سـوپاس و سـتایش هـەر هـەمووی شایـستەی خـوای گەورەیە، بڕیار و خێر و چاکە هـەمووی لـە دەسـت خـوا دایـە، هـەر خـواش شـیاوە سوپاس و ستایش و مـەدح بکرێـت، نەفسیـشی شیاوی ئەوەیـە سـەرکۆنە و زەم و تۆمەتبار بکرێت.

کەواتـە: هەر کەسێك ئەم دوو زانستەی نەبێت کار و گوفتـار و گـوزەرانی لا تێـك دەچێت و ئالۆزدەبێت کە وای لێدێت ڕێگای ڕاستەقینەی گەیشتن بـە خـوای لێ وون دەبێت، چونکە مرۆڤ بەزانین و کارپێکردنی ئەم دوو زانستە بە خوا دەگات، هەر بـە نەبوونی ئەم دووانەش ڕێگای لێ وون دەبێت.

ئا ئەوە مانای ئەو ووتەیە کە دەڵـێن: (مـن عـرف نفسه عـرف ربـه) واتــە: هـەر کەسێك نەفس و دەروونی خۆی بناسێت، ئەوە پەروەردگاریش دەناسێت.

چونکە کەسێك نەفسی خۆی بناسێت و بزانێت نەفام و ستەمکار و کـەم و کـوڕی هەیـە و ئاتاجـە و هـەژارە و ملکـەچ و دامـاوە و هیـچی لـە دەسـت نایـەت، ئـەوکات پەروەردگاری بـە پێـچەوانەی ئەوانـە دەناسـێت و سـەنگی مەحـەکی نەفـسی خۆی دەگرێت، سوپاس و ستایشی پەروەردگاری دەکات هـەموو خۆشەویـستی و تـرس و ئومێد و گەڕانەوە و تەوەکولی تەنها بـۆ خـوا دەبێـت، کـە خـوای لـە هـەموو شـتێك خۆشتر دەوێت و ترسی خوای لە هەموو شتێك زیاتر دەبێت و ئومێدی تەنها بە خـوا دەبێت، ئا ئەوە بەندایەتی ڕاستەقینەیە.

دەگێڕنەوە کە هێندێ لە (حکماء)کان لەسەر دەرگـای خانوەکەیانـدا نووسـیوە: (إنه لن ینتفع بحکمتنا إلا من عرف نفسه و وقـف بهـا عنـد قـدرها، فمـن کـان کذلك فلیدخل و إلا فلیرجع حتی یکون بهذه الصفة).

واتـە: کەس سوود لە حیکمەتی ئێمە وەرناگرێت، مەگـەر ئـەو کەسـە نـەبێت کـە نەفس و دەروونی خۆی ناسیوە و سەنگی مەحەکیشی گرتووە، جا هەر کەسێك بەم شێوەیە بوو کە باسمان کرد بابێتە ژوورەوە، ئەگەر نا با بگەڕێتەوە تاکو خۆی بەم شێوە لێدەکات ئینجا بێتەوە.

# زیانەکانی گوناح و ئارەزووات

ئارامگرتن لەسەر ئارەزووات زۆر ئاسانترە لە ئارامگرتن لەسەر ئەو ئازارانەی ئارەزووات تووشی مرۆڤی دەکات.

چونکە ئارەزووات یان ئەوەتا مرۆڤ تووشی ئێش و ئازار دەکات.. یان بە ئەنجامدانی ئەو ئارەزوواتەوە خۆشیەکی تری لە دەست دەچێت کە زۆر چاکترە لە ئارەزووەکەی.. یان کاتی بە فیڕۆ دەچێت کە پەشیمانی بە دوادا دێت.. یان گوناهەکە ناوی دەزڕێنێ و ئابڕووی دەبات.. یان ماڵ و سامانی لە پێناودا سەرف دەکات کە مانەوەی زۆر چاکترە بۆی لە نەمانی.. یان ڕێز و شکۆی خۆی لە دەست دەدا کە مابایی زۆر چاکتر بوو بۆی.. یان نیعمەتی لە چەنگ دەچێت کە مانەوەی نیعمەتەکە زۆر چاکتر و بە لەزەتتر بوو لە گوناهەکە ئەگەر مابا.. یان سەرگەردان و وێڵ دەبێت کە پێشتر ڕێگای وای تووش نەهاتووە.. یان تووشی غەم و خەفەت و نیگەرانی و ترس دەبێت کە گوناهەکە زۆر زۆر کەمە لە چاویدا.. یان زانیاری و زانستی لە بیر دەچێتەوە کە مانەوەی زۆر چاکتر بوو لە ئەنجامدانی گوناه.. یان دووژمنی پێ خۆش دەبێ و دۆستانی پێ دڵ گران دەبێت.. یان ئەنجامدانی گوناح ڕێگرە لەو بەخشش و نیعمەتەی وا دێت.. یان تێکەڵ دەبێت لەگەڵ ڕەوشتیدا کە لاچوونی ئاستەمە.. چونکە کار و کردەوە دەبێت بە سیفات و ئەخلاق.

# لە هەموو شتێك ناوەڕاست بگرە

هەموو ئاکار و ڕەوشتێك سنووری خۆی هەیە هەر کاتێك لەو سنووورە تێپەڕی دەبێت بە خراپەکاری، هەر کاتێکیش نەگەیشتە سنووری خۆی ئەوە کەم و کوڕی تیایە.

الغضب: تووڕەیی، سنووری خۆی هەیە کە جوامێری و ئازایەتیە کە خۆی لە خۆیدا ڕەوشتێکی چاکە، بەڵام هەرکاتێك توڕەیی لە شوێنی خۆی بەکارنەهێنرا و لەم سنووورە تێپەڕی، خاوەنەکەی دەبێت بە ستەمکار، ئەگەر لە سنووری خۆشی کەمتر بێت دەبێت بە ترسنۆکی.

الحرص: سووربوون لەسەر شت، سنووری خۆی هەیە کە سوود وەرگرتنە لە دنیا بە پێی پێویست، بەڵام هەرکاتێك لەم سنووورە کەمتر بوو دەبێت بە فیڕۆدان، ئەگەر لە سنورەکەی خۆشی تێپەڕی دەبێتە ڕووکردنە دنیا کە کارێکی چاك نیە.

الحسد: ئێرەیی، سنووری خۆی هەیە کە پێشبڕکێ کردنە بۆ کامل بوون، بەڵام هەر کاتێك لەم سنووورە تێپەڕی دەبێتە ستەم و خراپەکاری کە مرۆڤ لەگەڵ پێشبڕکێکەی ئومێدی ئەوە دەکات ئەو نیعمەتە لە خاوەنەکەی بسێنێت بۆ خۆی ئەگەر بە ئازاردانیشی بێت، هەر کاتێکیش لە سنووورەکە خۆشی کەمتر بوو دەبێتە بێ هیمەتی و لاوازی نەفس، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: (( لا حَسَدَ إلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ مَالاً فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الحِكْمَةَ فَهْوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا النَاس))[1] . واتە: حەسوودی دروست نیە تەنها لە دوو شتدا نەبێت: حەسوودی بە پیاوێك ببرێت کە خوا ماڵ و سامانی پێ بەخشیوە ئەویش لە کاری

(١) صحيح: رواه البخاري (١/١٥٣)، ومسلم (٨١٦)، و احمد في المسند (١/٣٨٥و٤٣٢)، وابن ماجه (٤٢٠٨).

خێر و چاکەدا سەرفی دەکات، پیاوێکیش خوا حیکمەت و زانستی پێ بەخشیوە ئەویش کاری پێدەکا و خەڵکیشی لێ فێر دەکات.

ئا ئەمە حەسوودی پێشبڕکێی پێ دەگووترێ کە مرۆڤ هەوڵ دەدات پێش بکەوێت لە کاری چاکە، نەوەك حەسوودی ببات کە ئەو نیعمەتە لەو کابرایە بسەندرێتەوە بدرێت بەو.

الشهوة: حەز و ئارەزووات، سنووری خۆی هەیە کە بە ئەنجامدانی ئارامی و ڕەحەتی بە دڵ و عەقڵ دەبەخشێ و یارمەتی دەدات لەسەر بەندایەتی و بەهرەکان، بەڵام هەر کاتێك لەم سنوورە تێپەڕی دەبێت بە چلێسی و هەرگیز تێر نابێت و خاوەنەکەی دەباتە پلەی ئاژەڵ، هەر کاتێکیش لە سنوورەکەی خۆشی کەمتر بوو دەبێت بەبێ هێزی و لاوازی و کەمتەرخەمی.

الراحة: حەسانە و ڕەحەتی، سنووری خۆی هەیە، کە حەسانەوەی دڵ و دەروون و هیزرە بۆ بە دەستهێنانی هێزی بەندایەتی خوا و کاری چاك بە جۆرێك کە بێ هێز و ماندوو نەبێت لە کاتی ئەنجامدانی، بەڵام هەر کاتێك لەم سنوورە تێپەڕی دەبێت بە تەمەڵی و کات بە فیڕۆدان کە مرۆڤ زۆربەی بەهرەکانی لە دەست دەچێت، هەرکاتێکیش لە سنووری خۆی کەمتر بوو ئەوە زیان بە هێزی بەرهەم هێنن دەگەیەنێت.

الجود: بەخشندەیی، سنووری خۆی هەیە کە خۆی لە خۆیدا شتێکی زۆر باشە، بەڵام هەر کاتێك لەم سنوورە تێپەڕی دەبێت بە دەست بڵاوی و بەفیڕۆدان، هەر کاتێکیش لە سنووری خۆی کەمتر بوو دەبێت بە ڕەزیلی و پیسکەیی.

الشجاعة: جوامێری و ئازایەتی، سنووری خۆی هەیە کە خۆی لە خۆیدا سیفەتێکی باشە، بەڵام هەر کاتێك لەم سنوورە تێپەڕی ئازایەتیەکەی هەرەس دێنێت، هەر کاتێکیش لە سنووریخۆی کەمتر بوو دەبێت بە ترسنۆکی.

جا سنووری جوامێری و ئازایەتی ئەوەیە بڕوا بۆ ئەو شوێنانەی کە شیاوە بۆی بڕوا، نەڕوات بۆ ئەو شوێنانەش کە شیاوی ڕۆیشتن نیە، هەر وەك (معاوية)بە

(عمرو)ی کوڕی (العاص)ی دەگووت: سەرم لە تۆ سووڕماوە نازانم ئازایت یان ترسنۆکیت؟! چونکە هێندێ جار دەتبینم پێش دەکەوی دەڵێم: ئازاترین کەسی، جاری واش هەیە دەکشێیەوە دەڵێم: ترسنۆکترین کەسی..

جا (عمرو)ی کوڕی (العاص) لە وەڵامدا ووتی:

شجاع إذا أمكنتنى فرصة فإن لم تكن لى فرصة فجبان.

واتە: ئەگەر هەڵم بۆ ڕێك کەوێت ئەوە ئازام، بەڵام ئەگەر هەڵم بۆ ڕێك نەکەوێت ئەوە ترسنۆکم.

الغيرة: غیرەت بوون لەسەر شت، سنووری خۆی هەیە ئەگەر لەم سنوورە تێپەڕێت دەبێت بە بوختان و گومانی خراپ بردن بە کەسێکی بێ تاوان، ئەگەر لە سنووری خۆشی کەمتەرخەمی بکرێت دەبێت بە گوێنەدانە ڕەوشت وبێ ئابڕوویی و دەیوسی کردن.

التواضع: خۆبەگەورە نەزانین، سنووری خۆی هەیە کە سیفەتێکی باشە، بەڵام لە سنووری خۆی تێپەڕی دەبێت بە زەلیلی و سەر شۆڕی، هەر کاتێکیش لە سنووری خۆی کەمتر بوو دەبێت بە خۆ بە گەورەزانی و خۆ هەڵکێشان.

العز: عیزەت، سنووری خۆی هەیە، هەر کاتێك لە سنووری خۆی تێپەڕی دەبێت بە خۆبەگەوەزانی کە ڕەوشتێکی خراپ و لۆمە لێکراوە، ئەگەر لە سنووری خۆشی کەمتر بێت دەبێتە زەلیلی و سەر شۆڕی.

جا وا چاکە مرۆڤ لەمانەدا دەست بگرێت بە ڕێگای ناوەڕاست نە لە ئەندازە بەدەر دەرچێت نە کەمتەرخەمیشی تیابکات، چونکە ڕێگای ناوەڕاست سوود بەخشە بۆ بەهرەوەربوون لە دنیا و لە دواڕۆژ، بەڵکو تەنها بەم ڕێگایە سوود بە جەستە دەگات، بەڵام هەر کاتێك لەم ڕێگایە لابدا جا زیادە ڕەوی تیادا بکات یان کەمتەرخەمی تیا بکات، ئەوە هێز و لەش ساغی لە دەست دەدات بە ئەندازەی هەڵەکانی.

بە هەمان شێوەش کارە سروشتیەکانیش وەکو: خەو و شەونخونی و خواردن و خواردنەوە و جیماع و جوولە و وەرزش و تێکەڵ نەبوونی خەڵکی و تێکەڵ بوونی

خەڵکی و چەندین شتی تری لەم شێوش.. ئەگەر لەسەر ڕێگایەکی ناوەڕاست بوو نە لە ئەندازەبەدەر بوو نە کەمتەرخەمیشی تیا کرابوو ئەوە سوود بەخشە و باشە، بەڵام ئەگەر لایدا بۆ لایەکیان ئەوە مرۆڤەکە تووشی زیان دەبێت.

بۆیە پیرۆزترین و بەسوودترین زانست، شارەزابوون و زانیاریە بە سنوورەکان، بە تایبەت سنووره شەرعیەکان ئەوانەی فەرمانی پێکراوە و ئەوانەی کە قەدەغەکراون.

کەواتە: زاناترین کەس ئەو کەسەیە کە زانیاری بەم سنوورانە هەبێت، چونکە نەشتێك زیاد ئەنجام دەدات لە سنوور دەرچێت، شتێکیش ئەنجام نادات لەسنووری شەرعی نەهاتبێت خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ (التوبة:٩٧)، واتە: عەرەبە دەشتەکیەکان زۆر دڵ ڕەقترن لە بارەی کوفر و دووڕوییەوە، شایستەترن ئەو سنوورانە نەزانن کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەکەی.

# بە دڵی پڕ لە تەقوا دەگەی بە ڕەزامەندی خودا

مرۆڤ بە هیمەت و بە دڵی پڕ لە تـەقوا دەتوانێت ڕێگا بـەرەو ڕەزامەنـدی خـودا ببڕێت نە بە لاشەی، لە ڕاستیدا تەقوا پەیوەستە بە دڵـــەوە نـەك بـە ئەندامـەكانی لاشـەوە هـەر وەك خـوای گـەورە دەفـــەرمووێ: ﴿وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ﴾ (الحج:٣٢). واتـە: ئەوەی ڕێز دادەنێت بۆ دروشمـەكانی خـودا، بـە ڕاستی ئەوە نیشانەی تەقوا و لە خواترسانی دڵەكانیانە.

هـەروەها دەفـــەرمووێ: ﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَـٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ﴾ (الحج:٣٧)، واتـە: دڵنیابن گۆشت و خوێنەكەی بەخوا ناگات، بەڵكو تـەقواو پارێزگاری ئێوە بەخوا دەگات.

پێغەمبەریشﷺ دەفـــەرمووێ: ((التقـوى هـا هنـا، وأشـار الى صـدره))[1]، واتـــە: تەقوا و خواناسی لێرەدایە، ئاماژەی بۆ سنگی کـــرد.

كەواتـــە: مرۆڤـی ژیـر ڕێگـای بـەرەو خـوا چـوون بـە عەزیمـەت و وورەی بـەرز و نیەتێكی ساف و كاروكردەوەیەكی كەم دەبڕێت، زۆر چـاكتریش ڕێگـا دەبڕێـت لـەو كەسـەی كـە ئەمانـەی نیـە لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆر مانـدوو دەبێـت و گەشـتەكەی لێ ئاستەم دەبێت، چونكە عەزیمەت و حەزكردن لە شتێك تـەنگ و چـەڵەمەی گەیشتن بە ئامانج لەسەر مرۆڤ سووك دەكا و گەشتەكەی بۆ ئاسان دەكات، چـونكە كەوتنـە ڕێ بەرە و ڕەزامەندی خودا بە هیمەت و حەز و ترسێكی ڕاسـتگۆیانە دەبێـت، هـەر بۆیەش ئەو كەسەی هیمەتی بەرزە بە ئارامەوە زۆر زیاتر پێشدەكەوێت لەو كەسەی

---

(١) صحيح: رواه مسلم (٢٥٦٤)، والترمذی (١٩٢٨)، و احمد فی المسند (٢/٢٧٧و٣٦٠).

کە کارێکی زۆر دەکات کەچی ئەوەی نیە، ئەگەر لە هیمەتیشدا یەکسان بوو بەکار پێشی دەکەوێ.

چاکترین ڕێگرتنەبەریش بەرەو ڕەزامەندی خودا ئەو ڕێگایەیە کە پێغەمبەرﷺ گرتبوویە بەر، ڕێگایەکی گرتبوو بێ کەم و کوڕی، لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە لە هەموو هەڵەیەکی پێش و پاشیشی خۆش ببوو ئینجا ئەوەندە نوێژی دەکرد تاکو پایەکانی دەئاوسا، ئەوەندە ڕۆژووی دەگرت تا خەڵکی وایان دەزانی ڕۆژو ناشکێنێت، لە پێناوی خودا دەجەنگێ، تێکەڵی هاوەڵانی دەبوو خۆی لێ بە دوور نەدەگرتن، یەك لەو سووننەت و ویردانەی جێ نەدەهێشت کە مرۆڤ ناتوانێت بە هەمووی هەڵسێ.

خوای گەورە فەرمانی بە بەندەکانی کردووە بە ڕووالەتیان هەڵسن بە دروشمەکانی ئیسلام، ڕاستەقینەی ئیمانیش لە دڵ و دەروونیاندا بسەپێنن، لە (المسند)دا هاتووە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ((الإسلام علانية و ألأيمان في القلب))[1]، واتە: دروشمەکانی ئیسلام بە ڕواڵەتە، بەڵام ئیمان لە ناو دڵدایە.

هەر ئیسلامەتیەکی بە ڕواڵەت ئەگەر خاوەنەکەی بەرەو ئیمانێکی دەروونی ڕاستەقینە نەبات ئەوە هیچ سوودی نیە هەتا ئەو کاتەی ئیمانی دڵی لەگەڵدا نەبێت، هەر ئیمانێکیش ئەگەر خاوەنەکەی هەڵنەستێت بە ئەنجامدانی دروشمەکانی ئیسلام بە ڕواڵەت ئەوە هیچ سوودی نیە ئەگەرچی ئیمانەکەشی هەبێت.

کەوابوو: ئەگەر هاتوو دڵێك هەڵقرچا بە خۆشەویستی و ترسی خوا، بەڵام بە ڕواڵەت هەڵنەستا بە ئەنجامدانی دروشمەکانی شەرعی خودا، ئەوە ڕزگاری نابێت

---

(١) رواه احمد فی ((المسند)) (٣/١٣٥ ـ ١٣٦)، قال الهيثمی فی ((مجمع الزوائد)) (١/٥٢) رواه احمد وابو يعلى بتمامه، والبزار باختصار، ورجاله رجال الصحيح ما خلا على بن مسعدة، وقد وثقه ابن حبان وابو داود الطياليسی وابو حاتم وابن معين، وضعفه اخرون.

لە دۆزەخ، بەهەمان شێوەش ئەگەر بە ڕواڵـەت هەڵسا بە ئەنجامـدانی دروشمـەکانی ئیسلام بەڵام ئیمانی ڕاستەقینەی لە دڵدا نەبوو ئەوە بەمە ڕزگاری نابێت لە دۆزەخ.

جا ئەگەر ئەوە زانرا، کەواتە ئەوانەی ڕێ دەگرنە بەر بـەرەو ڕەزامەنـدی خـودا و بە چەنگ هێنانی دوا ڕۆژ ئەوە دوو بەشن:

یەکەم: ئەوانەن کە ئەو کاتانەی لێیان زیاد دەبێـت دوای ئەنجامـدانی فـەڕزەکان بە پەرستشی لاشەیی پـڕی دەکەنـەوە و خۆیـانی پـێ مانـدوو دەکـەن، سـوور نـابن لەسـەر بـە چـەنگ هێنـانی توێـشووی ڕووحـی و ئیمـانی بـۆ دڵـەکانیان، وەنـەبێت بنچینەی ئیمانی ڕاستەقینەیان لە دڵدا نەبێت، بەڵکو ئیمانی ڕاستەقینەیان لـە دڵـدا هەیە، بەڵام ئەوانە زیاتر هیمەتی خۆیان سەرف دەکـەن لـە ئەنجامـدانی بەندایەتیـە جەستەییەکان

دووەم: ئەوانەن کە ئـەو کاتانـەی لێیـان زیـاد دەبێـت دوای ئەنجامـدانی فـەڕز و سـوونەتەکان بایـەخ دەدەن بـە دڵ و دەروون و خـۆ یـەکلایی کردنـەوە بـۆ خـوا و پاراسـتنی خەتـەرەکانی نـاو دڵیـان و ئـیرادەیان، ئەوانـە زیـاتر بایـەخ دەدەن بـە ڕاستکردنەوەو پتەو کردنی ئـەو کاراکانـەی پەیوەسـتە بـە دڵ و دەروونـەوە وەکـو: خۆشەویـستی و تـرس و ڕەجـا و تـەوەکول و گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا، بۆیـە ئەوانـە بەشێکی کەم لەم جۆرە کارانەی پەیوەستە بە دڵەوە زۆر لەلایان خۆشەویـسترە لـە زۆرێك لـەو بەندایەتیانـەی پەیوەسـتە بـە لاشـەوە، ئەگـەر یـەکێکیان هـۆگری یـان خۆشەویستی یان تامەزرۆی یـان ملکەچـی چـەنگ کـەوێت ئـەوە هـەرگیز بـە هیـچی ناگۆڕێتەوە.

# بنچینەی کاری چاك و خراپ

سەرچاوەی هەموو کارێکی خراپە لەمانەوە سەر هەڵدەدات: خۆبەگەورەزانی و سەرشۆڕی و سوکی.

سەرچاوەی هەموو کارێکی چاکەش لەمانەوە سەر هەڵدەدات: لە خوا ترسان و ورەبەرزیەوەیە.

کەواتە: شانازی و حەق شاردنەو و لە خۆبایی بوون و حەسوودی و خراپەکاری و خۆبەگەورەزانی و ستەم و دڵ ڕەقی و ستەمکاری و پشت هەڵکردن لە ڕاستی و وەرنەگرتنی ئامۆژگاری و خۆسەپاندن بەسەرخەڵکیداو خۆشەویستی ماڵ و منداڵ و سوڵتە حەزکردن لە ستایشی خەڵکی و چەندین شتی تریش، ئا ئەمانە هەر هەمووی لە خۆبەگەورەزانی سەرهەڵدەدات.

درۆ و بێ قیمەتی و خیانەت و ڕیبا و فێڵ و تەڵەکە و تەماع و ترس و لەرز و ڕەزیلی و لاوازی و تەمەڵی و ملکەچ کردن بۆ خەڵکی و گۆڕینی شتی چاکە بە خراپەو چەندین شتی تریش، ئا ئەمانەش هەر هەمووی لەسەرشۆڕی و بێ سوکی مرۆڤەوە سەرهەڵدەدات.

خوڕەوشتەجوانەکانیش وەکو: ئارامگرتن و ئازایەتی و دادپەروەری و پیاوەتی و داوێن پاکی و خۆپاراستن و بەخشندەیی و لەسەرخۆیی و لێبووردەیی و عیزەتی نەفس و تەوازوع و قەناعەت و ڕاستگۆیی و ئیخلاص و بەنمەکی و پاداشت دانەوەی چاکە و دووربوون لە بێ ئاگایی و وازهێنان لەو شتانەی کە پەیوەندی بەونیە و دووربوونی دڵ لەو ڕەوشتە خراپانەو چەندینی تریش، هەر هەمووی لە خوا ترسی و وورە بەرزییەوە سەرهەڵدەدات.

خوای گەورە ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە زەوی ملکەچ دەبێت بۆ ئەو بارانەی دەبارێتە سەری پاشان بەرووبومی جوانی لێ دەڕوێت و دەبێتە باخ و باخاتێکی

قەشـەنگ و نایـاب، بەهـەمان شـێوەش ئـەو دروسـتكراوانە لـە زەوی دروسـتكراون، ئەگەر بەشی خۆی وەرگرت لە سەرفرازی وەكو ئەو باخە دەشەكێتەوە.

بـەڵام ئـاگر ڕەوشـتی وایـە لەناوبـەر و خۆبەگەورەزانـە كەچـی پاشـان سەرشۆر دەبێت ونامێنێت، بە هەمان شێوەش ئەو دروسـتكراوەی كـە وەك ئـاگرە بـەردەوام لـەكاتی گەشـانەوەی خـۆی بـە گـەورە دەزانێـت، بـەڵام كاتێـك كـپ بـۆوە سـەری شۆردەكاتەوە، جا ڕەوشتە خراپـەكان شـوێنكەوتەی ئـاگرن و لـەو دروسـت بوونـە، ڕەوشتە جوانەكانیش شوێنكەوتەی زەوین و لەو دروست كراون.

هەر كەسێك هیمـەتی بـەرز بێـت و لـە خـواترس بێـت بـە ڕەوشـتی جـوان خـۆی دەپارێزێتەوە، هەر كەسێكیش هیمەتی نەبێت و لە سنوور دەرچووبێت بە ڕەوشـتی ناشیرین خۆی دەپارێزێتەوە.

# هیمەت و نیەتی بەرز

بە دەست هێنانی بەهەشت و ڕەزامەندی خودا، پەیوەستە بە هیمەتێکی بەرز و نیەتێکی ڕاستگۆیانەی مرۆڤ، هەر کەسێك ئەم دووانەی لە دەستچێت ئەوە ناگات بە مەبەست.

کەواتە: ئەگەر هیمەتی مرۆڤ بەرز بوو، ئەوە پەیوەست دەبێت بە ئامانجی بەرز.

بەڵام ئەگەر هیمەتی مرۆڤ بەرز نەبوو و نزم بوو، ئەوکات پەیوەست دەبێت بە ئامانجی نزم پەیوەست نابێت بە ئامانجی بەرز.

حاڵی مرۆڤ پەیوەستە بە هیمەت و نیەتی، ئەو دووانە ڕێگای ڕەزامەندی خودای بۆ فەراهەم دێنن، ئەوەش تەواو و پوخت نابێت مەگەر واز لە سێ شت نەهێنێت:

یەکەم: وازهێنان لەو داب و نەریتانەی کە خەڵکی دایان ڕەشتووە.

دووەم: دوورکەوتنەوە و وازهێنان لەو شتانەی سەرقاڵی دەکات و دووری دەکاتەوە لە ڕەزامەندی خودا.

سێیەم: وازهێنان لەو شتانەی کە دەبێتە بەربەست لە نێوان دڵی و ڕەزامەندی خودا.

جیاوازی لە نێوان ئەوەی دووەم و سێیەم ئەوەیە، دووەم سەرقاڵ بوونە بەو شتانەی لە دەرەوەی دەروونی مرۆڤە، بەڵام سێیەم ئەو شتە مباحانەیە کە پەیوەست دەبێت بە دڵی مرۆڤەوە.

# چەمکێ لە ووتەکانی ( عبدالله )ی کوڕی ( مسعود )

✍ پیاوێك لە خزمەتی (ابن مسعود)دا فەرمووی: ئای چەند حەز دەکەم ڕۆژی قیامەت لەو کەسانە بم کە نامەی کارەکانیان بە دەستی ڕاست وەردەگرن، حەز دەکەم لە (المقربين)بم، (ابن مسعود)یش فەرمووی: دەنا ئا ئەوەتە پیاوێك حەز دەکات ئەگەر مرد هەر زیندوو نەبێتەوە، مەبەستی خۆی بوو.

✍ ڕۆژێکیان (ابن مسعود) لە ماڵ هاتە دەرەوە و دەڕۆیشت بینی وا کۆمەڵێك خەڵکی بە دوایدا دەڕۆن، ئەویش پێیانی ووت: ئایا هیچ پێویستیەکتان بە من هەیە؟! ووتیان: نەخێر، تەنها حەز دەکەین لەگەڵتدا بڕۆین، جا پێیانی ووت: بگەڕێنەوە، چونکە ئەو کارەی ئێوە دەیکەن زەلیلیە بۆ ئێوە و فیتنەشە بۆ من.

✍ دەیفەرموو: ئەگەر نەفسی منتان بەو شێوە بناسیبایە کە من خۆم دەیناسم، ئەوە خۆڵتان بەسەرمدا دەکرد.

✍ دەیفەرموو: ئێوە لە ڕاڕەوەی شەو و ڕۆژدا دەڕۆن کە تەمەن تیایدا کەم دەبێت، کارەکانیشی لەسەر دەنوسرێت، مردنیشی لە پڕ دەگاتێ، جا هەر کەسێك خێر و چاکەی چاندبێت حەز دەکات زوو بیدورێتەوە، ئەوەی خراپەشی چاندبێت دەستی دەگەزێ و حەز ناکات بیدورێتەوە، ئەوەش بزانن هەموو جووتیارێك ئەو شتە دەدورێتەوە کە چاندوویەتی، مرۆڤیش ناگات بە شتێك توانای بەسەریدا نەبێت ئەگەرچی حەزیشی لێبێت.

✍ هەر کەسێك چاکەیەك بکات خواش چاکەی لەگەڵدا دەکات، هەر کەسێکیش خۆی و خەڵکی بپارێزێت لە شەڕ خواش دەیپارێزێت لە شەڕ.

✍ تەقواداران گەورە و بە شکۆن، زانایانیش سەرۆك و پێشەوان، دانیشتن لەگەڵ ئەم دووانەش سوود بەخشە.

✍ بێگومان چاكترین ووتە ووتەی خوایە - كە قورئانە - چاكترین هیدایەتیش هیدایەتەكەی محمدﷺ هیناویەتی، خراپترین شتیش ئەو شتانەن كە داهێنـراون لـە دین، هەر داهێنراوێكیش لە دین بكرێت بیدعەیە.

✍ مەبەسـتەكانتان درێـژەتان لەسـەر نەكێـشێت، هیواكانتـان بەفـەتارەتان نەبات، بێگومان هەر شـتێك لـە ڕێگادابێـت ئـەوە حەتمـەن دەگـاتێ و نزیكـە، بـەڵام ئاگادار بە ئەوەی كەدووره ناگـاتێ، بزانـە و ئاگادارىـە خراپـە ئـەو كەسـەیە كـە لـە سكی دایكیدا خراپە، كامـەران و چـاكەش ئەوەیـە كـە ئامۆژگـاری وەردەگرێـت لـە غەیری خوی، بزانە گۆشتی موسڵمان كوفره، جنێو پێدانیشی مـرۆڤ تووشـی فیسق دەكات، دروست نیە بۆ موسـڵمان لـە سـێ ڕۆژ زیـاتر قـسە لەگـەڵ بـرای موسـڵمانی خۆی نەكات بەجۆرێك كە لە شوێنیك پێی بگات ڕووی خـۆی لـێ وەرگێرێـت، بـەڵكو دەبێت ئەگەر پێی گەیـشت سـەلامی لـێ بكـات، هـەر كاتێـك موسـڵمانێك دەعـوەتی برایەكی موسڵمانی خۆی بكـات دەبـێ وەڵامـی بداتـەوە، ئەگـەر نەخۆشـیش كـەوت دەبێت سەردانی بكات، بزانە خراپترین شت گێڕانەوەی شـتی درۆیـە، بزانـە كـە درۆ گاڵتەو گەپی نیە نابێت پیاو پـەیمان بـە منداڵەكـەی بـدات شـتی بـۆ بێنێـت كەچـی درۆی لەگەڵ بكاو بۆی نەهێنێت، چونكە درۆ مرۆڤ بـەرەو خراپـە دەبـات، خراپـەش مرۆڤ بەرەو ئاگر دەبات، ڕاستگۆیش مرۆڤ بەرەو چاكە دەبات، چاكەش مرۆڤ بـەرەو بەهەشـت دەبـات، بـە مرۆڤـی ڕاسـتگۆ دەگـوترێ ڕاسـتگۆیە و چـاكە، بـەدرۆزنیش دەگـوترێ درۆزنـە و خراپـە، محمـدﷺ پێـی فـەرمووین: پیـاوی وا هەیـە بـەردەوام ڕاسـتگۆیە تـاوای لـێ دێ لای خـوا بـە ڕاسـتگۆ دەنوسـرێت، پیـاوی واش هەیـە درۆ دەكات تاوای لێ دێت لای خوا بە درۆزن دەنووسرێت.

بەراستی ڕاستگۆترین قسە قورئانی خوایە، پتـەوترین لووتكـە ووشـەی تەقوایـە، چـاكترین كۆمـەڵیش كۆمـەڵی (ابـراهیم)ە، چـاكترین سـوونەتیش سـوونەتی (محمد)ﷺ چاكترین (هدی)ش هدی پێغەمبەرانە، بەنرخترین قسەش زیكری خوایە، چاكترین چیرۆكیش هەر قورئانە، چاكترین شتیش چەسپاوەكانە، خراپترین شـتیش داهێنراوەكانە، ئەوەی كەمەو پوختە زۆر چاترە لەوەی زۆرە و بێ سەنگە، نەفسێك

کـە مـرۆڤ ڕزگـار دەکـات زۆر چـاکترە لـەوە زۆری و بۆریـەك کـە بـە ژمـار نایـەت، خراپترین پاساوهێنانەوە لەکاتی سەرەمەرگە، خراپترین پەشیمانی پەشیمانی ڕۆژی قیامەتە، خراپترین گومڕایی ئەوەیە کـە مـرۆڤ هیدایـەتی وەرگرتبێـت ئینجـا گـومڕا بێتـەوە، چـاکترین دەوڵەمەنـدی دەوڵەمەنـدی نـەفس و دڵ و دەروونـە، چـاکترین تێشوو تەقوایە، چاکترین شت بۆ دڵ یەقینـە، گومـان لـە کـوفرەوە سـەرهەڵدەدات، خراپترین کوێری کوێر بوونی دڵـە، مەی هۆی خراپـە و گوناهـە، ئـافرەت تەڵەکـەی شەیتانە، گەنجایەتی بەشێکە لە شێتایەتی، شین و ڕۆ ڕۆ کارو پیشەی نەفامیەتە.

هێندێ کەس هەیە کە دێنە نوێژی هـەینی بـە لەشـگرانی دێـت، کـە زیکـری خـوا ناکاو پشتی تێ دەکات، گـەورەترین تـاوان زمانێکـە کـە درۆزن بێـت، هـەر کەسـێك لێبووردەبێت خـوا لێـی دەبوورێـت، هـەر کەسـێك لـە پێنـاوی خـوا تـووڕەیی خـۆی بخواتەوە خوا پاداشتی دەداتەوە، هەر کەسێك لێخۆشبەر بێـت خـواش لێـی خـۆش دەبێت، هەر کەسێك لەسەر بەڵادا ئارام بگرێت ئەوە خودا بۆی تەعویز دەکاتەوە.

خـراپترین کاسـبیش ریبایـە، خـراپترین خـواردنیش خـواردنی مـاڵی هـەتیوە، ئەوەندەتان بەسە کە دڵتان پێی قانع بێت، کردەوەش بە کۆتاییەکەیەتی، چاکترین مردنیش ئەوەیە کە مرۆڤ شەهید بێت، هەر کەسێك خۆی بەگەورە بزانێت ئەوە خـوا نزمی دەکاتەوە و سەرشۆری دەکات، هەر کەسێك بێ فەرمانی خـوای گـەورە بکـات ئەوە گوێڕایەڵی شەیتان دەکات.

✍ پێویستە لەسەر تێگەیشتوو لە قورئان و هەڵگری قورئان بە نوێژی شەوانی بناسـرێت کـاتێ خـەڵکی خـەوتوون، بـە ڕۆژوو بناسـرێت کاتێـك خـەڵکی بـێ ئاگـاو شادومانن، بە گریانی بناسرێت کاتێك خەڵکی ڕۆچوونە لە قسەدا، بە لە خـوا ترسـی بناسرێت کاتێك خەڵکی بێ فەرمانی خوادەکەن، پێویـستە لەسـەر هـەڵگری قورئـان گرینۆك و غەمبار و حەکیم و ئارامگر و لەسەر خۆبێت، نابێت هەڵگری قورئـان وشـك و بێئاگا و بەهات و هاوار بێت.

✍ هەر کەسێك خۆی بە بەرز و گەورە بزانێت خوای گەورە دەیشکێنێتەوە، هەر کەسێکیش تەوازوعی هەبێ و خۆی بەگەورە نەزانێت خوای گەورە بەرزی دەکاتەوە، بێگومان مەلائیکەت خەتەرەیەکی هەیە، شەیتانیش خەتەرەیەکی هەیە، جا خەتەرەی مەلائیکەت هاندانی مرۆڤە بۆ خێر و چاکە و بەڕاست زانینی حەق، کەواتە: هەر کەسێك ئەم خەتەرەی لە دڵی خۆیدا هەست پێکرد با سوپاسی خوای لەسەر بکات، بەڵام خەتەرەی شەیتان مرۆڤ هاندەدات بۆ شەڕ و خراپە و بەدرۆ زانینی حەق، کەواتە: هەر کاتێك هەستتان بەم خەتەرەیە کرد پەنابگرن بە خوا.

✍ هێندێ کەس قسەی گەورە گەورە دەکەن، جا هەر کەسێك قسەکانی لەگەڵ کردەوەکانی یەك بوون ئەوە سەرفرازە، بەڵام هەر کەسێك قسەکانی پێچەوانەی کردەوەکانی بوو بەڕاستی ئەوە خۆی هەڵدەخەڵەتێنێت.

✍ وا مەکەن کە بە ڕۆژ هەر خەریکی پێویستیەکانی دنیا بن، بە شەویش لێی بخەون وەکو کەلەشێکی مردوو، بەڕاستی من ڕقم لەو کەسەیە کە بێ کارە نە سوود لە کاری دنیا وەردەگرێت نە کاریش بۆ دوا ڕۆژی دەکات، هەر کەسێك نوێژەکەی نزیکی نەکاتەوە لە چاکە و دووری نەکاتەوە لە خراپە، ئەوە هیچ سوودی نیە لای خوا بەڵکو دووری دەکاتەوە.

✍ لە نیشانەکانی دڵنیایی ئەوەیە کە خەڵکی ڕازی نەکەی بە تووڕەیی خوا، کەسیش سوپاس و ستایش مەکە لەسەر ڕزقی خوا، کەسیش سەرزەنشت مەکە لەسەر ئەو شتەی خوا پێی نە بەخشیووی، چونکە ڕزقی خوا نە بەسووری مرۆڤ لەسەری چەنگ دەکەوێت، نە بە پێناخۆش بوونی مرۆڤ پێی دەگەڕێتەوە، خوای گەورە بە دادپەروەری و حیلمی خۆی وای کردووە ئارامی و دڵخۆشی لە دڵنیایی و ڕازی بوون دابێت، واشی کردووە غەم و خەفەت و دڵ تەنگی لە گومان و تووڕەی و ڕازی نەبوون دابێت.

✍ تا ئەوکاتەی تۆ لە نوێژ دابی دەکات هەر لە دەرگای پادشـایەك دەدەی کـە خوایـە، هـەر کەسـێکیش لـە دەرگـای پادشـا بـدات بێگومـان هـەر دەرگـای لێ دەکرێتەوە.

✍ من وا دادەنێم پیاو ئەو زانست و زانیاریەی کە فێری بووە بە گوناه و تاوان ئەنجامدان لە بیری دەچێتەوە.

✍ ببن بە سەرچاوەی زانست و زانیاری، ببن بـە مەشـخەڵی ڕێگـای هیدایـەت، ببن بە مولتەزیمی ماڵ، ببن بە چرای شەوان، ببن بە ڕێگا و توێشو بۆ دڵ، ببن بـە فرۆشیار، گەر وابوون دەناسرێن لە لای خـەڵکی ئاسمـان، شـاراوەن لـە لای خـەڵکی زەویش.

✍ بێگومان دڵ ئارەزووی هەیە و پـشت تێکردنیـشی هەیـە، جـا هـەرکاتێك دڵ ئارەزوو دەکا و ڕوو لەو شتە دەکـات کـە ئـارەزووی دەکـات تـۆ ئـەو کاتـە بکـە بـە فرسەت و بزانە و ڕێگای لێ بگرە، بەڵام کاتێك پشتی هەڵکردووە و وازیهێناوە تـۆش لێی گەڕێ.

✍ زانست ئەوە نیە کە کابرا قسە زان و بلیمەت بێت، بەڵکو زانست ئەوەیە کـە لە خوا بترسێت.

✍ ئێـوە دەبیـنن کـە کـافر لەشـی لـە هـەموو کـەس سـاغترە، بـەڵام دڵـی زۆر نەخۆشـە، دەبیـنین ئیمانـداریش دڵـی لـە هـەموو کـەس سـاغترە و بـەڵام لەشـی نەخۆشە، سوێند بە خوا ئەگەر بێتوو دڵتان نەخۆش بێت بەڵام لەشـتان سـاغ بێـت، ئەوە لە لای خوا زۆر بێ نرخترن لە خلێنکە.

✍ بەندە ناگات بە ئیمانی ڕاستەقینە تاکو خۆی نەڕازێنێتـەوە بـە لوتکەکـەی، ناشگات بە لوتکەکـەی تـاکو هـەژاری خۆشـتر نـەوێت لـە دەوڵەمەنـدی، تـەوازووعی خۆشتر بوێت لە شەرەف و گەورەیی، تاکو خەڵکی مەدحی بکەن یـان زەمـی بکـەن لای وەکو یەك بێت.

✍ بەڕاستی گوناه و تاوان دڵ دەکوژێ و دەست بەسەریدا دەگرێت.

✍ هەموو نەزەرێك پاڵێکی شەیتانی پێوەیە.

✍ لەگەڵ هەموو خۆشیەك ناخۆشیش هەیە، هەر ماڵێك پڕ بێت لە خۆشی ئەوە پڕە لە عیبرەت و دەبێت پەندی لێ وەربگیرێت.

✍ ئێوە وەکو مێوان وان ماڵەکەشتان خوازراوە (استعارة)یە، کەوابوو میوان دەبێت شوێنەکەی جێبهێڵێت، خوازراویش دەبێت بدرێتەوە بە خاوەنەکەی.

✍ لە ئاخیر زەماندا کەسانێك پەیدا دەبن چاکترین کردەوەکانیان لۆمەکردنی خەڵکیە لە نێوان خۆیان ناویشی دەبەن بە (ألأنتان) واتە: بۆگەن.

✍ حەق گران و تاڵـە، ناحەقیش سووك و شیرینە.

✍ زۆر جاری وا ئارەزووات مرۆڤ تووشی غەمگینی و خەفەتباری دەکات.

✍ هیچ شتێك لەسەر ڕووی ئەم زەوییەدا نیە کە وەك زمان پێویستی بە بەندکردنێکی زۆر هەبێت.

✍ هەر کاتێك زینا و ڕیبا لە شوێنێك سەری هەڵدا و بڵاوەی کرد با چاوەڕوانی تێچوون بن.

✍ هەر کەسێك لە ئێوە ئەگەر دەتوانێت گەنجینەکەی لە ئاسمان دابنێت با داینێت، چونکە نە کرمۆڵ دەبێت نە دەستی کەسیشی دەگاتێ، دڵی مرۆڤیش بەو شوێنەوەیە کە گەنجینەکەی لێیە.

✍ نەکەن لە دیندا تەقلیدی کەسێك بکەن، بە جۆرێك ئەگەر ئیمانی هێنا ئێوەش ئیمان بهێنن، ئەگەر کافریش بوو ئێوەش کافر بن، بەڵام ئەگەر ویستان ئیقتدا بە کەسێك بکەن تەقلیدی مردوو بکەن چونکە مرۆڤی زیندوو ئاشووبەی هەر هەیە.

✍ نەکەن لەگەڵ هەڵلای خەڵکی بن، ووتیان قوربان هەڵلای خەڵکی چیە؟! فەرمووی: هەڵلا ئەوەیە کە بڵێت: من لەگەڵ خەڵکیدا ڕێدەکەم، ئەگەر خەڵکی لەسەر چاکە بوون و چاکەیان ئەنجامدا ئەوە منیش وا دەکەم، ئەگەر خەڵکی لەسەر خراپە بوون و خراپەیان ئەنجامدا ئەوە منیش وا دەکەم، جا ئێوە وا مەبن بەڵکو

ئێوە دەرونتان جێگیرکەن لەسەر ئیمان، ئەگەر خەڵکیش لەسـەر کـوفر بـوون ئێـوە هەر لەسەر ئیمان بن و کوفر هەڵمەبژێرن.

✍ کابرایەك هاتە خزمەت (عبدالله)ی کوڕی (مسعود) پێی گوت: قوربـان فێـری چەند ووشەیەکم بکە کە کۆکەرەوە و بەسوود بێت، (ابن مسعود)یش فەرمووی: خوا بپەرستە و هاوبەشی بۆ بڕیار مەدە، تێکەڵی قورئان بە، ئەگـەر کەسێك ئامۆژگـاری بـە حـەق کـردی لێ ی وەرگـرە ئەگەرچـی ڕقیـشت لێبێـت و نەشـی ناسـی، هـەر کەسێکیش ئامۆژگاری ناحەقی بۆ کـردی لێ ی وەرمـەگرە و ڕەتـی کـەوە ئەگەرچـی دۆستیشت بێت و خۆشیشت بوێت.

بزانە دڵت لەو سێ شوێنانەیە ! لە کاتی بیستنی قورئان، لە کـاتی زیکـر و یـادی خوا، لە کاتی خەڵوەت لەگەڵ خوادا، ئەگەر دڵت لەو سێ شـوێنە نـەبوو ئـەوە دڵـت مردووە بۆیە داوا لە خوا بکەتا دڵێکی زیندووت پێ ببەخشێ.

# باسی ئیخــــلاص

ئیخلاص لە دڵێکدا جێگیر نابێت ئەگەر ئەو دڵــە حەز بکات خەڵکی مەدح و ستایشی بکەن، ئەگەر کۆشبێتەوە وەك کۆبونەوەی ئاو و ئاگر دەبێت پێکەوە ــ کە ئەمەش هەر مەحاڵە ــ .

ئەگەر دەتەوێت ئیخلاص لە دڵتدا دروست بێت، ئەوە ڕووبکە حەز و ئارەزووات بە چەقۆی بێ ئومێدی سەری ببڕە.

هەروەها: واز لە مەدح و ستایشی خەڵکی بێنە وەکو ئەو کەسەی عاشقی دنیایەو وازی لە دوا ڕۆژ هێناوە، جا ئەگەر حەز و مەدح و ستایشی خەڵکیت لە دڵی خۆت دەرهێناو و وەکو کۆتر سەرت بڕی ڕێگای ئیخلاصت بۆ ئاسان دەبێت.

ئەگەر پرسیاری ئەوەت کرد: بەچی ڕێگام بۆ ئاسان دەبێت بۆ ئەوەی حەز و مەدح و ستایشی خەڵکی لە دڵمدا ڕیشەکێش کەم؟ منیش لە وەڵامدا دەڵێم: ڕیشەکێش کردنی حەز و ئارەزووات بەو جۆرە بۆت ئاسان دەبێت کە بڕوایەکی پتەوت هەبێت هەر شتێك حەزی لێدەکەی ئەوە بە دەستی خوای گەورەیە کەس توانای بەسەریدا نیە بۆت فەراهەم بێنێت، بەندەش هیچ ڕۆڵێکی تیا نابینێت لە بە دەست هێنانی.

بەوەش بۆت ئاسان دەبێت مەدح و ستایشی خەڵکی لە دڵتدا ڕیشەکێش بکەی کە بڕوایەکی پتەوت هەبێت کە مەدح و ستایشی خەڵکی هیچ سوودت پێ ناگەیەنێت، بڕوات وابێت کە زەمی خەڵکی هیچ زەرەرێکت پێ ناگەیەنێت، بەڵکو زەرەر و قازانج هەر هەموو تەنها لە دەست خوایە.

کەوابوو: وازبێنە لەوەی کە خەڵکی مەدحت بکەن چونکە مەدح کردنی خەڵکی بۆ تۆ هیچ سوودت پێ ناگەیەنێت، وازبێنە لەوەی کە خەڵکی زەمت بکەن، چونکە

زەمكردنی خەڵكی هیچ زیانت پێ ناگەیەنێت، بەڵكو حەز بكە كە خوا مەدحت بكات، چونكە مەدحی ئەو سوودت پێ دەگەیەنێت، حەز بكە ئەو زەمت نەكات چونكە زەمی ئەو زیانت پێ دەگەیەنێت، ناشتوانی بگەیت بەم ئامانجەت تەنها بە (الصبر)ئارامگرتن و (اليقين)دڵنیایی نەبێت، كەواتە: هەر كاتێك دڵنیا و ئارامگر نەبووی دەكات تۆ وەكو ئەو كەسە وای كە دەیەوێت بە دەریادا گەشت بكات كەچی كەشتی پێ نیە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴾(الروم:٦٠)، واتە: ئارام بگرە، بێگومان وەعد و بەڵێنی خوا حەق و ڕاستە و هەر دێتەدی، ئەوانەی كە ئیمانیان نیە بێ ئارامت نەكەن و ساردت نەكەنەوە.

خـــوای گەورەدەفـــەرمووێ: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا ۖ وَكَانُوا بِـَٔايَـٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴾(السجدة:٢٤)، واتە: لەوانیشدا چەند كەسانێكمان كردە ڕێبەر، كە هەر بە فەرمانی خۆمان ڕێنموویی خەڵكی بكەن، چونكە توانای ئارامگرتنیان تێدا بوو، بە تەواویش باوەڕیان بە نیشانەكانی ئێمە هێنا بوو.

# تـام و چێژ وەرگرتن

لەزەت وەرگرتنی هەر کەسێك بە ئەندازەی قـەدر و هیمـەت و ڕێـزی نەفـسیەتی، جا بەڕێزترین نەفس وبەرزترین هیمەت و بە شکۆترین قەدر بۆ ئەوکەسەیە کە تام و لەزەت لە ناسینی خۆشەویستی و ئیشتیاقی گەیشتنی بە خـوا وەردەگرێـت، ئـەو کارانە دەکات کە خوا پێی خۆشە و لێی ڕازیە، ئا ئەوە تـام و لـەزەت لـە ڕووکردنـە خوا و خۆ پێ خەریك کردنی وەردەگرێت.

کەچی هێندێ کەس هەیە تـام وچێژ لـە شـتی وا وەردەگـرن گـەر خـوا بزانێـت، بەڵکو تام وچێژ لە پیسترین کـار و گفتـار و شـت وەردەگرێـت، ئەگـەر ئـەو شـتەی پێشکەش بکەی کە مرۆڤـی یەکـەم تـام و چـێژی لێ وەردەگـرت ڕەتـی دەکاتـەوە و پشتی تێدەکات، بگرە ئازاریشی پێدەخوات، هەروەك چۆن مرۆڤی یەکەم ئەو تـام و چێژەی ئەو کابرایەی پێشکەش بکرێت ڕەتی دەکاتەوە و پشتی تێدەکات.

خۆشترین و بەرزترین چێژ ئەوەیە کە مرۆڤ چێژ بۆ دڵ و ڕۆحی و جەستەی وەرگرێت، بەو جۆرەی کە چێژ لە شتە مباحەکان وەردەگرێت بە شێوەیەك نە بۆ دوا ڕۆژی زیانی هەبێت، نە ڕێگای چێژ وەگرتن لە ناسینی و خۆشەویستی و هۆگری خواشی لێ بگرێت، ئا ئەم جۆرە چێژە خوای گەورە باسی کردووە و دەفـەرمووێ: ﴿قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾ (الأعراف:٣٢)، واتـە: ئەی محمد پێیان بڵێ، ئەوە کێیە پۆشاك و زەینەت و جوانیە خواییەکانی لە بەندەکانی حەرام کردووە کە خوا بۆ بەندەکانی دروستی کردووە؟ هەروەها کێیە رزق و رۆزیە چاك و پاکەکانی حەرام کردووە؟ ئەی محمد بەو خەڵکە بڵێ: ئەوانە بۆ بڕوادارانە لەژیانی دنیادا، بێ بڕواکانیش لە پەنای ئەواندا بەژداری دەکەن، بەڵام لە ڕۆژی دوایی تایبەتە بە بڕواداران.

خراپترین و نزمترین چێژیش، ئەوەیە مرۆڤ چێژ لەو شتە وەربگرێت کە دەبێتە بەربەست لە نێوان ئەو تام و چێژانەی لە قیامەت بۆ مرۆڤ ئامادەکراوە خوای گەورە بەوانە دەفەرمووێت: ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا﴾ (الأحقاف:٢٠)، واتە: هەرچی تام و چێژ و خۆشییەك هەبوو لە ژیانی دنیاتاندا ئەنجامتان داو بە ئارەزووی خۆتان راتان بوارد.

بەڵێ: گرۆهی یەکەم تام و چێژیان لە خۆشیەکان وەرگرتووە بەو جۆرەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکردوون، ئەوانە دەکات خۆشی و چێژی دنیا و دواڕۆژیان پێکەوە بە دەست هێناوە، بەڵام گرۆهی دووەم تام و چێژیان وەرگرتووە بەو جۆرەی هەواو ئارەزواتیان فەرمانی پێداون، ئەوان هەموو چێژێك ئەنجام دەدەن جا خوا فەرمانی پێدابێت بیکەن یان نا، ئەوانە دوای ئەوەی ئەو خۆشیە کاتیانەی لە دنیا ئەنجامی دەدەن دوای ئەنجام دانی تام و چێژەکەی نامێنێت، لە هەمان کاتیشدا خۆشی و چێژی قیامەتیشیان لە چەنگ دەچێت، بۆیە بەم کارەیان نە خۆشی و چێژ لە دنیایان دەبینن، نە خۆشی و چێژ لە قیامەتیشیان دەبینن.

هەر کەسێك دەیەوێت بەردەوام خۆشی و چێژ وەرگرێت و ژیانی خۆش و کامەران بێت، با خۆشیەکانی دنیا بکات بە هۆیەك بۆ گەیشتن بە خۆشیەکانی قیامەت، بەوەی ئەو خۆشیانە بکات بە پاڵپشتێك بۆ یەکلاکردنەوەی دڵی بۆ بەندایەتی خوا، بەڵکو خۆشی وەرگرێت بۆ ئەوەی پێی بەهێز و توانای هەبێت بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی خوا فەرمانی پێکردووە نەك خۆشی تەنها بۆ هەوا و ئارەزووی وەرگرێت.

ئەگەر لەو کەسانە بوو کە خۆشی و لەزەتی پاکی دنیای بۆ ڕاخرا بوو و ڕەخسا بوو، با هەندێکی لێ بگرێتەوە بە ئومێدی ئەوەی لە قیامەت زیاتر لە خۆشی دابێت، با لێرەدا لێی بگرێتەوە بۆ ئەوەی لە قیامەت زیاتری پێ ببەخشرێت.

بێگومان خۆشیە پاکەکانی دنیا باشترین پشتیوانیە بۆ ئەوانەی ڕەزامەندی خواو قیامەتیان مەبەستە، خراپترین ڕێگریشە بۆ ئەو کەسانەی دنیایان مەبەستە.

هەر کەسێك سوود لە دنیا وەرگرێت بە جۆرێك کە زیان بە دوا ڕۆژی نەگەیەنێت، ئەوە لە دنیـا و قیامـەت سـەرکەوتوو و سـەرفراز دەبێـت، بـەڵام بـەو جـۆرە نـەبێت سەرگەردان و خەسارەت مەندی دنیا و قیامەت دەبێت.

# سوودی وازهێنان لە گوناه

چـەندین سـوود و قـازانج هەیـە لـە وازهێنـان لـە گونـاه و تـاوان، ئەگـەر مـرۆڤ دوورکەوێتەوە لە گوناه و تاوان ئەم خەسڵەتە چاکانەی دەست دەکەوێت لەوانـــە:

- ✓ مرۆڤ پێی شکۆدار دەبێت..
- ✓ شــەرەفی پارێزراو دەبێت..
- ✓ ماڵ و منداڵی پێ پارێزراو دەبێت..
- ✓ ئەو ماڵـەی کـە خـوا بـۆی کـردووە بـە چاکسازی دنیـا و قیامـەت پـارێزراو دەبێت..
- ✓ لای خەڵکی خۆشەویست دەبێت و قسەی لەلایان دەڕوا..
- ✓ ژیانی کامەران دەبێت، ئەندامەکانی لاشەی ئیسراحەت دەکات، دڵـی بـەهێز دەبێت، نەفسی ئاسوودە دەبێت، دڵی بەختیار دەبێت، سینە فراوان دەبێت..
- ✓ ناترسێ لەو شتانەی فاسق و خراپەکاران لێی دەترسن..
- ✓ خەفەت و غەم و نیگەرانی زۆر کەم دەبێت..
- ✓ نـووری نـاو دڵـی پـارێزراو دەبێـت، چـونکە گونـاه و تـاوان نـووری دڵ دەیکوژێنێتەوە..
- ✓ دەرگـای خێـری لێ دەکرێتــەوە ئــەو دەرگایانــەی کــە لــە خراپــەکاران دادەخرێت..
- ✓ ڕزقی بۆ فراوان و ئاسان دەکرێت بە جۆرێك کە خۆشی نازانێـت چـۆن، ئـەو شتانەی بۆ ئاسان دەبێت کە لەسەر خراپەکاران گرانە، ڕێگای بەندایەتی کردنـی بـۆ ئاسان دەبێت، ڕێگای بە دەست هێنانی زانستی بۆ ئاسان دەبێت..
- ✓ خەڵکی بە باشە ستایشی دەکـەن، دووعـای خێـری بـۆ دەکـەن، ڕوخسـاری جوان دەبێت لە لای خەڵکی، سام و شکۆی لە ناو دڵی خەڵکی پەیدا دەبێت، سەری دەخەن کاتێك ستەمی لێ بکرێت، بەرگری لێ دەکەن کاتی غەیبەتی بکرێ..

✓ هەر بە وازهێنان لە گوناه و تاوان هەست بە تەنهایی ناکات لە نێوان خۆی و خوا..

✓ مەلائیکەتی خوا لێی نزیك دەبنەوە، شەیتانی ئینسان و جنوکە لێ ی دوور دەبێتەوە..

✓ خەڵکی پێشبڕکێ دەکەن بۆ خزمەتکردنی و دابین کردنی پێویستیەکانی..

✓ ترسی مردنیشی نابێت، بەڵکو بە هاتنی مردن دڵخۆشیش دەبێت، چونکە مردن بە پەروەردگاری دەگەیەنێت..

✓ دنیای لە پێش چاو گچکە و بێ نرخ دەبێت، دوا ڕۆژی لەلای بەرز و بە نرخ دەبێت، سوور دەبێت بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا..

✓ تام و چێژ لە بەندایەتی خوا وەردەگرێت، هەست بە تام و چێژی ئیمان دەکات..

✓ مەلائیکەتی (حملة العرش) و ئەوانەی لە دەوریشی دان نزای بۆ دەکەن، ئەو دوو مەلائیکەتەی شت دەنووسن پێی دڵخۆش ئەبن و هەموو ساتێك نزای بۆ دەکەن..

✓ عەقڵ و هێزر و ئیمان و زانیاری بە هێز و پتەو دەبێت..

✓ خۆشەویستی خوای بۆ فەراهەم دێت و خواش خۆشی دەوێت، خوا خۆشحاڵ دەبێت بە تەوبەکردنەکەی، بۆیە خۆشی و ئاسوودەییەك دەخاتە دڵی کە بەرانبەر ناکرێت لەگەڵ ئەو کەمە خۆشیەی گوناه.

ئا ئەمە هێندێ سوود و قازانجی وازهێنان بوو لە گوناه و تاوان لە دنیادا، بەڵام سوودەکانی وازهێنان لە گوناه دوای مردن، ئەوەیە کە مەلائیکەتەکانی خوا مژدەی پەروەردگاری پێ دەدەن بە بەهەشت، نە ترس نە غەمگینیش دەبێت، لە بەندیخانەی تەنگی دنیاشدا دەگوازرێتەوە بۆ باخێك لە باخەکانی بەهەشت کە تاکو قیامەت دادێت بەخششی لەگەڵدا دەکرێت، جا کاتێك قیامەت داهات خەڵکی هەموو لە ناو گەرما و عارەقەدان، بەڵام ئەو لەژێر سێبەری عەرشی خوا دادەبێت.

کاتێکیش خزمەتی خوا جێدەهێڵن لەگەل مەلائیکەتەکان و لەگەڵ خواناسان و سەرکەوتوان دەگوازرێتەوە: ﴿ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء و الله ذو الفضل العظيم﴾ واتە: ئا ئەوە فەزڵ و بەخشی خوایە دەیدات بە هەر کەسێك کە بیەوێت، خوای گەورە خاوەنی فەزڵ و بەخششی گەورە و زۆرە.

## بە کارەکانت مەنــــازە

(ابن مسعود) لە (الطبقات)ەکەی خۆیدا باسی (عمر)ی کوڕی (عبد العزيز) دەکا و دەفەرمووێ: هەر کاتێك (عمر)ی کوڕی (عبد العزيز) لەسەر (منبر) ووتاری بدابایە ئەگەر هەستی بە لە خۆبایی بوونی بکردایە بە پەلە ووتارەکەی دەپچڕاند، هەر کاتێکیش نامەیەکی بنووسیبایە ئەگەر هەستی بە لە خۆبایی تیا بەدی کردبایە هەلا هەلای دەکرد و دەیفەرموو: (اللهم إني أعوذ بك من شر نفسي) واتە: خوایە پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و خراپەی نەفسم.

بەڵێ: بزانە مرۆڤ هەرکاتێك دەست بە قسەیەك یان کارێك بکات پێویستە لەسەری مەبەستی لەو کارەیدا ڕەزامەندی خوا بێت، بزانێت ئەوە منەتی خوایە لەسەریدا، بە یارمەتی ئەو ئەنجامیداوە، بزانێت خوا بۆی فەراهەم هێناوە، نەك نەفسی خۆی و شارەزایی و فیکر و هێز و توانای خۆی، بەڵکو بزانێت ئەو کەسەی کە زمان و دڵ و چاو و گوێی بۆ بە دیهێناوە، هەر ئەویشە منەت و بەخششی لەگەڵدا کردووە و ئەو قسە و کارەی بۆ فەراهەم هێناوە، جا ئەگەر هاتوو ئەمانەی لە پێش چاو بوو، ئەوە لە خۆبایی نابێت، چونکە بنچینەی لە خۆبایی بوون ئەوەیە ئەنجامدانی کارەکەی بەهێز و بازووی خۆی بزانێت و منەت و بەخششی خوای لە پێش چاو نەبێت.

بەڵام ئەگەر هاتوو ئەو خاڵانەی لەبەر چاو نەگرت و بەهێز و بازووی خۆی زانی، تووشی لە خۆبایی دەبێت ئەوکاتیش کار و گوفتارەکەی بە فەساد دەچێت.

دەبێ ئەوەش بزانین کە هیچ شتێك لە لەخۆبایبوون خراپتر نیە بۆ خراپکردنی کاروکردەوەی مرۆڤ، ئەگەر خوای گەورە چاکەی بۆ بەندەیەکی بوێت لە هەموو

کارو گوفتارێکی وای لێدەکات منەت و بەخششی خوای لەبەر چاو بێت، ئـەوکات لـە خۆبـایی نابێـت، پاشـان ئـەو بەندەیـە بـێ دەسـەڵاتی خـۆی دەردەبـڕێ و داوای لێبـووردن لـە پـەروەردگاری دەکـات، شـەرمیش دەکـات داوای پاداشـت لەسـەر کارەکانی بکات.

بەڵام ئەگەر وانەبوو ئـەوە مرۆڤەکـە لـە خۆبـایی دەبێـت و واگومـان دەبـات کـە کارەکانی رێك و پێك و تەواوە و بـەهێز و بـازووی خـۆی ئـەنجامی داوە، گـەر وابـوو ئەوە ئەم کارەی لای خوا سەنگی نیە و خۆشەویست نیە و لێی وەرناگیرێت.

کەواتە: مرۆڤی خواناس هەر کارێك ئـەنجام بـدات، خوایـەتی و منـەت و فـەزڵ و یارمەتی خوای لەبەر چاوە، شـەرم دەکـا و داوای لێبـووردن دەکـات لـەوەی ئەگـەر کارەکانی بە تەواوی ئەنجام نەدابێت.

بەڵام مرۆڤی نەفام و خوانەناس هەر کارێـك ئـەنجام بـدات بـۆ هـەواو ئـارەزووی خۆیەتی، هەر کارێکیش بکات بە هێز و بـازووی خـۆی دەزانێـت، لـە خـۆی ڕازیـە و منەت لەسەر خواش دەکات، ئائەوە رەنگێکە و ئەوی تریش رەنگێکی ترە.

# ئەو شتانەی ڕێگرن بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خودا

بۆ گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا پێویستە مرۆڤ واز لە (عادات) داب و نەریت بهێنێت، داب و نەریت چەند بیر و بۆچون و شتێکە کە خەڵکی خوویان پێوە گرتووە، وەکو شەرع حیسابی بۆ دەکەن، بەڵکو لە شەرعیش لەلایان بە نرختر و بە ڕێزترە، چونکە ئەوان زۆر ڕقیان لەو کەسانەیە کە پێچەوانەی داب و نەریتی ئەوان دەکەن و بە گوێیان ناکەن بە جۆرێك کە بەم جۆرە ڕقیان لەو کەسانە نیە کە پێچەوانەی شەرعی خوا دەکەن و پێی ڕازینین.

بەڵکو زۆر جار تەکفیری ئەو کەسە دەکەن کە پێچەوانەی داب و نەریتی ئەوان دەکات بە گومڕا و سەرلێشێواو و بیدعەکاری دادەنێن، یان قسەی لەگەڵ ناکەن و سزای دەدەن، چونکە پێچەوانەی داب و نەریتی ئەوانی کردووە، سوونەتی لە پێناودا دەمرێنن، وەکو بتیش بە ناوی پێغەمبەرەوە هەڵی دەواسن دۆستایەتی و دژایەتی لە پێناودا دەکەن.

چاکە لەلای ئەوان ئەو شتانەیە کە ڕێك بێت لەگەڵ داب و نەریتی ئەوان، خراپەش ئەوەیە کە پێچەوانەی داب و نەریتی ئەوان بێت.

جا ئەو داب و نەریتە باڵی بەسەر زۆربەی چینەکانی ڕووی زەوی کێشاوە لە هەموو چینەکان لەپادشاکان و کاربەدەستان و زاناکان و سۆفیەکان و هەژارەکان و خەڵکی عامیش، کە لەسەر ئەو داب و نەریتە منداڵەکانیان پەروەردە دەکەن، گەورەکانیان لەسەری ڕاهاتوون، کردوویانە بە سوونەت بەڵکو لە سوونەتیش لە لایان بەڕێزتر و بە نرخترە.

کەوابوو: هەر کەسێك لەگەل ئەو داب و نەریتانە ڕێبکا و خۆی پێوە پەیوەست بکات ئەوە دەبەسترێتەوە و ڕێگای بەرەو خوای لێ دەپچڕێت.

بەڵێ: ئەو نە خۆشیە زۆرێك لە خەڵكی بە گشتی گرتۆتـەوە، هـەر لەبـەر خـاتری داب و نـەریت پـشت لـە قورئـان و سوونەت دەكرێـت، هـەر كەسـێكیش خـۆی پـێ هەڵكێـشێ و شـوێنی بكـەوێت و پـشت لـە قورئـان و سـوونەت هـەڵكا، بێگومـان سەرگەردان دەبێت لای خوای گەورە و هیچیشی لێ وەرناگیرێت.

بەڕاستی ئەوە گەورەترین بەربەستە بۆ مرۆڤ كە ڕێگای لێ بگرێت بۆ گەیشتن بـە ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەری خوا.

بەڵام (العوائق) كۆسپ و تەگەرەكان، ئـەو سەرپێـچیانەن كـە دەبنـە كۆسـپ بـۆ دڵی مرۆڤ و ڕێگای گەیشتن بە ڕەزامەندی خودای لێ دەپچڕێنن، ئەمەش سێ شتن:

١. الشرك: هاوبەش دانان بۆ خوا.

٢. البدعة: ئەو شتانەیە كە داهێنراوە لە دین.

٣. المعصية: گوناه و تاوان.

بـە یەكتاپەرسـتی كۆسـپی هاوبـەش دانـان بـۆ خـوا لادەچـێت، بـە ئەنجامـدانی سوونەتی پێغەمبەریشﷺ كۆسـپی بیدعـەش لادەچـێت، بـە تـەوبـە و پەشـیمانیش كۆسپی گوناه و تاوان لادەچێت.

ئەو كۆسپ و تەگەرانەش بۆ مرۆڤ دەرناكەوێت تاكو هەڵنەستێت هەوڵنـەدات بـۆ ڕەزامەندی خودا و سەرفرازی دوا ڕۆژ، كە هەوڵیدا ئەوكات بە گوێرەی هەوڵدانەكەی ئەو كۆسپ و تەگەرانەی بۆ ڕوون دەبێتەوە و هەستی پێدەكات كە ڕێگرە لەبەر ئەو كارانەی بۆ خوا دەیكات، بەڵام ئەگەر دانیشتبێ و هیچ هەوڵێك نەدات بۆ ڕەزامەندی خودا ئەوە هیچ لەو كۆسپانەی بۆ ڕوون نابێتەوە.

بەڵام (العلائق) جگە لە خوا و پێغەمبەر، ئەو شـتانە دەگرێتـەوە كـە دڵ پێـوەی پەیوەست دەبێت وەك: ئارەزوواتی دنیـا و نـاوداری و هاوڕێیـەتی و تێكـەڵ بـوون و پەیوەست بوون پێیانەوە.

هـیچ ڕێگایـەكیش نیـە مـرۆڤ لـەو سـیانەی باسمـان كـرد ڕزگـار بكـات ـــ واتـە: (عادات)و(العوائق)و(العلائق) ــ تەنها یەك ڕێگا هەیە ئەویش دڵ پەیوەست بوونە بە

ئامانجی گەورە - کە ڕەزامەندی خوایە - ئەگەرنا ڕزگاربوون لێی مەحاڵە، چونکە نەفس شتێك جێ ناهێڵێت کە خۆشی دەوێ و پێوەی هۆگر بووە، مەگەر بۆ شتێك لەو خۆشەویستتر و چاکتر و گرنگتر بێت لەلای.

کەواتە: هەر کاتێك دڵی زیاتر پەیوەست بێت بەو شتەی حەزی لێیەتی ئەوە پەیوەست بوونی دڵی بە شتی ترەوە بێ هێز دەبێت، چونکە دڵ پەیوەست بوون بە شتێکەوە نیشانەیە بۆ ئەوەی کە زۆر حەزی لێیەتی.

دەبینین لەو کاتەوەی خوای گەورە پێغەمبەریﷺ بەرز و شکۆدار کردەوە، خەڵکی هەموو ئاتاجی بوون لە دنیا و قیامەت.

جا ئاتاجیان بە پێغەمبەرﷺ لە دنیادا زۆر پێویستترە لە ئاتاجیان بە خواردن و خواردنەوە و هەناسە کە ژیانی جەستەیانی پێوە بەندە.

بەڵام ئاتاجیان بە پێغەمبەرﷺ لە قیامەت، ئەوەیە کە دێن داوا لە پێغەمبەران دەکەن کە داوایان بۆ لە خوا بکەن لەو تەنگەبەریە ڕزگاریان بکات، پێغەمبەران هیچیان بۆ ناکەن تەنها (محمد)ﷺ داوایان بۆ لە خوا دەکات، هەر ئەویشە کە دەرگای بەهەشتیان بۆ دەکاتەوە.

# نیشانەی کامەرانی و سەرگەردانی مرۆڤ

نیشانەی کامەرانی و سەرفرازی مـرۆڤ، ئەوەیـە هـەرکاتێك زانـست و زانیـاری زۆر بوو تەوازوع و بەزەی زیاتر بێت، ئەگەر کار و کردەوەی زۆرتر بوو دەبێت ترسی لـە خوا زیاتر بێت، ئەگەر بە تەمەنتر بوو دەبێت چاو تێرتر بێت، ئەگەر مـاڵ و سـامانی زیاتر بوو دەبێـت زیـاتر سـەخی و بەخـشەر بـێ، ئەگـەر قـەدر و شـکۆی زیـاتر بـوو دەبێت لە خۆبایی نەبێ و لە خەڵکی نزیك بێتەوە و ئاتاجیەکانیان بۆ دابین بکات.

نیشانەی خراپی و سەرگەردانی مـرۆڤیش، ئەوەیـە هـەرکاتێك زانـست و زانیـاری زیاد بێت زیاتر لە خۆبایی دەبێت، ئەگەر کار و کردەوەی زیاتر بێـت زیـاتر شـانازی دەکا و خەڵك بە کەم دەزانێ و لە خۆبایی دەبێت، ئەگەر قەدر و شـکۆی زیـاتر بـوو زیاتر فیزاوی و لە خۆبایی دەبێت.

ئەوانەی باسمان کرد تاقی کردنەوەی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی، جـا هێنـدێ کەس دەرناچن لەو تاقی کردنەوەیە و پێی گومڕا دەبن، هێندێکیش پێی سـەرفراز دەبن.

بەهەمان شێوەش ڕێزلێنانی مرۆڤیش هەر تاقی کردنەوەی خوایە، وەکو مولـك و دەسـەڵات و مـاڵ و سـامان خـوای گـەورە لەسـەر زمـانی پێغەمبـەر (سـلیمان)دا دەفەرمووێ: کاتێك (سلیمان) بینی کۆشکی (بلقیس) لەلایەتی فـەرمووی: ﴿هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِيٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾ (النمـل:٤٠)، واتـــە: ئەمـە لـە فـەزڵ و بەخشـشی پەروەردگارمەوەیە بۆ ئەوەی تاقیم بکاتـەوە کـە ئایا سوپاسگوزار دەبم بەرانبـەر ئەو فەزڵەی لەگەڵی کردووم یان سپڵە و بەدنمەك دەبم.

کـەوابوو: نیعمـەت و بەخششیش بـۆ مـرۆڤ هـەر تـاقی کردنـەوەی خوایـە، تـاکو سوپاسگوزار و سـپڵە و بەدنمـەك لێـك جیـا بکاتـەوە، هـەر وەکـو ناخۆشـیش تـاقی

کردنـەوەی خوایـە، چـونکە خـوای گـەورە خـەڵکی تـاقی دەکاتـەوە بـە خۆشـی و نیعمەت، هەر وەکو چۆن تاقیـان دەکاتـەوە بـە ناخۆشـی و نـەهات خـوای گـەورە دەفــــــەرمووێ: ﴿فَأَمَّا ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾﴾ (الفجـر:١٥ـــ١٧)، واتــە: مـرۆڤ کاتێـك پـەروەردگاری تـاقی دەکاتـەوە بـەوەی ڕێـزی لێ دەنێـت و نـاز و نیعمـەتی بەسەردا دەڕژێنێت ئـەوە دەڵێـت: پـەروەردگارم ڕێـزی لێنـاوم، بـەڵام کاتێـك تـاقی دەکاتەوە و ڕزق و ڕۆزی کەمی پێدەبەخشێت و لێـی دەگرێتـەوە دەڵێـت: وا دیـارە پەروەردگارم ڕقی لێمە و ڕیسوای کردووم.

نەخێر وانیە.. بەو شێوەیەی ئـەوان بـیری لێدەکەنـەوە کـە هـەر کەسـێك خـوای گەورە ناز و نیعمەتی بەسەردا ڕژاند ئەوە ڕێزی لێناوە و خـوا خۆشـی دەوێـت، یـان هـەر کەسـێك ڕزق و ڕۆزی لێگرتبێتـەوە و تـاقی کردبێتـەوە ئـەوە ڕقـی لێـی بـێ و ڕیسوای کردبێت.

# بناغەی کارەکانت پتەو بکە

ئەگەر هەر کەسێك دەیەوێت ساختومانەکەی بەرز و بڵند و نایاب بێت، ئەوە پێویستە بناغەکەی پتەو و بەهێز بکات، چونکە بەرزی بینا و ساختمان پەیوەستە بە پتەوی بناغە و بنچینەکەی.

جا کاروکردەوەی مرۆڤیش وەکو ئەو بینا و ساختمانە وایە کە ئیمان بناغەکەیەتی، کەوابوو: ئەگەر هاتوو ئەو ساختمانە بناغەکەی ـ کە ئیمانە ـ پتەو بوو، ئەوە بینا و ساختمانی بەرز و بڵند لەسەریدا خۆی دەگرێت، هەر کاتێکیش هێندێك لە ساختمانەکەی ڕووخا دەتوانێت فریای کەوێت و چاکی بکات.

بەڵام ئەگەر بناغەکەی پتەو نەبوو، ئەوە بینا و ساختمانی لەسەر جێگیر نابێ و بڵند نابێتەوە، ئەگەر هێندێکیش لە بناغەکە تێك چوو ڕووخا ئەوە بینا و ساختمانەکە هەر هەمووی دەڕووخێت یان نزیکە وای لێبێت.

بەڵێ: مرۆڤی خواناس کۆشش دەکات بۆ پتەو کردن و ڕاستکردنەوەی بناغەی کارەکانی ـ کە بە هێزکردی ئیمانەـ بەڵام مرۆڤی نەزان تەنها هەوڵدەدات بینا و ساختمانەکەی بەرز و بڵند بێت و هیچی تر، گێش ناداتە پتەوی بناغەکەی خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ﴾ (التوبة: ١٠٩)، واتە: ئایا ئەو کەسە چاکترە کە بیناکەی لەسەر بنچنەی تەقوا و لە خوا ترسان دروست کردبێت و ڕەزامەندی خوای مەبەست بێت؟! یاخود ئەو کەسەی کە بیناکەی لەسەر لێواری کەندەڵانێکی بێهێز و ڕووخاو دامەزراندبێت، ئینجا لەگەڵ خۆیدا بڕوخێتە ناو ئاگری دۆزەخ.

بناغە بۆ کارەکانی مرۆڤ وەك هێزی بەرگری وایە بۆ لاشەی مرۆڤ، ئەگەر هێزی لاشەی پتەو بێت، ئەوە لاشەی بەهێز دەبێت و زۆرێك لە بەلای لێ دوور دەکاتەوە،

بەڵام ئەگەر هێزی لاشەی پتەو نەبێت، ئەوە لاشەی بێ هێز دەبێت و زوو تووشی بەڵا دەبێت.

کەواتە: تۆش بناغەی کارەکانت بە ئیمان پتەو بکـە، چونکە ئەگـەر کارەکانت لەسەر ئیمانێکی پتەو بیناکردبوو، ئەوە ئەگەر هاتوو هێندێ لەسەرەوەی بیناکەش ڕووخا دەتوانی بە ئاسانی فریای بکەوی ـ واتە: ئەگەر تووشی خراپەیەکیش بوو ئەوە چونکە ئیمانێکی پتەوت هەیە دەتوانی فریای بکەوی ــ بەڵام ئەگەر بناغەی کارەکانت پتەو نەبوو ـ کە خراپەیەك ڕووت تێدەکات ـ هیچت بۆ ناکرێت.

## بناغەی کارەکانیش دوو جۆرە:

یەکەم: بناغەی کارەکانت پتەو بکـەی بـە ناسینی خـوا و سنوورەکانی و نـاو و سیفاتەکانی.

دووەم: بناغەی کارەکانت پتەو بکەی بـە خـۆ یـەکلایی کردنـەوە بـۆ ملکەچـی و گوێڕایەڵی کردنی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ.

ئەمە چاکترین و پتەوترین بناغەیە کە مـرۆڤ سـاختمانی کارەکـانی خـۆی لەسـەر بینا بکات، ئەگەر وابوو ئەوکات هەر چەند حەز بکات دەتوانێت بیناکەی بەرز و بڵند بکات.

بەڵێ: هیمەت بدە خۆتـو و بناغـەی کارەکانـت پتـەو بکـە بـە ئیمـان، بـەهێزیش بپارێزە، بەردەوامبە لەسەر حیمایـە کردنـی، ئاگـاداریش بـە شـتی خراپـەی لەگـەڵ تێکەڵ نەبێت، ئەگەر وات کرد ئەوکات دەگەی بە مەبەستی خۆت.

جا ئەگـەر سـاختمانەکەت تـەواو بـوو، ئـەوە بـە ڕەوشـت جـوانی و چـاکە کـردن بەرانبەر خەڵکی بیڕازێنەوە، پاشان بـە پـەرژینی ئاگـاداری دەوری بـدە بـا دووژمـن دەستی نەیگاتێی و داینەبڕێت، پاشان دەرگاکان داپۆشە، پاشان دەرگا گەورەکەی ساختمانەکەت ـ کە زمانە ـ قوفڵ بدە بە قسە نەکردن لـەو شـتانەی کـە مەترسـی هەیە بۆ دواڕۆژت، پاشان کلیلێکی لە زیکری خوا بۆ دروست بکە کە بەو بکرێتەوە و دابخرێت، کە هەر کاتێك ویستت بیکەیەوە ئەوە بەو بیکەیەوە و دایبخەیت، ئەگەر

بەو شێوەت کرد ئەوکات دەکات تۆ قەڵایەکی قەڵغانیت پێکهێناوە کە هەرگیز دووژمن ناتوانێت زەفەرت پێ بەرێت، دووژمن بە دەوری قەڵایەکەدا دەسوڕێت دەبینێت هیچ ڕێگایەك نیە بچێتە ژوورەوە بۆیە بێ ئومێد دەبێت.

پاشان هەموو کاتێك زۆر ئاگاداری قەڵاکەت بە، چونکە دووژمن ئەگەر نەتوانێت بە دەرگاش بێتە ژوورەوە، ئەوە بە پێمەڕەی گوناە دیواری قەڵاکەت لێ کون دەکات، جا ئەگەر تۆش فەرامۆشت کرد ئەوە زۆر بە ئاسانی دەگاتە ناو قەڵاکەت ئەوکاتیش دەرکردنی زۆر ئاستەمە، کە هاتە ناوەوەش کار بۆ سێ شت دەکات:

١. یان کار دەکات بۆ ئەوەی باڵادەست بێت بەسەر قەڵاکەدا.

٢. یان کار دەکات بۆ ئەوەی لەگەڵ تۆدا جێنشین بێت تیایدا.

٣. یان کار دەکات بۆ ئەوەی سەرقاڵت بکات لەو شتانەی سوودی بۆ تۆ هەیە.

ئاگاداربە ئەگەر ئەو دووژمنە هاتە ناو قەڵاکەت، ئەوە سێ زەرەری بۆ تۆ هەیە:

١. قەڵاکەت لێ گەندەڵ دەکات.

٢. دەست بەسەر بەروو بوم و کەل و پەلەکەی دادەگرێت.

٣. دەبێتە چاو ساغی ئەو دزانەی کە وەکو خۆیەتی، جا بەردەوام بەسەرتدا دەدەن تاکو بێ هێز و شەکەت و ماندووت دەکەن، بەم شێوە تۆش دەستی لێ هەڵدەگری و قەڵاکەی بۆ جێ دەهێڵیت.

بەڵێ: ئەوە حاڵی زۆربەی خەڵکیە لەگەڵ ئەم دووژمنەیان، هەر بۆیەش دەبینی لەبەر خاتری نەفسیان خوا لە خۆیان تووڕە دەکەن، بەڵکو لەبەر خاتری مرۆڤێکی وەکو خۆیان کە نە زەرەر و نە قازانجی لە دەست دێت خوا لە خۆیان تووڕە دەکەن، دینەکەیان دەفرۆشن بە ماڵی دنیا، نەفسی خۆیان بە فیڕۆ دەدەن بۆ شتێك کە بۆیان نامێنێت، لەسەر دنیا سوورن لە کاتێکدا دنیا پشتی لەوان کردووە، دوا ڕۆژیان فەرامۆش کردووە لە کاتێکدا دوا ڕۆژ بەرەو ڕوویان دێت، شوێنی هەوا و ئارەزووی خۆیان کەوتوونە و پشتیان لە پەروەردگاریان کردووە، خەریکن بە دنیاوە و باسی دەکەن بەڵام مردنیان لە بیر چووە و باسی ناکەن، خەریکی هەوا و ئارەزووی خۆیانن پەیمانی خوایان لە بیر نیە، بە دنیا دڵخۆشن و لەسەر نەمانی دڵ

تەنگن، کەچی بە فەوتانی بەهەشت دڵ تەنگ نابن، دڵخۆش نابن بە ئیمان وەکو دڵخۆشن بە دینار و درهەم، حەق بە نا حەق پیس دەکەن، هیدایەت بە گومڕایی پیس دەکەن، چاکە بە خراپە پیس دەکەن، ئیمان لەگەڵ گومان تێکەڵ دەکەن، حەڵاڵ لەگەڵ حەرام تێکەڵ دەکەن، پشتیان لەو هیدایەتە کردووە کە خوا بۆی ناردوونە.

لە هەمووشی سەیرتر ئەوەیە کە ئەو دووژمنە کاتێك دەست بەسەر قەڵاکە دەگرێت، خاوەن قەڵاکە بەکار دێنێت بۆ وێران کردنی قەڵاکە بەدەستی خۆی.

# سەرچاوەکانی کوفر

سەرچاوەکانی کوفر چوار شتە:

١. الکبر: خۆ بەگەورەزانی.

٢. الحسد: حەسوودی.

٣. الغضب: تــووڕەیی.

٤. الشهوة: ڕابواردن و ئارەزووات.

خۆبەگــەورەزانی ڕێگــا بــە مــرۆڤ نــادات ملکــەچ و گوێرایــەڵ بێــت بــۆ خــوا.. حەسوودیش ڕێگا بە مرۆڤ نادات گوێ بۆ ئامۆژگاری شلکا و ئامۆژگـاری وەرگرێـت.. تووڕەیش ڕێگا بە مرۆڤ نادات دادپەروەر بێت.. شـەهوەت و ئـارەزوواتیش ڕێگـا بـە مرۆڤ نادات هەڵسێ بە بەندایەتی خوا.

ئەگـەر هـاتوو مـرۆڤ هێـزی دایـە بـەر خـۆی و خۆبەگـەورەزانی لـە نـاخی خۆیـدا ڕووخاند ڕێگای ملکەچی و گوێڕایـەڵی بـۆ ئاسـان دەبێـت، ئەگـەر حەسوودیـشی لـە نـاخی خۆیـدا ڕووخانـد ڕێگـای وەرگـرتنی ئامۆژگـاری بـۆ ئاسـان دەبێـت، ئەگـەر تووڕەییـشی لـە نـاخی خۆیـدا ڕووخانـد دادپـەروەری بـۆ ئاسـان دەبێـت، ئەگـەر شەهوەت و ئارەزوواتیشی لە ناخی خۆیدا ڕووخاند ڕێگای ئارامگرتن و داوێـن پـاکی بەندایەتی بۆ ئاسان دەبێت.

بەڵام ئەگەر کەسێك بەمانەوە گـیری خواردبێـت، ئـەوە لابردنـی چیا لـە شـوێنی خۆی زۆر ئاسانترە لەلای لەو چوارە، بە تایبـەت ئەگـەر ئەمانـە بووبێـت بـە خـوو و مەلەکـە و سـیفات، ئـەوکات زۆر ئاسـتەمە کـاری لەگەڵـدا بکرێـت، بۆیـە هـەرکاتێك بیەوێت کارێك ئەنجامدات ئەوە ئەم چوارە لێی فەساد دەکات، سەرچـاوەی هـەموو خراپەیەکیشی لەم چوارەوەیەوە سەرهەڵدەدات.

ئەگەر بێتوو ئەم چوارە بەسەر دڵیدا زاڵ بوو، ئەوە ناحەق بە حەق دەبینێت، حەقیش بە ناحەق دەبینێت، چاکە بە خراپە دەبینێت، خراپەش بە چاکە دەبینێت، دنیای لێ نزیك دەبێتەوە دوارۆژیشی لێ دوور دەکەوێتەوە.

ئەگەر وورد بینەوە لە سەرچاوەی کوفری گەلانی پێشوو، ئەوە دەبینین لەو چوارە هەڵقوڵاوە، هەر لەسەر ئەمەشە سزادراوون، جا کەم و زۆری سزاکە بە ئەندازەی کەم و زۆری ئەم چوارەیە.

کەواتە: هەر کەسێك ئەم چوار دەرگایە لەسەر خۆی دابخات، ئەوە هەموو دەرگاکانی خراپەی لەسەردا دادەخرێت، چونکە ئەم چوارە ڕێگا بە مرۆڤ نادەن کە ملکەچ و ئیخلاص و تەوبە کار بێت و حەق و ئامۆژگاری موسڵمانان وەربگرێت و تەوازوعی بۆ خوا و بەندەکانی خوا هەبێت.

سەرچاوەی هەلقوڵانی ئەم چوارەش لە ناخی مرۆڤدا ئەوەیە کە ئەو مرۆڤە بە چاکی پەروەردگاری نەناسیوە و نەفسی خۆی نەناسیوە، چونکە ئەگەر پەروەردگاری بناسیبایە بەوەی کە خاوەنی هەموو سیفاتێکی بەرزو بڵندو بێ کەم و کورتیە، نەفسی خۆشی بناسیبایە بەوەی کە پڕە لە کەم و کورتی، دڵنیابە ئەوەهەرگیز خۆی بە گەورە نەدەزانی و تووڕە نەدەبوو و حەسوودیشی بەکەس نەدەبرد و بەو شتەی کە خوا پێیداوە، لەبەر ئەوەی لە ڕاستیدا حەسوودی جۆرێکە لە دووژمنایەتی کردنی خوا کە پێی ناخۆشە خوا ئەو نیعمەتەی بە بەندەی خۆی بەخشیوە لە کاتێکدا کە خوا خۆی پێی خۆشە، پێی خۆش نیە ئەو نیعمەتە لەسەر ئەو بەندەیەی لاچێت لەکاتێکدا خوا پێی خۆشە لەسەری لاچێت.

ئەمەش دژایەتی (القضاء و القدر) و حەز و پێناخۆشی خوایە، بۆیە (ابلیس) دووژمنی ڕاستەقینەی خوایە، چونکە گوناهەکەی هەڵقوڵاوی خۆبەگەورەزانی و حەسوودی بوو.

هەڵکێشانی ئەم دوو ڕەوشتەش (کبر) و (حسد) بە ناسینی خواو یەکتاپەرستی دەبێت، بە ڕازی بوونی بە بڕیاری خوا و گەڕانەوەی بۆ لای خوا دەبێت.

هەڵکێشانی تـووڕەیش بـە ناسـینی نەفـسی خـۆی دەبێـت، بـەوەی کـە نەفـسی شـیاوی ئـەوە نیـە لەبـەر خـاتری ئـەو تـووڕە بێـت و تۆڵـە بسێنێت، چـونکە ئـەوە هەڵبژاردنی نەفسە بەسەر ئـەو پـەروەردگارەی دروسـتی کـردووە، بـە سـوودترین و گرنگترین شتیش کە ئەم بەڵایەی پێ لە خـۆی دوور بکاتـەوە، ڕاهێنـانی نەفـسیەتی لەسەر ئەوەی کە لەبەر خاتری خوا تووڕە بێت و ڕەزامەندیشی هـەر لەبـەر خـاتری خوا بێت، کەوابوو هەرکاتێك لەبەر خوا تووڕە بـوو و ڕازی بـوو، ئـەوە تـووڕەیی بـۆ نەفسی خۆی و ڕەزامەندی بۆ نەفسی خۆی نامێنێت.

دەرمـانی ئـارەزوواتیش زانـست و زانیـاری درووسـتە، چـونکە زانـست و زانیـاری درووست وا لە مرۆڤ دەکات کە چاو ساغ بێت بەرانبەر بە ڕاستی شتەکان.

(الغضب) تووڕەیی، وەکو ئاژەڵی دڕنـدە وایـە، هـەر کاتێـك خاوەنەکـەی لـە نـاو چوو دەست دەکات بە خواردنی.

(الشهوة) ئارەزووات، وەکو ئاگر وایە، ئەگـەر خاوەنەکـەی هـەڵی گیرسـاند گڕپـە دەکا و دەیسوتێنێ.

(الكبر) خۆبەگەورەزانی، وەکو لێ گرتنەوەی موڵکی مەلیکە، ئەگـەر بـە هیلاکـت نەبات ئەوە دەرت دەکات.

(الحسد) ئێرەیی، وەکو دژایەتی کردنی کەسێکە کە لە تۆ بە هێزترە.

# باسێکی زۆر گرنك و بە سوود

ئەوانەی خوا ناناسن و نـاو و سیفاتە بـەرزەکانی خـوا ناناسـن، خـەڵکی لـە خـوا تـووڕە دەکـەن، خـەڵکی سـارد دەکەنـەوە لەسـەر خۆشەویستی خـوا و بەندایـەتی کردنی.

ئەوانـە بـۆ ئـەوەی خـەڵکی لـە خـوا دووربخەنـەوە چـەند ڕێگایـەك دەگرنـە بـەر لەوانــە:

یەکێك لەو ڕێگایانەی خەڵکی پێ لە خوا دوور دەخەنەوە ئـەوە لـە دڵـی خـەڵکی ئیمان لاواز دەچێنن کـە ئەگـەر هـەر چـەندیی بەندایـەتی خـوا بکـەی بـێ سـوودە، دەڵێن: چونکە بەندە دڵنیا نیە لە مەکری خوا، لەبەر ئەوەی جاری وا خوا مرۆڤی بە تـەقوا لـە (محـراب)ی مزگـەوت بـەدەر دەنێـت بـۆ مەیخانـە، لـە یەکتاپەرسـتی و تەسبیحاتی خوا سەرگەردانی دەکات بۆ شیرك و گەمـە و گاڵتـە و هەڵپـەرکێ، خـوا دڵــی مرۆڤــی ئیمانــدار هەڵدەگەڕێنێتــەوە بــۆ کــوفر، بەڵگــەش بــەم ئایەتــە دێننـــــــــەوە: ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾ (الاعراف:٩٩)، واتـە: ئایا دڵنیا بوون لە مەکری خوا؟! بێگومـان کـەس دڵنیـا نابێـت لە مەکری خوا جگە لەو کەسانە نەبێت کە خەسارەت مەندن.

ئـەو ئایەتـەش بەڵگــە دێننـەوە: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ﴾ (الانفال: ٢٤)، واتـە: بێگومان ئەوە بزانن کە خوای گـەورە بەربەسـت دەکاتـە نێـوان مرۆڤ و دڵیەوە.

(ابلیس)یش دەکەن بە بەڵگـە لەسەر ئەو بۆچونانەیان دەڵێن: (ابلـیس) تاووسـی مەلائیکـەت بـوو کەچـی خـوای گـەورە ئـەوها سـەرگەردانی کـرد، کەچـی قـەدەر و حیکمەتی خوا ئەو پاکەی گۆڕی و کردی بە خراپترین شت.

هێندێ لە زاناکانیان دەڵێن: (انك ينبغي أن تخاف الله كما تخاف الأسد، الذي يَثِبُ عليك بغير جُرْمٍ منك ولا ذنب أتيته إليه) واتە: پێویستە بەو شێوە لە خوا بترسێی کە چۆن لە شێر دەترسێی، چونکە شێر بێ ئەوەی هیچ تاوانت کردبێ پڕت دەداتێ.

بەڵگەش بەم حەدیسەی پێغەمبەر ﷺ دێننەوە: (( إن أحَدكُم لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أهْلِ الجنَةِ حَتى ما يكونُ بَيْنَهُ و بينها إلا ذراعٍ فيسبق عليهِ الكتاب فَيعمَلُ بِعَمل أهْل النارِ فَيدخلها))[1]، واتە: هێندێ کەس لە ئێوە کاری بەهەشتی ئەنجام دەدات، هەتا لە بەهەشت نزیك ئەبێتەوە بە ئەندازەی قۆڵێك، جا کتێبەکەی پێشی دەکەوێ ـ کە نووسراوە دۆزەخیەـ بۆیە دەست دەکات بە کاری دۆزەخی و دەچێتە دۆزەخ.

دەڵێن: هێندێ لە (السلف)یش فەرموویانە: (أكبرُ الكبائر الأمن من مَكْرِ الله و القنوط من رحمة الله) واتە: گەورەترینی گوناهەکان دڵنیا بوونە لە مەکری خوا و ئومێد بوونە بە ڕەحمەتی خوا.

جا بنچینە پوچەکانیان بەم شێوە ڕیز دەکەن، کە ئینکاری کردنی حیکمەت و تەعلیل و ئەسبابی خوایە، ئەوانە بڕوایان وایە کە خوای گەورە نە بە حیکمەت و نە بە (سبب) کاردەکات، بەڵکو هەروا چی بوێت دەیکات، کە دەتوانێت بەندەی ملکەچی خۆی تووندترین سزا بدات، دووژمنان و گوناه کارانیش چاکترین پاداشت بکات، بەڵکو چاکەکار و تاوانبار بە نیسبەت خوا وەکو یەکە.

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٦/٢٢٠)، ومسلم (٢٦٤٣)، و ابو داود (٤٧٠٨)، والترمذي (٢١٣٨)، وابن ماجه (٧٦).

## وەڵامدانەوەی گومانە پوچەکەیان:

ئەوە چۆن دەبێت کە ئێمە گوێڕایەڵی خوا بکەین، واز لە خۆشی و ئارەزوواتی دنیا بهێنین، بەندایەتیش ئەنجام بدەین، لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیا نەبین لە خوا بڵێن: لە ئیمانەوە وەرمان دەگێڕێت بۆ کوفر، لە یەکتاپەرستیەوە وەرمان دەگێڕێت بۆ شیرك، لە بەندایەتی وەرمان دەگێڕێت بۆ گوناه و تاوان، لە چاکەوە وەرمان دەگێڕێت بۆ خراپە، سزامان دەدات، ئەگەر وابێت دەکات ئێمە خەسارەت مەندی دنیا و قیامەت دەبین.

خوای گەورە ئەوەی بۆ ڕوون کردۆتینەوە کە خەڵکی بەگوێرەی کارەکانیان حیسابیان لەگەڵدا دەکرێت، پاداشت و سزا بەپێی کردەوەکانیان دەبێت، چاکەکار ناترسێ ستەمی لێ بکرێ و مافی بخورێ، ناترسێ لەوەی کردەوە چاکەکانی بێ نرخ تەماشا بکرێت، لە گوناهیشی چاوپۆشی نەکرێت، چونکە خوای گەورە هەرگیز چاکەی چاکەکاران بە فیڕۆ نادات، بەڵکو ئەگەر بێتووچاکەی بەندە بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێت ئەوە لەلای خوای گەورە بە فیڕۆ ناچێت و ستەم لە کەس ناکرێت خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمًا﴾ (النساء:٤٠)، واتە: ئەگەر مرۆڤ چاکەیەکی هەبێت ئەوە خوای گەورە بۆی چەند بەرانبەر دەکات و لەلایەن خۆیەوە پاداشتی گەورە و بێ سنووری پێ دەبەخشێت.

بەڵێ: ئەگەر چاکەی مرۆڤ بە ئەندازەی گەردیلەیەکیش بێت، ئەوە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە و بە فیڕۆی نادات، بەڵام سزای تاوان هەر تاوانێکە و زیاد ناکات لەگەڵ ئەوەشدا بە تەوبە و پەشیمانی و ئیستیغفار و چاکە ناخۆشیش نامێنێت، کەچی چاکە یەك بە دەیە واتە: بەرانبەر یەك چاکە خوای گەورە دە پاداشتی

دەداتەوە، بەڵکو لەوەش زیاتری دەکات بۆ حەوت سەد قات، بەڵکو لەوەش زیاتری دەکات بۆی.

خوای گەورە مرۆڤی خراپەکار چاك دەکات، تەوبە لە تاوانباران و گوناهباران وەردەگرێت، ئەوانەی بە هیلاك چوونە و گومڕا و سەرگەردان بوونە ڕزگاریان دەکات و هیدایەتیان دەدات، نەفام و نەزانان هۆشیار و دانا دەکات، چاو ساغی بە سەرلێشێواوان دەبەخشێ، بێ ئاگایان بە یاد دێنێتەوە، بەڵام مرۆڤ کاتێك خوا سزای دەدات کە لە سنوور دەرچێت و سەرکەشی بکات، ئەو سزایەی خواش دوای ئەوە دێت کە چەندین جار بانگی کردوون بۆ ئیمان هێنان بەخوا و پەروەرگاریەتی و فەرمانەکانی، کەچی ئەوان هەر سەرکەش بوونە، تاکو ئەو کاتەی کە هیچ ئومێدی وەڵامدانەوە و دان هێنان بە یەکتاپەرستی و پەروەردگاریەتی خوایە تیان نامێنێت، ئا ئەوکات خوای گەورە بەهۆی کوفر و سەرکەشی و دان نەهێنانیانەوە سزایان دەدات، بە جۆرێك کە ئەوکات مرۆڤ خۆی دان بە هەڵەی خۆی دەنێت و دان بەوە دەنێت کە خوا ستەمی لێ ناکات، هەر وەکو خوای گەورە دەربارەی دۆزەخیەکان دەفەرمووێ: ﴿ فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ (الملك:١١)، واتە: بە ناچاریی و خەجاڵەتیەوە دان بە گوناه و تاوانی خۆیاندا دەنێن، دووریی لە میهرەبانی خودا بۆ هاوڕێیانی دۆزەخ.

خوای گەورە دەربارەی ئەوانەی لە دنیادا بە هیلاکی بردوون دەفەرمووێ: کاتێك هەستیان کرد کە سزای خوا بەرەو ڕوویان هاتووە و خەریکە یەخەیان بگرێت دەیان گووت: ﴿ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ١٤ فَمَا زَالَت تِّلۡكَ دَعۡوَىٰهُمۡ حَتَّىٰ جَعَلۡنَٰهُمۡ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ﴾ (الأنبياء:١٤ـ١٥)، واتە: هاوار بۆ ئێمە بەڕاستی ئێمە ستەمکار بووین، بەردەوام هەر ئەوە قسەیان بوو، هەتا هەموویانمان لە ناوبرد و لە جێگاکانی خۆیاندا وەك دەغڵێکی دروێنەکراو هەناسەمان لێبڕین و کوژاندمانەوە.

خاوەن باخەکەش کاتێك باخەکەی خۆیانی بینی خوا خراپی کردووە گوتیان:

﴿قَالُوا سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ﴾ (القلم:٢٩)، واتــە: گوتیـان، پـاکی و بێگـەردی بـۆ پەروەردگارمانە، بەڕاستی ئێمە ستەمکار بووین.

خـــوای گـــەورە دەفـــــەرمووێ: ﴿فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُوا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ (الأنعام: ٤٥) واتـە: ئەو گەلەی پیشەیان ستەم بوو بنبڕ کران، سوپاس و ستایش بۆ خوای (رب العالمین).

ئەو بنبڕکردن و لـەوناو بردنـە سوپاسـی پـەروەردگاری لەسـەر دەکرێت، لەبـەر حیکمەت و دادپەروەری کارەکەی، کە سزای کەسێك دەدات شیاو بێت بەو سزایە.

بەڵـێ: خوای گەورە سزای کەسێك دەدات، ئـەو کەسـە خـودا سـزای داوە ئەگـەر تۆش بیناسی دەڵێیت: بەڕاستی ئەو سزایە شیاوی ئەو کەسەیە، ئەو تـەنها شـیاوی سزایە.

بۆیەش خـوای گـەورە ئـەوە ڕوون دەکاتـەوە کـە دوای ئـەوەی حـوکم لـە نێـوان بەندەکانیدا دەکات، هەر کەسێك چاکەکار و بەهەشـتی بـوو بـەرەو بەهەشـت بـەڕێ دەکرێ، هەر کەسێکیش خراپەکار و دۆزەخی بێت ئەوە بەرەو دۆزەخ بەڕێ دەکرێ ئینجـا دەفـــەرمووێ: ﴿وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَقِيلَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾(الزمـر: ٧٥)، واتـە: حوکم و بـڕاری خـوای گـەورە بـە دادپەروەرانـە لـە نێوانیانـدا جێبـەجێ کـرا، ئینجا دەگووترێ (الحمد لله رب العالمین).

لێرەدا (فاعل)ی ئەو ووتەی (الحمد لله رب العالمین) (حذف) کراوەو دیار نیە، بۆ ئەوەی هەست بـە گـوتنی گشتی بکرێت، واتـە: هـەموو بوونـەوەر پێکـەوە دەڵـێ: (الحمد لله رب العالمین) کاتێك دەبیستن خوای گەورە حوکم وبریارەکەی زۆر حەق و دادپەرورانە و بەخشندە بووە.

هــەر بۆیـــەش لـــە بـــارەی دۆزەخیەکانـــەوە دەگـــوترێ: ﴿قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ﴾(الزمر:٧٢)، واتـە: پێیان دەگوترێ: بە دەرگاکانی دۆزەخدا بچنە ژوورەوە.

وەکو ئەوە وایە کە بوونەوەر هەمووی وایان پێبلێت: ئەندامـەکانیان و ڕۆحیـان و زەوی و ئاسمانیش وایان پێ دەڵێت.

خـوای گـەورە ئـەوە ڕوون دەکاتـەوە ئەگـەر دووژمنـانی لەسـەر خراپـەکاری لـە ناوببات، ئەوە دۆستـەکانی لەبـەر چاکەکانیان ڕزگـار دەکـات، نـەوەك بـە هـەوەس هەموویان پێکەوە لە ناوببات.

هەر وەك (نوح) داوای لە خوا کرد کە کوڕەکەی ڕزگار بکات، بەڵام خوای گـەورە پێی ڕاگەیاند کە غەرقی دەکات لەبەر ئەو کـوفر و کـارە خراپانـەی ئـەنجامی دەدا، نەی فەرموو: بە هەوەس غەرقی دەکەم بەبێ هیچ گوناه و هۆیەك.

بێگومان خوای گەورە زەمانەتی داوە کـە ئەوانـەی لـە پێنـاوی ئـەودا دەجـەنگن زیاتر هیدایەتیان بدات و سەرفرازیان بکات، نە یفـەرمووە: سـەرگەردانیان دەکـەم و کارەکانیان بە هەدەر دەبـەم، هـەروەها زەمانەتیـشی داوە کـە ئـەو کەسـانە زیـاتر سـەرفراز و هیدایەتبـدا کـە تـەقوادارن و دوای ڕەزامەنـدی خـوا کەوتوونـە، ئـەوەش ڕوون دەکاتەوە کە کەسێك سەرگەردان و گومڕا ناکات، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە فاسق و پەیمانی خوایان هەڵوەشاندۆتەوە، ئەو کەسە گومڕا دەکات سـەرگەردانی و گومڕایی بەسەر سەرفرازی و هیدایەت هەڵدەبژێرێت، ئەوکات بەهۆی ئـەو کارەیـەوە خوا مۆر دەنێـت بەسـەر چاو و دڵیـدا، ئەوەشـی ڕوون کردۆتـەوە کـە دڵـی کەسـێك وەردەگێڕێت کاتێك هیدایەتی خوای بۆ دێ پێی ڕازی نەبێ و ئیمانی پێ نـەهێنێ و پـشتی تـێ بکـات و ڕەتـی کاتـەوە، ئـەوکات لـە سـزای ئـەو کـارەی دڵ و بینینـی وەردەگێڕێت، خۆ ئەگەر خوای گەورە ئـەو کەسـەی گـومڕا و سـەرگەردانی کـردووە خێـری تیـا بـەدی بکردایـە، ئـەوە وای لێـدەکرد کـە حـەق و ڕاسـتی تـێ بگـا و هیدایەتیشی دەدا، بەڵام دیارە شیاوی بەخشش و ڕێزلێگرتنی خوا نیە.

خوای گـەورە بەڵگـە و نیشانەی بـۆ هێناونەتـەوە، ڕێگـای هیدایـەتی بـۆ ئاسـان کردوون، کەسیش گومڕا ناکات تەنها فاسق و ستەمکاران نەبێت، دڵی کەسیش مـۆر لێنادا تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە لە سنوور دەرچوونە، کەسیش تووشی نەهامەتی ناکات مەگەر منافقەکان نەبێت، ئەو ژەنگەشی کە دڵی کافرانی پێ داپۆشتووە هـەر

بەهۆی بڕوا و کارە قێزەونەکانی خۆیانەوەیە هەر وەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾(المطففـين:١٤)، واتــە: نـەخێر وانیــە بـەڵکو دڵیان ژەنگی هێناوە و چڵکی گوناه دایپۆشیوە بـەهۆی ئـەو کـار و کردەوانـەی کـە دەیانکرد.

خوای گـەورە دەربـارەی جوولەکـەکانش دەفـەرمووێ: ﴿وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ بَلْ طَبَعَ اللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ﴾ (النساء:١٥٥)، واتـە: کە دەڵێن: دڵی ئێمە داخراوە و بەرگی پێوەیە ـ مەبەستیان ئەوەیە ئامادە نین گوێ بۆ هیچ ڕاستیەك بگرن ـ نـەخێر بـەو جۆرە نیە کە ئەوانە دەیڵێن: بەڵکو خوا مۆری ناوە بەسەر دڵ و دەروونیاندا بەهۆی بێ باوەڕ بوونیانەوە.

خوای گەورە ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە هیچ کەسێك گـومڕا ناکـات تـاکو ڕێگـای هـەموو شـتێکی بـە تـەواوی بـۆ ڕوون نەکاتـەوە، بـەڵکو مرۆڤەکـە بـۆ خـۆی خراپـە هەڵدەبژێرێت و گومڕایی و سەرکەردانی بەسەر هیدایەت و سەرفرازیدا هەڵدەبژێرێت.

## وەڵامدانەوەی بەڵگە پوچەکانیان:

✓ دەربارەی (مەکر)ی خوا کە خۆی پێ وەسف کردووە، مەکری خـوا سـزایە بـۆ ئـەو کەسـانەی مـەکر لـە دژی دۆسـتان و پێغەمبـەرانی خـوا دەگێـڕن، جـا ـــ ئـەو گرۆهەی پێشتر باسمان کـرد ـــ مـەکرە پـیس و خراپەکـەی مـرۆڤ بـەراورد دەکـەن لەگـەڵ مـەکری چـاك و دادپەروەرانـەی خـودا، چـونکە مـەکری ئـەوان پیسـترین و خراپترین شتە، بەڵام مەکری خوا چاکترین شتە چونکە دادپەروەرانەیە.

✓ بە هەمان شێوەش (خداع) فێڵی خوا، سزایە بۆ ئەو کەسـانەی فـێڵ و تەڵەکـە لـە دژی دۆسـتانی خـوا و پێغەمبـەرانی خـوا دەگێـڕن، جـا (خـداع) و (مکـر)ی خـوا چاکترین شتە.

✓ دەربارەی ئەو حەدیسەش کە باسـی ئـەو کەسـە دەکـات: (( إن أحَـدَكُم لَيَعْمَلُ

بِعَمَلِ أهْلِ الجنَة حَتى ما يكونُ بَيْنَه و بينها إلا ذراعٍ فيسبق عليةِ الكتاب فَيعمَلُ بِعَمل أهْل النارِ فَيدخلها ))[1]، واتـە: هێنـدێ کـەس لـە ئێـوە کـاری بەهەشـتی ئـەنجام دەدات، هەتا لە بەهەشت نزیك ئەبێتەوە بە ئەندازەی قۆڵێك، جا کتێبەکەی پێشی دەکەوێ ـ کە نووسراوە دۆزەخیە ـ بۆیە دەست دەکات بە کاری دۆزەخی ودەچێتە دۆزەخ.

لێرە مانای ئەوەیە کە ئـەو کـارەی ئـەو کەسـە دەیکـات لـەلای خـەڵکی کـارێکی بەهەشتیە، ئەگینا ئەگەر بەڕاستی کارێکی چاك و پاك بایـە و بەهەشتی بایە، ئـەوە خوا ئەو کارەی لێ وەردەگرت و ئەو بەو کـارە خـوا لێـی خـۆش دەبـوو و لێـی ڕازی دەبوو، هەرگیز کارەکەی لێ پوچەڵ نەدەکردەوە.

بەڵام ئەگەر تێبینی بکەین کێشەکە لـە کۆتـای حەدیسەکەدایە ئـەویش ئەمەیـە: (لم يبق بينه و بينها إلا ذراع) جا لەم بارەیـەوە گـوتراوە: مـرۆڤ حیـسابی کۆتـایی بـۆ دەکرێـت، بـەڵام ئـەو کابرایـە ئـارامی نـەگرتووە تـا کۆتـایی، بـەڵکو لـە کارەکانیـدا کارەساتێکی نادیاری هەیە کە سـەرگەردانی دەکـات، وای لێدەکات تووشـی دۆزەخ بێـت و کـاری دۆزەخـی ئەنجامبـدات، ئـەگینا ئەگـەر بێتـوو هـیچ گەندەڵیـەك لـە کارەکانیدا نەبێت خوا ئیمانی لێ ناگۆڕێت، خوای گەورەش چاکتر بەنـدەکانی خـۆی دەناسێت لەوەی ئەوان کە یەکتر دەناسن.

✓ دەربارەی ئەوەش کە (ابلیس) چاك بووە خوا وای لێکـردووە بێگومـان خـوای گەورە بە مەلائیکەتەکانی فــەرمووی: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ (البقـرة:٣٠)، واتــە: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

خــوای پــەروەردگار دەیزانــی چــی لــە دڵــی (ابلــیس)دا هەیــە لــە کــوفر و خۆبەگـەورەزانی و حەسـوودی، کەچـی مەلائیکـەت ئەمـەیان نـەدەزانی، جـا کاتێـك خوای گەورە فەرمانی پێکردن کە کرنۆش بۆ ئادەم بەرن، مەلائیکەتەکان هەموویان

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٦/٢٢٠)، ومسلم (٢٦٤٣)، و ابو داود (٤٧٠٨)، والترمذي (٢١٣٨)، وابـن ماجـه (٧٦).

گوێڕایەڵیان کرد، ئەوەی لە دڵیاندا هـەبوو لـە بەندایـەتی و خۆشەویـستی و تـرس و ملکەچی ئەوکاتی دەرکەوت، ئەوەی لە دڵی (ابلیس)یش دابوو ئەوکاتی ئاشکرا بـوو لـە خۆبەگـەورەزانی و خیانـەت و حەسـوودی، بۆیـە کرنۆشـی بـۆ ئـادەم نـەبرد و سەرکەشی کرد لە فەرمانەکەی خوای گەورە، بۆیە چووە ڕیزی کافرانەوە.

✓ دەربارەی ئەوەش کە ئەوانەی دۆستی خوان لە مـەکری خـوا دەترسن، ئـەوە شتێکی ئاساییە و دروستە و هیچی تیانیە، چونکە ئەوان کە دەترسن لەبەر گوناه و هەڵەکانیان دەترسن، دەترسن لەوەی نەوەکو خوای گەورە بە هۆی ئەو گوناهانەوە تووشی سەرگەردانیان بکات، ئەوان لە گوناهەکانیان دەترسن و داوای ئومێـدی خـوا دەکەن.

✓ دەربـــارەی ئـــەو ئایەتـــەش کـــە دەفـــــەرمووێ: ﴿أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِۚ﴾ (الأعراف:٩٩)، ئەوە دەربارەی کافر و خراپەکارانە.

مانـای ئایەتەکـە ئاوایـە: کـەس نیـە گونـاه و بـێ فـەرمانی خـوا بکـات لەگـەڵ ئەوەشدا دڵنیا بێت لە مەکری خوا مەگەر ئەو کەسانە نەبێت کە خەسارەت مەنـدن، بەڵام ئەوەی لە خوا دەترسێ خواناسانن نـەوەکو خـوای گـەورە سـزای کارەکانیـان دوا بخات جا ئەوانیش لە خۆبایی بن و لەگەڵ گوناه ڕابێن ئینجا سـزای خوایان بـۆ بێت.

خاڵێکی تریش: ئەوەیە بێ ئاگانە و یادی خوایان لە بیر کردووە، خوای گەورەش فەرامۆشیان دەکات، ئەگەر پشت لە یاد و بەندایەتی ئەو بکەن، جا ئەوکات تووشـی نەهاتی و بەڵا دەبن، مەکری خواش بۆ ئەوان فەرامۆش کردنیانە.

خاڵێکی تریش: خوای گەورە بە هەموو گوناه و تاوانێکیان دەزانێت کەچی ئەوان بە خۆیان نازانن، جا بە جۆرێك مەکری خوایان بۆ دێت کە هەستیشی پێ ناکەن.

خاڵێکی تریش: خوای گـەورە بـەو شـتانە تاقیـان دەکاتـەوە کـە ئـارامی لەسـەر ناگرن، بۆیە پێی بە فەتارەت دەچن، ئەمە مەکری خوایە.

# درەختی ژیـــــان

ســاڵ وەك درەختێـــك وایـــــە، مانگـــەكان ڕەگەكانیـــەتی، ڕۆژەكـــان پـــەل و پۆكانیەتی، كاتەكان گەڵاكانیەتی، هەناسە و نەفەسەكان بەروبومەكەیەتی.

جـا هـەر كەسێك هەناسـە و نەفەسـەكانی لـە بەندایـەتی خـوادا سـەرف بكـات، بێگومان ئەوە بەرووبوومی درەختەكەی چاك و بـە كـەڵك دەبێت، هـەر كەسێكیش نەفەســەكانی لـــە گونــاه و تاوانــدا ســـەرف بكـــات، ئـــەوە بێگومــان بـــەرووبومی درەختەكەی بێ كەڵك دەبێت وەكو گوژاڵك.

%












## درەختی ئیخلاص و یەکتا پەرستی

ئیخلاص و یەکتاپەرستی  درەختێکە لە دڵی مرۆڤدا، ڕەگەکانی کاروکردەوەیـە، بەرووبومەکەشی ژیانێکی کامەران و ئاسوودەیە لـە دنیـا و نیعمـەت و خۆشیـشە لـە دوا ڕۆژدا.

جا کە چۆن بەرووبومی بەهەشت بەردەوام هەیە و نەبڕاوەیە، بە هەمان شێوەش بەرووبومی یەکتاپەرستی و ئیخلاص لە دنیادا بڕانەوەی نیە.

## درەختی شیرک و درۆ و ڕیا

شیرك و درۆ و ڕیا درەختێکە لە دڵی مرۆڤـدا، بەرووبومەکـەی لـە دنیـادا تـرس و غەم و خەفەت و دڵ تەنگی و دڵ ڕەشـیە، بەرووبومەکەشـی لـە دوا ڕۆژدا زەقـووم و سـزایەکی بەردەوامــە، خــوای گــەورە لــە ســووڕەتی (إبــراهیم)دا باســی ئــەو دوو درەختەی کردووە.

# پلەکانی کامەرانی مرۆڤ

کاتێك مرۆڤ دەبێتە کەسێکی کامڵ، ئەو پەیمانەی پێ دەدرێتەوە کە پەروەردگار پێشتر لێی وەرگرتبوو ـ ئەو پەیمانەی کە هێشتا لە پشتی باوکی بووە خوا پێی فەرمووە ئایا ڕازی من پەروەردگارت بم، ئەویش وتیەتی بەڵێ خودایە ڕازیم پەیمانت پێدەدەم ـ .

جا ئەگەر هاتوو بە عەزیمەتەوە وەریگرت ـ کە دینی خوایە ـ بۆ جێبەجێ کردن، ئەوە ژیانی کامەران دەبێت بە شێوەی ئەوانەی هەڵساون بە بردنە سەری پەیمانەکەیان، ئەگەر هاتووش لەکاتی وەرگرتنی پەیمانەکەی دڵی کەوتە لەرز و بە گەورەی زانی و گووتی: من ئامادەم بۆ وەرگرتنی پەیمانی پەروەردگارم، کێ لە من شیاوترە بۆ وەرگرتن و تێگەیشتن و جێبەجێکردنی؟ لە هەمان کاتیش سوور بوو لەسەر پەیمانەکەی و بیرکردنەوە لێی و ناسینی و ئامۆژگاری گەورەکەی، پاشان دەستی کرد بە گوێرایەڵی و ئەنجامدانی ئەوەی تێیدایە، ئەوکات بە چاوی دڵی ئەوەی لە پەیمانەکە دایە بۆی ڕۆشن دەبێتەوە، هیمەتێکی تری بۆ دروست دەبێت، عەزیمەتێکی تری بۆ دروست دەبێت جگە لەو عەزیمەتەی کاتی منداڵی پێش ئەوەی بگاتە ئەو پەیمانە، ئارام گرتنی لەسەر شەرەفی هیمەت بۆ پەیادەبێت و پەردەی تاریکایی دەدڕێنێت بۆ ڕووناکی و یەقین، بە پێی ئارامی و تێکۆشانی بەو فەزڵە دەگات کە خوای گەورە پێی بەخشیوە.

سەرەتای کامەرانی مرۆڤ لەوە دەست پێدەکات کە گوێچکێکی بە ئاگا و ژیری هەبێت، دڵێکی وای هەبێت هەر کاتێ گوێ شتێکی بیست ئەو دڵــە دەرکی بکات، ئەگەر بەم شێوە بوو هەر شتێکی بیست بیری لێ کردەوە، ئەوە ڕاستەقینەی بۆ ڕوون دەبێتەوە، کاتێك دەبینێت زۆربەی خەڵکی لایانداوە لە ڕێگای ڕاست ئەو پەیوەست دەبێت پێیەوەی، لەگەڵ ئەو خەڵکەدا ڕێگای گومڕایی ناگرێتە بەر کە دینی خوایان شکاندووە و وەریان نەگرتووە، یان وەریان گرتووە بەڵام بە بێزاریەوە

نەك بە عەزیمەت و پەرۆشیەوە، وایان نەکردووە بیری لێبکەنەوە و تێی بگەن و کاری پێبکەن و ئامۆژگاریەکانی جێبەجێ بکەن، بەڵکو کاتێ دینداریەکەش دەکەن خووی منداڵی و دینی عادەتی لکاوە پێوەیان، ئەو عادەتەی کە باوك و دایکی خوویان پێوەگرتبوو، بۆیە ئەویش هەر بەو شێوە دینداری دەکات لەسەر عادەتی پێشینانی خۆی، عادەتیش رێی پێنادا کە تێ بگات لە دین و کاری پێ بکات.

ئەگەر دینداریش بکات ئەوە دەڕوانێتە داب و نەریتی خزم و کەس و هاوڕێ و دراوسێ و خەڵکی شارەکەی، ئەگەر لە سنووری داب ونەریتی ئەواندا دەرچوو، ئەوە هیچ بیری لێ ناکاتەوە و خۆی پێوە خەریك ناکات، بەڵکو دەگەڕێتەوە سەر داب و نەریتی ئەوان بە دینی عادەتی ڕازی دەبێت.

جا کە شەیتان دەبینێ ئەمە هیمەت و عەزیمەت و ڕەوشتی ئەو مرۆڤەیە، ئەوە تووشی دەمارگیری و تیرەگەری دەکات بۆ پێشینان و باب و باپیرانی، شەیتان وای بۆ دەڕازێنێتەوە کە تەنها ئەو داب ونەریت و تیرەگەریەی ئەو ڕاستە و ئەوانی تر کە پێچەوانەی ئەوییە هەمووی پوچەڵە و نا ڕاستە، شەیتان بە جۆرێك سەرگەردانی دەکات کە هیدایەت و سەرفرازی لەسەر وێنەی گومڕایی پیشان دەدات، گومڕایشی لەسەر وێنەی هیدایەت و سەرفرازی پیشان دەدات، ئەمەش بە هۆی ئەم نەفامی و نەزانی تیرەگەریەوەیە تووشی هاتووە، بە جۆرێك سەرگەردان دەبێت کە ڕازیە لەگەڵ قەوم و عەشیرەتی خۆی بێت، چی بۆ عەشیرەتەکەی هەیە بۆ ئەویش بێت، چیانیش لەسەرە با لەسەر ئەویش بێت، بەم شێوە ڕێگای هیدایەتی لێ وون دەبێت، خوای گەورەش فەرامۆشی دەکات، چونکە ئەو هەر هیدایەتێکی بۆ بێت پێچەوانەی گەل و عەشیرەتەکەی بێت ڕەتی دەکاتەوە.

بەڵام ئەگەر هیمەت و عەزیمەتی بە هێز و بەرز و بڵند بوو، ئەوە ئەو دینی خوا وەردەگرێت و بیری لێ دەکاتەوە و کاری پێ دەکات، دەزانێت خاوەنی ئەو دینە وەکو کەس نیە، بۆیە هەوڵدەدات بیناسێ و ئاشنای سیفات و ناو و کار و بڕیارەکانی بێت، ئەوکات لە ڕێگای ئەو دینەوە بۆی ڕۆشن دەبێتەوە کە بەڕاستی خوای گەورە باڵادەستە، دەوڵەمەندە و پێویستی بە کەس نیە و هەموو شتێك

پێویـستیان بـەوە، دەبینـێ و دەبیـستێ، فـەرمان دەدات و قەدەغـەش دەکـات، پێغەمبەران دەنێرێت بۆ هەموو گەلێك بە ووتەی خۆی، ئەو ووتـەی خـۆی حـەز بکـا بە کێی بوێت دەیبیستێنێ، دادپەروەرە، پاداشت دەدات و سزا دەدات، ئـارامگرە و لێبووردەیە و سوپاسکراوە و بەخشندەیە و چاکەکارە، خـاوەنی هـەموو سـیفاتێکی بەرز و بڵندە، دوورە لە هەموو عەیب و کەم و کورتی یەك، وێنەشی نیە.

ئەگـەر ئـەو مرۆڤـە بـەو شـێوەبوو ئـەوە حیکمـەتی خـوای لـە بـەڕێوەبردنی نیـشتیمانەکەی بـەدی دەکـات، کـە چـۆن بـە ئەنـدازەگیری و ڕێـك و پێکـی هـەڵی دەسوورێنێت، ئەمانەی بۆ دەردەکەوێت لـە (العقـل) و (الـشرع) و (الفطـرة)وە، بـەو شێوە تێ دەگات لەبارەی خـواوە کـە خـودا خـۆی لـە قورئانەکەیـدا وەسـفی خـۆی کـردووە و ڕاسـتەقینەی ناوەکـانی خـۆی ڕۆشـن کردۆتـەوە، هـەر بـەم سیفاتانەشـە بەنـدە خـودا دەناسـێت، تـا ئـەوەی عـەقڵیش دان دەهێنێـت، وە فـیترەش دان دەهێنێت.

مرۆڤ ئەگەر بە دڵ سیفاتە بەرز و بڵندەکانی خاوەنی دینەکـەی خـۆی بـۆ ڕۆشـن بۆوە، ئەوە سیفاتەکانی دڵی ڕۆشن دەکاتەوە، ئاوای لێدێ وەکـو ئـەوە دەبێـت کـە بیبینێت، کە دەبینێ ئەو سیفاتانە پەیوەستن بە دروست کراوەکـان و فەرمانـەکانی خـودا، ئـەوانیش پەیوەسـتن بـەوەوە، شـوێنەواریان هەیـە لـە جیهـانی (الحسی) و جیهانی (الروحی)، دەبینێت ئەو سیفاتانە ڕۆڵ دەبینن لە بوونەوەردا، بە چاوی دڵی دادپـەروەری و فـەزڵ و ڕەحمـەتی خـوای گـەورەی بـۆ ڕۆشـن دەبێتـەوە، ئـەوکات ئیمانی بەوانە ڕۆشن دەبێتەوە کە خوای گەورە بە توانا و دەسەڵاتە، دادپـەروەر و بە حیکمەتە، بەرزە لەسەر هەموو دروسـت کراوەکـانی، بـە زانـستی خـۆی دەورەی هـەموو شـتێکی داوە و لەگـەڵ هـەموو شـتێکە، گـەورە و بـە شـکۆیە، خـاوەنی (کبریـاء)یـەو تۆڵـە سـەنە، لەگـەڵ ئەوەشـدا بـە ڕەحـم و چـاکە و بەخـشندەیە و لێبووردەیە و بە حیلمە.

# باسی حاڵی ڕۆح و لاشەی مرۆڤ

لاشـــەی مـــرۆڤ لـــە زەوی دروســـتکراوە، ڕۆحیـــشی لـــە مەلـــەکوتی ئاسمـــان دروستکراوە، ئەم دووانەش بەراووردکراوە.

جا ئەگەر هاتوو مرۆڤ لاشەی برسی بکات و خەو زڕی بکات و بەردەوام خـەریکی نەبێت، ئەوە ڕۆحی لە تیف و ئارامگر دەبێت و تامەزرۆی ئەو جیهانە بەرزەی خـۆی دەبێت کە لێ ی دروستکراوە.

بەڵام ئەگەر هاتوو مرۆڤ لاشەی خۆی تێر ئارەزووات بکات و تێر خـەوی بکـات و بەردەوام خەریکی بێت، ئەوە لاشەی لەو شوێنە دەمێنێتەوە کە لێی دروستکراوە، بۆیە لاشەش ڕۆح بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و ڕۆح بەند دەکات، جـا ئـەوکات ئەگـەر ڕۆح هـۆگر نـە بوویێـت بـەو بەندیخانەیـەوە، ئـەوە لـە ئـێش و ئـازاری دابڕانـی لـەو جیهانەی لێی دروستکراوە هانا و هاواری لێ هەڵدەستێ وەك ئـەو کەسـەی کـە سـزا دەدرێت هانا و هاواری لێ هەڵدەستێت.

پوختەی قسان ئەوەیە: هەر کاتێك لاشەی سووك بوو، ڕۆحیشی لەتیف دەبێت و ڕوودەکاتە جیهانی بـەرز و بڵنـدی خـۆی، بـەڵام ئەگـەر لاشـەی قـورس بـوو و ڕووی کردە ئارەزووات، ڕۆحیـشی گـران دەبـێ و دادەبـەزێ لـە جیهـانی بـەرزی خـۆی بـۆ جیهانی نزمی زەوی، بۆ نموونە: تۆ پیاوی وا دەبینی کە بە لاشە لەلای تۆیە کەچـی بە ڕۆح لەلای خوا و مەلـەکوتی ئاسمانـە، دەبینـی بـە لاشـە لەسـەر جێگـای خۆیدا خەوتووە، کەچی بە ڕۆح لەلای (سدرة المنتهی)یە و لە دەوری عەرش دەسوڕێت.

کەسێکی تریش دەبینی بەردەوام خـەریکی تێرکردنـی لاشـەیەتی، بـە لاشـە لای تۆیە کەچی ڕۆحی لە نزمی دایە و خەیاڵی لە دەوری شتی خراپ دەسووڕێتەوە.

ئەوەش بـزانن هـەر کاتێـك ڕۆح لـە لاشـەی مـرۆڤ جیادەبێتـەوە، یان پـەیوەنـدی دەکات بە شوێنە باشەکەی خـۆی، یان پـەیوەنـدی دەکـات بـە شـوێنە خراپەکـەی

خۆی، جا شوێنە باشەکەی چاوگەشی و نیعمەت و ئاسوودەی و خۆشی و شادی و ژیانی کامەرانی پێوەبەندە، بەڵام شوێنە خراپەکەی غەم و خەفەت و دڵ تەنگی و غەمگینی و ژیان ناخۆشی و (مَعِيشَةً ضَنكًا)ی پێوە بەندە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾ (طه: ١٢٤)، واتە: هەر کەسێك پشت بکات لە زیکری من ـ کە قورئانە ـ ئەوا ژیانێکی تەنگی بۆ هەیە.

زیکری خوا لێرەدا، ووتەی خوایە کە نازڵی کردۆتە سەر پێغەمبەرەکەی، پشت تێکردنیشی واتە: بیر لێ نەکردنەوە و کارپێ نەکردنیەتی، (المعیشة الضنك)یش (ابن مسعود)و(أبو هريرة)و(ابو سعيد الخدري)و(ابن عباس) دەفەرموویانە: (انها عذاب القبر) واتە: ژیانێکی تەنگی سزای ناو گۆڕە.

بنچینەی ووشەی (ضَنك) لە زمانی عەرەبیدا: بە مانای (الضيق)تەنگی، و (الشدة) توندی، دێت، هەر شتێکیش تەنگ بێت ئەوە (ضَنك)ە، هەر وەك دەگووترێ: (منزل ضنك)واتە: خانوویەکی تەنگە.. (عیش الضَنك)واتە: ژیانێکی تەنگە.. کەوابوو: (المعیشة الضَنك) بۆیە سەر هەڵدەدات لە تێرکردنی نەفس و لاشە بە هەوا و ئارەزووات.

بەڵێ: هەر کاتێك نەفس تێر بکرێت بە هەوا و ئارەزووات، ئەوە دڵ تەنگ دەکات تاکو وای لێدێ دەبێتە (معیشة ضَنك)، هەر کاتێکیش نەفسی بگرێتەوە لە هەوا و ئارەزووات، ئەوە دڵ فراوان دەبێت تاکو وای لێدێ کە دڵ فراوان و ئاسوودە دەبێت.

جا خۆگرتنەوە لە دنیا و تەقواکاری فراوانیە بۆ بەرزەخ و دوا ڕۆژ، ڕابواردنیش لە دنیادا بە هەوا و ئارەزووی خۆی تەنگیە بۆ بەرزەخ و دوا ڕۆژ، تۆش بزانە کام لەم دوو ژیانە چاکتر و خۆشتر و بەردەوامترە ئەویان هەڵبژێرە.

کەوابوو: ئەی مرۆڤ بە سایەی لاشەتەوە ڕۆحت بەختەوەر بکە، نەکەی ڕۆحت ئەزیەت بدەی بۆ بەختەوەری لاشەت، چونکە نیعمەتی ڕۆح گەورەتر و

بەردەوامترە، نیعمەتی لاشەش کورتر و کەمترە.

کابرای خواناس بە خەڵکی ناڵێت واز لـە دنیـا بێـنن، چـونکە توانـای وازهێنـانی دنیایان نیە، بەڵکو پێیان دەڵێت واز لە گوناھ بێنن و لە دنیاش بگوزەرێنن، چـونکە وازهێنان لە دنیا (فضیلة)چاکـە، بەڵام وازهێنان لە گوناھ (فریضة) واجبە، چۆن بـە کەسێك دەڵێی: چاکــە ئەنجام بدات لە کاتێکدا واجباتی ئەنجام نەداوە.

جا ئەگەر هاتوو وازهێنانی گوناهیان لەلا گران بوو، تێبکۆشە بۆ ئـەوەی خوایـان لەلا خۆشەویست بکەی بە باسکردنی دروسـت کراوەکـانی و نیعمـەت و چـاکەکانی و سیفاتە بەرز و بڵندەکانی، چونکە دڵ لەسەر خۆشەویستی خوا بـەدیهێنراوە، ئینجـا ئەگەر دڵی پەیوەست بوو بە خۆشەویستی خوا، ئـەوە وازهێنـان و دوورکەوتنـەوەی لە گوناھ لا ئاسان دەبێت.

(یحیی)ی کوڕی (معاذ) دەفەرمووێ: (طلب العاقل للدنیا خیر من ترك الجاهل لها) واتـە: داوای مرۆڤی عاقل بۆ دنیا، زۆر چاکترە لە وازهێنانی مرۆڤی نەفام لە دنیا.

سەیر لەو کەسە دانیە کە ملکەچی خوا دەکـات لـە کاتێکدا لەشـی سـاغ بێـت و کاتی هەبێت و لە فەراحی دابێت ، بەڵکو سەیر لـەو کەسـە دایـە کـە نـەخۆش و بـێ هێزو سەرقاڵە، کەچـی هـەر ملکەچـی خـوا ئـەکات و سـڵ ناکـات و دڵـی بـە خـواوە بەندە.

# ناسینی خوای گەورە دوو جۆرە

یەکەم: ناسینی خوا لەوەی کە داندەهێنێت بە وجودی خودا، ئەم جۆرەیان هەموو خەڵکی تیایدا بەژدارن چاك و خراپ و گوێڕایەڵ و گوناهبار.

دووەم: ناسینێکە کە حەیا بە مرۆڤ دەبەخشێ، خوا لەلای مرۆڤ خۆشەویست دەکات، دڵی پەیوەست دەکات بە خوا، تامەزرۆی گەیشتن بە خوای دەکات، لێی دەترسێ، دەگەڕێتەوە لای، بە خوا هۆگر دەبێت، لە دەست خەڵکی هەڵدێ بۆ لای خوا، ئەمەش ئەو ناسینە تایبەتیەیە کە لەسەر زمانی خەڵکی باوە، جیاوازی پلەی خەڵکیش لەم ناسینەدا کەس ناتوانێت سەرژمێری بکات جگە لە خوا نەبێت، خوای گەورە ناسینی خۆی بۆ دڵیان ڕۆشن کردۆتەوە، هەر کەسە بە پلەی خۆی.

بۆیە دەبینین زاناترین کەس کە پێغەمبەرﷺ بە خوا دەفەرمووێ: ((لا أُحْصِي ثناءً عليكَ، أنتَ كما أثنيت على نفسك))[1]، واتە: ناتوانم ستایشی تۆ بکەم بەو جۆرەی کە تۆ خۆت ستایشی خۆتت کردووە.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ڕۆژی قیامەت فێری ستایش و سوپاسێکی وام دەکەن بە جۆرێك کە ئێستا نایزانم.

بۆ گەیشتن بەم خواناسیە دوو دەرگای فراوان هەیە:

دەرگای یەکەم: بیرکردنەوە و ووردبوونەوەیە لە ئایەتەکانی قورئان، تێگەیشتن بەو شێوە دروستەی کە خوا و پێغەمبەرﷺ هێناویانە.

دەرگای دووەم: ووردبوونەوە و بیرکردنەوەیە لە دروستکراوەکانی خوا، تێرامانە لە شوێنەواری حیکمەت و دەسەڵات و لوتف و چاکە و دادپەروەری خوا لەسەر

---

(١) صحيح: رواه مسلم (٤٨٦)، والنسائي (٢٢٢/٢)، و ابو داود (٨٧٩)، والترمذي (٣٤٩١)، و احمد في ((المسند)) (٥٨/٦و٢٠١)، وابن ماجه (٣٨٤٢).

دروستکراوەکانی.

کۆی ئەوانـە: تێگەیشتنە لە مانای ناوە جوانەکانی خـوای گـەورە و شـکۆداری و بـێ کـەم و کـوڕی و بـە تـاك زانینـی و پەیوەسـت بـوون بـە دروسـتکراوەکانی و فەرمانەکانیەتی.

گەر وابـوو شـارەزا دەبێـت لـە فەرمانـەکانی و قەدەغـەکراوەکانی خـوا، شـارەزا دەبێـت لـە (القـضاء و القـدر)ی خـوا، شـارەزا دەبێـت لـە نـاو و سـیفاتەکانی خـوا، شارەزا دەبێت لە بڕیاری (الدینی الشرع) و بڕیاری (الكوني القدري) خوا.

﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ﴾(الحدیـــد:٢١)، واتـــــە: ئەوە فەزڵی خوایە دەیبەخشێ بەهەر کەسێك کە خۆی حەز بکات، بەڕاسـتی خـوای گەورە خاوەنی فەزڵی گەورەیە.

# پارە چوار جۆری هەیە

١. پارەیەك بە حەڵاڵی و بە گوێڕایەڵی خوا پەیدا کراوە، لە پێناوی خواش بە حەڵاڵی سەرف دەکرێت، ئەوە چاکترین پارەیە بۆ مرۆڤ.

٢. پارەیەك بە حەرام و بێ فەرمانی خوا پەیدا کراوە، لە گوناهیش سەرف دەکرێت، ئەوە خراپترین پارەیە بۆ مرۆڤ.

٣. پارەیەك بە ئەزیەت دانی موسڵمانان پەیداکراوە، لە ئەزیەت دانی موسڵمانانیشدا سەرف دەکرێ، ئەوەش خراپترین پارەیە بۆ مرۆڤ.

٤. پارەیەك بە مباح پەیداکراوە، لە خۆشیەکی مباحیشدا سەرف دەکرێت، ئەوە نەهیچی بۆ هەیە و نە هیچی لەسەرە.

ئا ئەمە بنچینەی جۆرەکانی پارەیە، لەم چوار جۆرە چەند لقێکی تریشی لێ دەبێتەوە:

- ✓ پارەیەك بە حەڵاڵی و دروستی پەیدا کراوە، کەچی لە حەرام و نادروستی سەرف دەکرێت.
- ✓ پارەیەك بە حەرامی پەیدا کراوە، کەچی لە حەڵاڵ سەرف دەکرێت، ئەوە سەرف کردنی لە حەق کەفارەتەکەیەتی.
- ✓ پارەیەك پەیدا کراوە، بەڵام گومانی تیایە کە ئایا حەڵاڵە یان حەرامە، کەفارەتەکەشی ئەوەیە لە بەندایەتی خوا سەرف بکرێت.

جا چۆن سەرفکردنی پارە پاداشت و سزا و مەدح و زەمی لەسەرە، بە هەمان شێوەش پەیداکردنیشی پاداشت و سزا و مەدح و زەمی لەسەرە، هەروەها پرسیاری لێ دەکرێ لە کوێی پەیاکردووە و لە چی سەرف کردووە.

# دڵ نەوایی کردنی ئیمانداران

یارمەتی دان و دڵ نەوایی کردنی ئیمانـداران چەند جۆریکی هەیە لەوانـــە، بە سەروەت و سامان دڵ نەوایی ئیمانداران دەکرێت، بە خانەوادە دڵ نەوایی دەکرێت، بە لاشە و خزمەت کردن دڵ نەوایی دەکرێت، بە ئامۆژگاری دڵ نەوایی دەکرێت، بە دووعا و داوای لێبووردن کردن لە خوا دڵ نەوایی دەکرێت، بە دڵ دانەوە و بەژداری خەم کردن دڵ نەوایی دەکرێت.

جا یارمەتی دان و دڵ نەوایی کرن بـە پێـی ئیمـان لـە مـرۆڤ هەڵـدەقوڵێت، هـەر کاتێك مرۆڤ ئیمانی بێ هێز بوو ئەویش بێ هێز دەبێت، بەڵام ئەگـەر ئیمـان بـە هێـز بوو ئەویش بە هێز دەبێت.

پێغەمبەرﷺ چاکترین کەس بووە کـە بـە هـەموو جۆرێـك یارمـەت و دڵ نـەوایی هـاوەڵانی کـردووە، یارمـەتی دانـی خـەڵکیش بـەپێی شـوێنکەوتنی پێغەمبـەرﷺ دەبێت.

ڕۆژێك هێندێ لە هاورێکانی (بشر الحافي) لە کەشێکی زۆر سـەرما و سـاردا هاتنـە خزمەتی، کاتێك چوونە ژوورەوە دەبینن وا جلەکانی لەبـەر کردۆتـەوە و لـە سـەرما هەڵدەلەرزێ، ووتیان: ئەوە چیە ئەی (ابا نصر)؟

فەرمووی: سەرما و سۆڵی هـەژارەکانم بیرکەوتـەوە، هیچیشم نـەبوو یارمـەتیان بدەم و دڵ نەواییان پێ بکەم، جا بۆیە حەزم کرد بـە خـۆ سـەرما کـردن یارمـەتیان بدەم و بەژداری سەرماکەیان بکـــەم.

# وێـستگەی ئیمان

شـارەزا نـەبوون بـە بەربەسـتەکانی ڕێگـای گەیشتن بـە ڕەزامەنـدی خـوا مـرۆڤ تووشی ماندووبونێکی زۆر دەکات و سوودێکی کەمیشی پێ دەگەیەنێت، چونکە ئەو مرۆڤە ناشارەزایە دەبینی خۆی بە سوونەتەکان خـەریك دەکـات کەچـی فـەرزەکان دەفەوتێنێت، یان کارێك بـە لاشـە ئـەنجام دەدات کەچـی دڵـی لەگـەڵی دانیـە، یـان کارێك بە دڵ و لاشەوە ئەنجام دەدات بەڵام لەسەر ڕاڕەوی شەرع نیە، یان دەیەوێت کارێك بکات کەچی تێبینی مەبەستەکەی ناکات، یان کارێك دەکات خۆی ناپارێزێت لە خراپەکانی لە کاتی ئەنجامدانی، یان بێ ئاگایە لە هێندێ کـار کـە دەبێـت خـۆی ڕۆڵی تیا ببینێت، یان هێندێ کار عوزری تیا بـەدی نـاکرێ کەچـی ئـەو عـوزری تیـا دێنێتەوە، یان هێندێ کار هەیە بە چـاکی ئـەنجامی نـەداوە، کەچـی وادەزانێت بـە چاکی ئەنجامی داوە، ئا ئەمانە هەر هـەمووی بەرووبوومەکـەی کـەم دەکـات لەگـەڵ ئەوەشدا زۆر ماندووش دەبێت لە ئەنجامدانی.

ئەگـەر مـرۆڤ ویـستی ڕێگـا بگرێتەبـەر بـەرەو ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە، ئـەوە چـەندین بەربەسـت دێتـە ڕێگـای، سـەرەتا بـە ئـارەزووات و پلەوپایـە و خۆشـی و ئافرەت و جل و بەرگ تاقی دەکرێتـەوە، ئەگـەر بەوانـە ڕازی بـوو و ڕووی تێکـردن، ئەوە لە گەشتەکەی دادەپچڕێت، بەڵام ئەگـەر پێیـان ڕازی نـەبوو پـشتی تێکـردن و ڕاستگۆ بوو لە داواکردنی ڕەزامەندی خودا، ئەوە تاقی دەکرێتەوە بە شـوێنکەوتەی زۆر، کە دەستی ماچ دەکەن و خەڵکێکی زۆر دادەنیشن لـە مەجلیسی، داوای دوعـا وبەرەکەتی لێ دەکەن و چەندین شـتی تـری لـەم جـۆرە، ئەگـەر ڕازی بـوو بەوانـە و پێیان بە فیتنە چوو، ئەوە دادەبڕێت لە گەشتەکەی بەرەو ڕەزامەندی خوا، چـونکە ئەو ئەوەی دەویست، بەڵام ئەگەر بەوانە هەڵنەخەڵەتا و پـشتی تێکـرن و بـەردەوام بوو لە گەشتەکەی، ئەوکات بە کەرامات تاقی دەکرێتەوە، ئەگـەر بەوانـە هەڵخەڵـەتا

ئـەوە لـە خـوا دەپـچڕێت، چـونکە ئـەو ئـەوەی دەویـست، بـەڵام ئەگـەر بەوانـە هەڵنەخەڵەتا، ئەوە تاقی دەکرێتەوە بە نەکردنی گوناه و دوورکەوتنـەوە لـە دنیـا و عیـزەت، ئەگـەر بەوانـە هەڵخەڵـەتا ئـەوە لـە گەشـتەکەی دەپـچڕێت، بـەڵام ئەگـەر بەوانەش هەڵنەخەڵـەتا و بـەردەوام بـوو لـە گەشـتەکەی، بـە جۆرێك کـە خـوا چـی پێخۆش بێت ئەنجامی بدا، جا پێی ماندوو بێت یان ماندوو نەبێت، خـۆش بێـت یـان نـاخۆش بێـت، بـە ئـارەزووی خـۆی هـیچ هەڵنابـژێرێت مەگـەر ئـەوە نـەبێت، کـە سەیدەکەی بۆی هەڵدەبژێرێت، چی فەرمان پێبکـات بـە پێـی توانـا ئـەنجامی دەدا، ڕەزامەندی خوای پێش هەموو شتێك خستووە لە نەفس و ئارەزووات.

ئا ئەوە ئەو بەندەیە کە گەشتەکەی تەواو دەکات و بە ڕەزامەندی خوا دەگـات، هیچ شتێکیش لە گەشتەکەی ناپچڕێنێت.

# نیعمەتەکانی خودا

نیعمەت و بەخششەکانی خودا سێ جۆرە:

١. نیعمەتێك کە بەندە چەنگی کەوتووە و پێی دەزانێت.

٢. نیعمەتێك کە بەندە چەنگی نەکەوتووە، بەڵام ئومێدی بۆ دەکات.

٣. نیعمەتێك کە بەندە چەنگی کەوتووە، بەڵام هەستی پێ ناکات.

ئەگەر خوای گەورە بیەوێت نیعمەتی خۆی بڕژێنێت بەسەر بەندەکەی، ئەوە ئەو نیعمەتەی چەنگی کەوتووە پێی دەناسێنێ، واشی لێدەکات شوکرانە بژێری بکات هەتا سەرگەردان نەبێت، وە سەرفرازی دەکات بۆ کارانێك ئەو نیعمەتەی پێ چەنگ کەوێت کە چاوەڕەیی دەکات، ئەو ڕێگایانەی بۆ ڕۆشن دەکاتەوە کە دەبن بە بەربەست بۆ ئەو نیعمەتە چاوەڕوان کراوە، سەرفرازی دەکات بۆ خۆ لێ پاراستنی، ئەو نیعمەتەشی پێ دەناسێنێت کە چەنگی کەوتووە، بەڵام هەستی پێ ناکات.

دەگێڕنــەوە دەڵــێن: کابرایــەکی دەشــتەکی چــووە خزمــەت پێــشەوای ئیمانداران(هارون الرشید)، (هارون الرشید) پـێی فـەرموو: خـودا ئـەو نیعمەتـەت لەسـەر بـسەپێنێت کـە خـوا پێـی داویـت بـە بـەردەوامی شـوکرانە بـژێری، ئـەو نیعمەتەشـت بـۆ فەراهـەم بهێنێـت کـە بـە گومـانی چـاکت بـە خـوا و بەندایـەتی بەردەوامت ئومێدی بۆ دەکەی، بەو نیعمەتەت بناسێنێت کە چەنگت کەوتووە بەڵام هەستی پێناکەیت تاکو شوکرانە بژێری بکەیت، کابرایەکە ئەمەی زۆر پێ سەیر بوو، گووتی: چەند جوان بوو دابەش کردنەکەی.

# ئەو خەتەرەی بە دڵت دادێت؟

سەرچاوەی هەموو زانست و کارێك لە خەتـەرە[1] و بیرکردنـەوە هەڵدەقوڵێت، خەتەرە و بیرکردنەوەش دەبێت بە بۆچوون، بۆچوونیش سەردەکێشێ بۆ ویست و ئیرادە، ویست و ئیرادەش دەبێت بە کاروکردەوە، دووبارەبوونـەوەی کارەکەش دەبێت بە عادەت، جا چاککردنی ئەوانـە پەیوەستە بە چاککردنی خەتـەرە و بیرەوە، بە فەساد چوون و تێك چوونی پەیوەستە بە خەتەرە و بیرەوە.

چاککردنی خەتەرە و بیریش بەوە دەکرێت ڕەچاوی ئەو شتانە بکات کە بەرز دەبێتەوە بۆ خزمەتی خوا، بزانێت خوا پێی ڕازیە و پێی خۆشە یان نا، چونکە هەر چ چاکە و هیدایەت و سەرفرازی و پاراستنێك هەبێت ئەوە تەنها لە خوای گەورەوەیە، مرۆڤیش بەهرەوەر دەبێت لە خێروبێری خودا، بە پێی پەیوەست بوون و جێگیر بوونی خەتەرە و بیریەوە بە نیعمەت و یەکتاپەرستی و خواناسی و بەندایەتی و هەست کردن بە چاودێری و مراقەبەی و ئاگاداربوونی خوا بە هەموو چرپە و کارەکانی، ئا ئەوکات شەرم دەکات خوای گەورە بەو خەتـەرە و بیرکردنەوانەی بزانێت، بۆیە پارێزگاری دەکات و نەفسی خۆی سەرکوت دەکات، ئەگەر بەم شێوەی کرد ئەوە خوای گەورە ڕێزی لێ دەنێ و هەڵی دەبژێرێت و دەیپارێزێت، بە پێی ئەوانەش دووری دەکاتەوە لە خەتـەرە و بیر و کاری خراپ و پیس و گەندەڵ.

بزانە مرۆڤ چاکترین دروستکراوی خوای گەورەیە، ئەگەر لە خوا نزیك بێتەوە و پەیوەست بێت بە فەرمانەکانی و قەدەغەکراوەکانی و کارەکانی لە ڕەزامەندی خوا

---

(١) خەتەرە: بەو شتانە دەگوترێ کە بە دڵ دادێت.

بێـت و خـوا پـێش هـەموو هـەوا و ئـارەزوواتی بێخێـت، بـەڵام مـرۆڤ خـراپترین دروستکراوە، ئەگەر دوور بێت لە خـوا و دڵـی نـەجووڵێت بـۆ ئـەوەی لـە خـوا نزیـك بێتەوە و پەیوەست نەبێت بە بەندایەتی و ڕەزامەندی خودا.

کەوابوو: هەر کاتێك مرۆڤ نزیکی خـوای هەڵبـژاردو خوای گـەورەی پـێش هـەواو ئارەزوواتی خۆی خست، ئەوە دڵ وعەقڵ وئیمانی باڵادەست دەبێت بەسەر نەفس و ئارەزووات وشەیتانی، سەرفرازی وهیدایەتی باڵادەست دەبێت بەسـەر سـەرگەردانی و هەوا و هەوەسی، بەڵام ئەگەر دووری لـە خـوای هەڵبـژارد، ئـەوە نـەفس و هـەوا و ئارەزووات و شەیتانی باڵادەست دەبێت بەسەر عەقڵ و دڵ و سەرفرازی.

چاك بزانە: خەتەرە و وەسوەسە سەر دەکێشێت بـۆ بیرکردنـەوە، بیکردنـەوەش سەردەکێشێت بۆ یادکردنەوە، یادکردنەوەش سەردەکێـشێت بـۆ ئـیرادە، ئـیرادەش سەر دەکێشێت بۆکاری ئەندامەکانی لاشە، ئەوکات ئەو کارەش باڵادەست دەبێـت و دەبێـت بـە عـادەت، جـا لـە سـەرەتاوە چـاککردنی خەتـەرە ئاسـانە، بـەڵام کـە پێڕاگەیشت و تەواو بوو چاککردنی زۆر ئاستەمە.

ئەوەش بزانـە بە هیچ شێوەیەك مرۆڤ ئەوەی پێ نەدراوە کە ئەو خەتەرانەی بـە دڵی دادێت لە بنچینەوە ڕیشەکێـشی و بنـبڕی بکـات و هیـچی لێ نـەهێڵێت، چونکـە ئەو خەتەرە و وەسوەسـانە وەکـو هەناسـەی مرۆڤەکـە وایـە بـەردەوام هێرشـی بـۆ دەهێنن، بەڵام لێرەدا ئەگەر مرۆڤ ئیمان و عەقڵی بە هێزبوو، ئەو خەتەرە چـاکانەی بـە دڵـی دادێـت هەڵیدبـژێرێت و پـێ ڕازی دەبـێ و هـۆگری دەبێـت، ئـەو خەتـەرە خراپانەشی بە دڵی دادێت، پێ ناخۆشە و پشتی تێدەکات و لێی دوور دەکەوێتەوە، هەر وەکو هاوەڵان بە پێغەمبەریانﷺ فـەرموو: ئەی پێغەمبەری خـواﷺ هەریـەك لە ئێمە جاری وا هەیە هەست بە شتی وا دەکات لـە نەفـسی خـۆی ئەگـەر بـە ئـاگر بسوتێنرێت تاکو دەبێت بە خەڵوز، ئەوە زۆر پێی خۆشترە نەك ئـەو خەتەرەیە بـە دڵی داهاتووە دەرببڕێت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ئایـا هەسـت بـەوە دەکـەن؟))[١]

هاوەڵان ووتیان: بەڵێ، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ((ئا ئەمە نیشانەی ئیمانە))[1].

لێرەدا کە پێغەمبەرﷺفەرمووی: ((ئا ئەمە نیشانەی ئیمانە))، ئەوە دوو ڕاڤـەی بۆ کراوە:

یەکەم: وەرنەگرتن و ڕەتکردنەوەی وپێ نـاخۆش بـوونی ئـەم خەتەرەیـە، ئـەوە خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئیمانە.

دووەم: کـە شـەیتان ئـەو خەتەرانـە بـە دڵـی ئـەو مرۆڤـە دادەهێنێـت، ئـەوەش نیشانەی ئیمانە، چونکە ـ دیارە ئەو مرۆڤە ئیمـانی لـە دڵدایەـ بۆیـە شـەیتان ئـەو خەتەرانە دەخاتە ناو دڵی تاکو ئیمانەکەی لەکەداربکات یان لایببات.

بەڵێ: خـوای گـەورەش نەفـسی مرۆڤـی دروسـتکردووە وەك بـاراش وایـە، چـۆن باراش نابێ بە چۆڵی ئیش بکات بەڵکو هەر دەبێت شتێکی تێبکرێت تاکو بیهاڕێـت، باراشیش ئەگەر گەنمی تێبکرێت دەیهاڕێت، ئەگەر خۆڵ یـان چـەوی تێبکرێـت هـەر دەیهاڕێـت، بـە هـەمان شـێوەش ئـەو خەتـەرە و خەیاڵاتانـەی کـە لـە دڵـی مرۆڤـدا دەسوڕێتەوە. وەکو ئەو گەنمە وایـە کـە دەکرێتـە نـاو ئاشـەکە، چـونکە ئـەو ئاشـە هەرگیز بە چۆڵی کارناکات، بەڵکو هەر دەبێت شتێکی تێبکرێت تا بیهاڕێت.

هێندێ کەس ئاشەکەیان گەنمی تێدەکرێت و گەنم دەهاڕێـت، بۆیـە ئـاردێکی بـۆ دەردەچـێت کـە بـۆ خـۆی و خـەڵکیش سـوودی لێ دەبیـنن، بـەڵام زۆربـەی خـەڵکی ئاشەکانیان یان قوم یان چەو یان کا دەهاڕێت، جا کە کاتی ئەوە دادێت کە بیکـات بە هەویر و بیکات بە نان ئەوە ڕاستەقینەی ئاردەکەی بۆ ڕۆشن دەبێتەوە.

ئەگەر ئەو خەتەرە خراپانەی بە دڵت دادێت دوورت کردەوە لە خۆت، ئـەوە ئـەو شتانەی بە دوایـدا دێـن بـۆ خـۆی نادینێـت، بـەڵام ئەگـەر ڕووت تێکـرد و وەرتگـرت خەتەرەکـە دەبێـت بـە فیکـر، فیکـریش لـە خزمـەتی ئـیرادە دا دەبێـت، ئـیرادە و

---

(١) صحيح: رواه مسلم (١٣٢)، و ابو داود (٥١١١)، و احمد في ((المسند)) (٤٤١/٢).

فیکریش لە خزمەتی ئەندامەکاندا دەبن، بەڵام ئەگەر ئەوە نەکرا ڕوودەکەنە دڵ تاکو بە هەوا و ئارەزووات لە خشتەی بەرن، ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە کە چاکردنی فیکر ئاسانترە لە چاکردنی ئیرادە، چاکردنی ئیرادەش ئاسانترە لە چاکردنی کاروکردەوە، فریاکەوتنی کاروکردەوە ئاسانترە لە بنبڕکردنی داب و نەریت.

چاکترین چارەسەریش بۆ ئەو دەردە، ئەوەیە کە خۆت بە شتێك سەرقاڵ بکەی کە پەیوەندی بە تۆوە هەبێت، نەك خۆت بە شتێك سەرقاڵ بکەی پەیوەندی بە تۆوە نەبێت، چونکە بیرکردنەوە لە شتێك کە پەیوەندی بە تۆوە نیە دەرگای هەموو خراپەیەکت لێ دەکاتەوە.

هەر کەسێك بیر لە شتێك بکاتەوە پەیوەندی بەو نەبێت، ئەو کات ئەو شتەی پەیوەندی بەویەوە هەیە لە دەستی دەچێت، سەرقاڵ دەبێت بە شتێك کە سوودی بۆ ئەو نیە، بەرانبەر بە شتێك کە سوودی بۆ ئەو هەیە.

کەوابوو: خەتەرە و بیرکردنەوە و ئیرادە و هیمەت شیاوترین شتن کە مرۆڤ خۆی سەرقاڵ بکات بە چاککردنیان، چونکە ئەوانە ئەگەر خراپ بوون لە خوا دوورت دەخەنەوە، ئەگەر باشیش بن لە خوا نزیکت دەخەنەوە، ئەو خوایەی کە کامەرانی و ئاسوودەیی تۆ لە نزیك بوونەوە و ڕەزامەندی ئەو دایە، سەرگەردانی و خراپی تۆش لەدووربوونەوە و تووڕەیی ئەو دایە.

ئاگاداربـــە: نەکەی بهێڵی شەیتان خانووی خۆی لە بیرکردنەوە و ئیرادەت دروست بکات، چونکە ئەگەر ڕێگات پێدا ئەو کارە بکات ئەوە گەندەڵی دەکات، ئەوسا فریاکەوتنی زۆر ئاستەمە، ئەگەر ئەوەی بۆ ڕێك بکەوێت ئەوە بە هەوەسی خۆی هەموو جۆرە وەسوەسە و شتی خراپ دەخاتە بیرکردنەوە و خەیاڵت، بەربەستێکت بۆ دروست دەکات بۆ گەیشتن بەو بیرکردنەوانەی سوود بەخشن بۆت، لێرەشدا تاوانی خۆتە کە یارمەتیت داوە باڵادەست بێت بەسەر نەفستدا بەوەی دەرگای دڵت بۆ کردۆتەوە، ئەگەر وابکەی نموونەی تۆ ئەو وەکو ئەو کابرایەی ئاشەوان وایە کە خەریکی هاڕینی گەنمی باش و پاکە، کەچی کەسێك لەلاوە دێت ـ

فەردێك ـ خۆڵ و قشپل و خەڵوز و پۆخڵەواتی بە شانی خۆیدا داوە داوا لە ئاشەوان دەكات بیكاتە ناو باراشەكە و بیهاڕێت، جا لێرەدا ئەگەر ئاشەوانەكە ئـەو كابرایـەی دەركرد و نەیهێشت ئەو پۆخڵەواتە بكاتە ناو ئاشەكەیەوە، ئەوە ئاشـەكە بـەردەوام دەبێت لەسەر هاڕینی گەنمی بە سوود و پاك، بەڵام ئەگـەر ئاشـەوانەكە ڕێگای بـەو كابرایەدا ئەو پۆخڵەواتە بكاتە ناو ئاشەكەی، ئەوە بە هـۆی ئـەو پۆخڵەواتـەوە ئـەو گەنمەی لە ناویشیەتی هەر هەموو پیس دەبێت و خەسار دەبێت.

**چارەی ئەم دەردە:**

لـە ڕووی زانستەوە، ئەوەیە كە بیركردنەوە و خەیاڵی خۆت سەرقاڵ بكـەی بـەو زانیارانەی دەتگەیەنێتە یەكتاپەرستی و خۆشەویستی خوا، خۆ سەرقاڵ كـردن بـەو زانیارانـەی ڕاسـتی مـردن و هەواڵـەكانی تـرت تـا بەهەشـت و دۆزەخ بـۆ ڕۆشـن دەكەنـەوە، خـۆ سـەرقاڵ كـردن بـۆ بـە دەسـت هێنـانی زانیـاری لەسـەر ئـەو كـارە خراپانەی مرۆڤ تووشی تووڕەیی خوا دەكەن و ڕێگای خۆ لێ پاراستنی.

لـە ڕووی ئیرادەشەوە، پێویستە خۆت بـەو شـتانە سـەرقاڵ بكـەی كـە سـوودت پێدەگەیەنێت، واز لەو شتانەش بێنـی كـە زیانـت پـێ دەگەیـەنێت، دەبیـنین لـەلای خواناسەكان ئومێدكردن بۆ خیانەت و سەرقاڵ كردنی دڵ و هۆش پێیەوە زۆر زیانی زیاترە بۆ دڵ لە خودی خیانەتەكە خۆی، دەڵێن: چونكە ئومێدكردنی خیانـەت دڵـی پێ سەرقاڵ دەبێ و هەموو غەم و مەبەستی دەبێتە ئەو خیانەتە، بۆ نموونـە تۆ لە دنیادا پادشایەك دەبینی ئەگەر هێندێ لە دار و دەستەكانی دڵ و هۆشیان سـەرقاڵ ببوو بەوەی كـە چۆن خیانـەتی لێ بكـەن، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو شتەیان لـە دڵـی خۆیـان حەشـاردابوو خزمـەتی پادشـایان دەكـرد و پێویـستیەكانیان بـۆ جێبـەجێ دەكرد، جا ئەگەر هاتوو پادشا بەو مەبەست و خیانەتەكەی ئـەوانی زانـی ئـەوە زۆر لێیان تووڕە دەبێت، بۆیە چی خراپە پێیان دەكـات، چونكـە ئەوانـە لـەلای پادشـا زۆر خـراپترن و قیـزەوەنترن لـەو كەسـەی تـاوانێكی ئەنجامـداوە بـەبێ ئـەوەی لـە پادشای بشارێتەوە، لەبەر ئـەوەی كەسـی یەكـەم لـە بـێ دەسـەڵاتی خیانەتەكـەی

ئـەنجام نـەداوە، ئـەگینا دڵـی پـڕە لـە پادشـا، کەسـی دووەمـیش خیانەتەکـەی ئەنجامداوە، کەچی دڵی پێی ناخۆشە، وەنـەبێت سـوور بێـت لەسـەر خیانـەت و لـە دڵی خۆشی حەشاری دا بێت، جا ئەوەیان حاڵ و عاقیبەتی زۆر چاکترە لـە کەسـی یەکەم.

پوختەی قسان ئەوەیە: دڵ هەرگیز چۆل نابێت لە خەتەرە و بیرکردنەوە، ئینجا ئـەو بیرکردنەوەیـە یـان هـانی دەدات بـۆ چاکـسازی حـاڵی دوا ڕۆژی، یـان ئـەو بیرکردنەوەیـە هـانی دەدات بـۆ چاکـسازی ژیـانی دنیـای، یـان ئـەو بیرکردنەوەیـە تووشی چەندین وەسوەسە و نیاز و شتی بێ هودەی دەکات.

پێشتر باسمانکرد کە نەفسی مرۆڤ وەکو ئاش وایە هەرچی تێهاوێی دەیهاڕێـت، ئەگـەر گـەنمی تێبهـاوێی دەیهاڕێـت، ئەگـەر شووشـە و بـەرد و قـشپلی تێبهاویـت دەیهاڕێت، جا خوای گەورە خاوەن و بەڕێوەبەری ئەو ئاشەیە – کە نەفسی مرۆڤـە – مەلائیکەتێکی بۆ ئامادە کردووە شتی بە سوودی تێبکات، نەفـسیش دەیهاڕێـت، شـەیتانێکیش شـتی بـێ سـوودی تێـدەکات نەفـسیش دەیهاڕێـت، جـا ئەوانـەی مەلائیکەت دەیخاتە دڵی مرۆڤەوە، هاندانیەتی بۆ خێر و بە ڕاستدانانی ڕۆژی دوایی، ئەوەی شەیتانیش دەیخاتە دڵی مرۆڤ، هاندانیـەتی بـۆ خراپـە و بـە ڕاسـت دانـەنانی ڕۆژی دوایی.

# فەرموو: بەرداغێك لە ئاوی ئیمان

(شقیق)ی کوڕی (ابراهیم) دەفەرمووێ: دەرگای تـەوفیقی خـوا لەسـەر مـرۆڤ لـە شەش شت داخراوە:

١. سەرقاڵ بوونیان بە بەخششەکانی خوا و سوپاس نەکردنی.

٢. حەزکـردن لە زانست و زانـــیاری و کار پێنەکردنی.

٣. پەلەکردنی بۆ گوناه و دواخستنی تەوبە.

٤. فریوخواردن بە هاوڕێیەتی پیاوچاکان و چاو لێنەکردنیان.

٥. پشت تێکردنی دنیا لەوان، کەچی ئەوان ڕووی تێدەکەن.

٦. ڕووتێکردنی دوا ڕۆژ بۆیان، کەچی ئەوان پشتی تێدەکەن.

ـ ابن قیم دەفەرمووێ ـ منیش دەڵێم: ئەوانە بۆ وایان بەسەر هاتووە چـونکە، حەزکردن لە چاکە و ترسان لە خراپەیان لە دڵدا نیە، یـەقینێکی بـێ هێزیـان هەیـە، چاو ساغیان نیە، بنـچینەی ئەوانـە بـێ نرخـی نەفـسە و گـۆڕینی شـتی چـاکەیە بـە خراپە، ئەگەر وانەبایە و نەفسی نرخی هەبایـە، ئـەوە شـتی چـاکەی نـەدەگۆڕی بـە خراپـە.

کەوابوو: بنچینەی هەموو خێر و چاکەیەك ـ دوای سـەرفرازی خوا ـ لـە بـەرزی و پـاکی و بـەنرخی نەفـسەوە سـەرهەڵدەدات، بنـچینەی هــەموو خراپەیـەکیش لـە گەندەڵی و پیسی و بێ نرخی نەفسەوە سەرهەڵدەدات خـوای گـەورە دەفــەرمووێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾ (الـــشمس:٩ـــ١٠)، واتـــە: بەڕاستی ئەو کەسە سەرفرازە کە نەفسی پاك و پوخت کردووە بـە بەندایـەتی خـوا، ئەو کەسەش زەرەرمەند بوو کـە نەفـسی خـۆی گەنـدەڵ و پـیس و پـۆخڵ کـردووە بەبێ فەرمانی خوا.

بەڵـێ: نەفسی پـاك و بـەڕێز تـەنها شـتی بـەرز و چاك و سوپاسكراوی دەوێت، بەڵام نەفسی پیس و بێ نرخ ڕوودەكاتە شتی قێزەون وگەندەڵ و پیس وەك مێش و مەگەز كە چۆن تەنها ڕوو دەكەنە سەر شتی پیس، نەفسی پاك و بەڕێز بە ستەم و فاحیشە و دزی و خیانەت ڕازی نابێت، چونكە زۆر لـەوە بەرزتر و بـە نـرختره كـە پێی ڕازی بێت، بەڵام نەفسی بێ نرخ و پیس و گەندەڵ بە پێچەوانەی ئەویە.

پوختەی قسان: هەر نەفسێك مەیلی بۆ ئـەو كارانــە دەچێت كـە لەگـەڵ خۆیـدا دەسازێ، ئەوە مانای ئەو ئایەتەیە كە خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ﴾ (الأسراء:٨٤)، واتـە: هـەر كەسە و كارێك ئەنجام دەدات كـە لەگـەڵ خۆیـدا بسازێ.

هــەموو مرۆڤێـك لەسـەر ئـەو ڕێبـاز و مەزهـەب و داب و نەریتەیـە كـە خـووی پێوەگرتووە، مرۆڤی خراپ كارێك ئەنجامدەدات كە لەگەڵ خـۆی بگونجـێ، لـە بـری سوپاس كردنی خوا لەسەر بەخششەكانی بێ فەرمانی دەكـات، مرۆڤـی ئیمانـداریش كارێك ئەنجامدەدات كە لەگەڵ خۆیدا بگونجـێ، بۆیـە شـوكرانە بـژێری خـوا دەكـات لەسـەر نیعمەتـەكانی و خۆشـی دەوێ و شـەرمی لێ دەكـات و هەسـت بـە چـاودێری دەكات و بە شكۆ و گەورەی دادەنێت.

ئەگەر كەسێك نەفسی خۆی نەناسێت، چۆن دروست كارەكەی دەناسێت؟ ـــ بە ووردی بڕوانــە ئــەو نموونــە جوانــە - خـوای گـەورە لـە سـینگتدا خانوویـەكی دروسـتكردوە كـە دڵــە، لـە نـاو ئـەو خـانووەش كورسـیەكی بـۆ سـازاندووە، ئـەو كورسیەش خواناسی و خۆشەویستی و یەكتاپەرستی خوا لەسەری جێگیر دەبێـت و دادەنیـشێت، كورسـیەكەش بـە پەڕۆیـەك داپۆشـراوە كـە ڕەزامەنـدی خوایـە، لـە تەنیـشتی لای ڕاسـت و چـەپیش فەرمانـەكانی خـوا ڕیزكـراوە، ئـەو خـانووەش بـە باخچەیەك دەوردراوە، جا خوای گەورە بارانی ووتەكانی خۆی بەسەردا دەبارێنێت، ئەوكات چەندین جۆر گوڵ و گوڵزار و درەختی بە بەری لێ دەڕوێت لـە بەندایـەتی و (الله اكبر)كردن و تەسبیحات و سوپاسگوزاری و بە پاك ڕاگرتنی خوا، لە ناوەڕاستی

باخچەکەش درەختێکی خواناسی بۆ دەڕوێنێ، ئەو درەختە: ﴿تُؤۡتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينِۢ بِإِذۡنِ رَبِّهَاۗ﴾(ابراهیم:٢٥)، واتە: ئەو درەختەی هەموو کاتێك بەروبوومی خۆی دەبەخشێت بەویستی پەروەردگاری، لە خۆشەویستی و گەڕانەوە و لە خواترسان و دڵ ئارامی و ئاسوودەیی.

ئەو درەختەش بە بیرکردنەوە لە قورئان و تێگەیشتنی و کارپێکردنی ئاودەدرێت، لەوماڵەدا چرایەك هەڵواسراوە کە بە ڕووناکی خواناسی و ئیمان و یەکتاپەرستی دەدرەوشێتەوە، دیوارێکیشی بۆ باخچەکە کردووە، تاکو بیپارێزێت لە هەموو بەڵایەکی خراپ، مەلائیکەتیشی وەك چاودێر بۆ ئامادەکردووە کە دەیپارێزن لە کاتی خەوی یان بەخەبەری.

کاتێك خاوەنی ئەو خانووە دەزانێت دانیشتوانی زۆر چاك لە ناو ماڵەکەی دان، بۆیە بەردەوام هەموو غەمی ئەوە دەبێت خانووەکەی پوختە بکات، تاکو دانیشتوانی ناو ماڵەکەی ڕازی بن، هەر کاتێکیش هەست بە نالەبارییەك بکات لە خانووەکەی ئەوە زۆر بە پەلە هەوڵدەدات چاکی بکات، بەراستی دانیشتوانی ناو ئەو خانووە دانیشت گەڵی باشن، بە ڕاستی ئەو خانووەش خانوویەکی باشە.

چەند جیاوازی هەیە لە نێوان ئەو خانووە و خانوویەك کە کاول بووە و بۆتە شوێنی مێش و مەگەز و پیسی و پۆخڵەوات، هەر کەسێك بیەوێت دەس بە ئاو بگەیەنێت دەچێتە ئەوێ، چونکە دەبینێ کاولە و کەسی تیا نیە و دیواری نیە و شوێنی پیساییە و تاریکە و بۆنی بۆگەنی لێدێ و هەمووی تێك چووە و پڕیەتی لە پیسی و پۆخڵی و کەس پێی هۆگر نابێت، کەسیش ناچێتە ئەوێ تەنها مێش و مەگەز و ئەوەی پێی ڕاهاتووە، جا شەیتان لە ناو ئەو خانووە لەسەر کورسیەکەی دانیشتووە، کورسیەکەش بە پەڕۆیەك داپۆشراوە کە نەفامیە، لەلای ڕاست و چەپیدا ئارەزووات ڕیزکراوە، لە ناو خانووەکە باخچەیەك هەیە پڕیەتی لە زەلیلی و سەرگەردانی و ڕووکردنە دنیا و دڵ پێوە بەند بوون و وازهێنان لە دوا ڕۆژ، ئەو باخچەیە بارانی نەفامی و ئارەزووات و شیرك و بیدعە بە سەریدا دەبارێت، کە

هـــەموو جـــۆرە دڕك و دار و گـــوژاڵکێکی تیـــا دەڕوێـــت، بەرووبومەکـــەی گونـــاه و سەرپێچی و ملکەچ نەکردن و قەشمەریات و گاڵتە و گەپ و وتنـــی شـیعری دڵداریـــە، لە ناوەراستی باخچەکەش درەختی خوا نەناسی و پشت کردنـە خـوا رواوە، هـەموو کاتێك بەرووبومی خۆیدەدا لە فیسق و گوناه و گاڵتە و یاری و قەشمەری و ڕۆیشتن لەگەڵ مەصلەحەت و شوێنکەوتنی ئارەزووات و غەم و خەفەت و دڵ تەنگی و ئـێش و ئـازار و دڵـەڕاوکێ، ئـاوی ئـەو درەختـەش شـوێنکەوتنی هـەوا و ئـارەزووات و مەغرووری و ئومێدبوون بە دنیایە.

بەڵێ: خوای گەورە دروستکاری هەر دوو خانوەکەیە کە دڵـە، جا هـەر کەسێك دڵی وەك ئەو خانووە پاکەی یەکەمجار باسمان کرد ڕابگرێت ئەوە لە دنیا وقیامـەت سەرفراز دەبێت، هەر کەسێکیش دڵـی وەك ئـەو خـانووە پیسەی دووەم ڕابگرێـت، ئەوە لە دنیا وقیامەت شەرمەزار و سەرگەردان دەبێت.

# وێستگەی ئیمان

پرسیار لە (سهل التُستري)ی کرا ووتیان: پیاوی وا هەیە ڕۆژێ یەك جەم دەخوات؟ فەرمووی: ئەمە خواردنی (الصديقين) ڕاستگۆیانە، پێیان ووت: ئەی ئەگەر دوو جەم بخوات؟ فەرمووی: ئەمەش خواردنی ئیماندارانە، پێیان ووت: ئەی ئەگەر سێ جەم بخوات؟ فەرمووی: بەماڵەوەیان بڵێن با ئاخوڕێکی بۆ بسازێنن.

(الأسود)ی کوڕی (سالم) دەفەرمووێ: دوو ڕکعات نوێژبکەم زۆر لەلام خۆشەویستترە لە بەهەشت و ئەوەی لە ناویشیدا هەیە.

پێیان ووت: قوربان ئەمە هەڵەیە، ئەویش لە وەڵامدا دەیفەرموو: با بۆتان ڕوون بکەمەوە، بەهەشت بۆ ڕازی بوونی نەفسی خۆمە، بەڵام دوو ڕکعات نوێژەکە بۆ ڕازی بوونی پەروەردگارمە، کەوابوو، ڕەزامەندی پەروەردگارم لا خۆشەویستترە لە ڕەزامەندی نەفسی خۆم.

¬ مرۆڤی خواناس لە زەویدا وەکو گوڵی ڕێحانەی بەهەشت وایە، کە مرۆڤی موسڵمان بۆنی دەکات تامەزرۆی بەهەشت دەبێت.

دڵی مرۆڤێك کە خوای خۆشبوێت لە نێوان شکۆ و جوانی خوا وەستاوە، هەر کاتێك وردبێتەوە لە گەورەیی خوا شکۆداری خوا لە دڵیدا دەدرەوشێتەوە، هەر کاتێکیش ووردبێتەوە لە جوانی خوا تامەزرۆی دەبێت.

# بەڵایەکی نادیار کە تۆ نازانی؟

یەکێك لە بەڵا نادیارەکان ئەوەیە کە مرۆڤ لە نیعمەتی خوا دایە و خـوا نیعمـەتی بەسەردا ڕژاندووە، کەچی ئەو مرۆڤە بە نەزانی خۆی دەیەوێت لە ژێـر ئـەم نیعمەتـە دەرچێت وادەزانێت لەوەی چاکتر چەنگ دەکەوێت، بەڵام پەروەردگاری بەنەفامی و نەزانی ئەو ناکات و بە ڕەحمەتی خۆی لە ژێـر نیعمـەتی خۆیـدا دەیهێڵێتـەوە، تـاکو ئەو کاتەی بە تەواوی بێزاری و ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێـت، ئـەوکات خـوای گـەورە نیعمەتەکەی لێ دەگرێتەوە و ئەو شتەی پـێ دەدات کـە داوای کربـوو، بـەڵام کاتێـك مرۆڤەکە دەگات بەوەی خۆی داوای کـردووە، دەبینێـت جیاوازیـەکی زۆر هەیـە لـە نێـوان ئـەوەی پێـشوو و ئـەوەی ئـەو داوای کـردووە، ئینجـا دڵ تـەنگ دەبێـت و پەشیمان دەبێتەوە داوا دەکات دیسان بگەڕێتەوە سەر ئەوەی پێشتر.

کەوابوو: هیچ شتێك وەکو ئەوە خراپ نیە کە مرۆڤ بێزار بێت و بێ تاقـەت بێـت لە نیعمەتی خوا، چونکە ئەو مرۆڤـــە ئـەو نیعمەتـەی بەسـەریدا ڕژاوە بـە نیعمـەتی خوای نازانێت، سوپاسی خواشی لەسەر ناکات و دڵخۆش نابێـت پـێی، بـەڵکو لێـی بێـزارە و گلـەیی لێـی هەیـە و بـە گرفتـی دەزانێـت، زۆربـەی خـەڵکی دژی هێنـدێ نیعمەتی خوانە کە پێی بەخشیوون، چونکە هەست ناکەن ئەوە نیعمـەتی خوایـە ــ بەڵکو وادەزانن ئەوە بەڵایە ـ بۆیـە بـە نـەفامی و نـەزانی خۆیـان تـێ دەکۆشـن بـۆ ئەوەی لە خۆیانی لابەرن.

چەند کـەس کـە نیعمـەتی خـوای بەسـەردا ڕژاوە، کەچـی ئـەو بـە نـەزانی خـۆی هەوڵیداوە لە خۆی لاببات خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ (الأنفال:٥٣)، واتـە: خودا هەرنیعمـەتێکی بە هەر گەڵ و نەتەوەیەك بەخشیبێت لێیان ناسێنێتەوە و لێیان ناگۆڕێت، تا خۆیان

بە خراپەی خۆیانەوە ئەو نیعمەتە لەسەر خۆیان لانەبەن و یاخود نەیگۆڕن.

خـوای گـەورە دەفــەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ (الرعد:١١)، واتــە: بێگومـان خـوای گـەورە لـە هـیچ گـەلێك ناگۆڕێـت، تـا ئـەوان لـە نەفسی خۆیان نەگۆڕن.

هیچ دووژمنێك سەرسەختتر نیە بۆ دژایەتی کردنـی نیعمـەتی خـوا لـە نەفـسی مـرۆڤ، نەفـسی مـرۆڤ لەگـەڵ دووژمنەکەیـدا پـشتیوانە، کـە دووژمنەکـەی ئـاگر لـە نیعمەتەکە بەردەدا نەفسیش بۆی خۆش دەکات، یەکەمجار ڕێگای بـە دووژمـن داوە ئـاگری تێبەربـدا پاشـان یارمـەتی دەدات، جـا کاتێـك ئاگرەکـە خـۆش بـوو هـاواری ئاگرکوژێنەوە دەکات و گلەیی لە (قدر) دەکات.

# بە چ سیفەتێك خودا دەناسی

هێندێ لە خەڵکی خوا بە بەخشندە و فەزڵ و چاکە دەناسن، هێندێکیش خوا بە لێخۆشبوون و ئـارامی و لێبـووردەیی دەناسـن، هێنـدێکیش خـوا بـە سـزا و تۆڵـە سەندنەوە دەناسن، هێندێکیش خوا بە زانست و حیکمەت دەناسن، هێندێکیش خوا بە عیززەت و (کبریـاء) دەناسـن، هێنـدێکیش خـوا بـە ڕەحمـەت و چـاکە دەناسـن، هێندێکیش خوا بەدەسەڵات و مولك دەناسن، هێندێکیش خوا بە وەڵامدانەوەی نزاو بە هانا هاتن و دابین کردنی پێویستیەکانی دەناسن.

لە هەمووان فراوانتر ئەوەیە کە خـوا لـە قورئانـەوە بناسـی، چـونکە لـە ڕێگـای قورئانەوە پەروەردگارێك دەناسێت کە خـاوەنی هـەموو سـیفاتێکی بـەرز و بڵنـد و کەمالـە، دوورە لـە هـەموو پێـچونێك، دوورە لـە هـەموو کـەم و کورتیـەك، خـاوەنی هەموو ناو و سیفاتێکی چاك و کامڵە، چی بوێت ئەنجامی دەدات، لەسەرووی هەموو شتێکە و لەگەڵ هەموو شتێکە، بە دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا، هەڵسوڕێنەری هەموو شتێکە، فەرمان دەدات و قەدەغەدەکات بێ کـەم و کوڕیـە، بـە شـکۆترە لـە هەموو شتێك، لە هەموو شتێك جوانترە، لە هەموو کەسێك بە ڕەحمـترە، لـە هـەموو کەسێك بە دەسەڵاترە، لە هەموو کەسێك حەکیم تـرە.

کـەوابوو: قورئـان نـازل بـووە تـاکو بەنـدەکان خـوای پـێ بناسـن و بـە ڕێگـای قورئانەوە بگەن بە ناسینی خوا.

# فراوانترین جۆری خواناسی

فراوانترینی جۆرەکانی خواناسی، ناسینی خوایە بـە سـیفەتی (الجمـال) جـوانی، هـەر کەسـەو و خـوا بـە سـیفەتێك دەناسـێت، بـەڵام چـاکترینیان ئەوەیـە خـوا بـە شکۆداری و بێ کەم و کوڕی بناسیت، جا جوانی خوای گەورە وێنـەی نیـە، گریمـان ئەگەر هەر هەموو خەڵکی لەسەر وێنەی جوانترین کـەس بن، جـا جـوانی دەرەوە و ژوورەوەیـان بـەراوورد بکـەی لەگـەڵ جـوانی پـەروەردگار، ئـەوە جوانیەکـەیان زۆر کەمترە لە ڕووناکی چرایەکی بێ هێز بەرانبەر ڕووناکی خۆری پرشنگدار، هـەر ئـەوە بەسـە بـۆ جـوانی خـوای گـەورە کـە هـەر هـەموو شـتە جوانـەکانی دنیـا و قیامـەت دروسـتکراوی ئـەوە، ئـەی دەبێـت جـوانی ئـەوە چـۆن بێـت کـە ئەوانـەی دروسـت کردووە؟! ئـەوە بەسـە بـۆ جـوانی خـوای گـەورە کـە خـاوەنی هـەموو عیزەتێکـە، خـاوەنی هـەموو دەسـەڵاتێکە، خـاوەنی هـەموو بەخـشندەیەکە، خـاوەنی هـەموو زانستێکە، خاوەنی هەموو فەزڵێکە.

یـەکێك لـە نـاوە جوانـەکانی خـوای گـەورە (الجمیـل)ە لـە حەدیـسی (صـحیح)دا هاتووە پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێ: ((إِنَّ اللّٰهَ جَمِيـلٌ يُحِـبُّ الْجَمَـالَ))[1]. واتـە: خـوای گەورە جوانە و جوان و پاکیشی خۆش دەوێت.

جوانی خوای گەورە چوار پلەی هەیە:

١. جمال الـذات: جـوانی زاتی خـوا.

٢. جمال الصفات: جوانی سیفاتەکاتی خوا.

٣. جمال الأفعال: جوانی کارەکانی خـوا.

٤. جمال الأسماء: جـوانی ناوەکـانی خـوا.

---

(١) صحیح: رواه مسلم (١٩)، ابو داود (٣٠٩١)، والترمذی (١٩٩٩)، و احمد فی ((المسند)) (١/٣٨٥و٤٢٧).

ناوەکانی خوای گەورە هەر هەمووی جوانن، سیفاتەکانی هـەر هـەمووی کامـل و بێ کەم و کوڕین، کارەکانی هەر هەمووی بە حیکمەت و چاکە و دادپەروەرانە و بە ڕەحمەتە، بەڵام جوانی زاتی خوای گەورە، جگە لە خۆی کەسی تر نەیگەیشتۆتێ و نایزانێت، کەسیش لە دروستکراوەکانی هیچی لێ نازانن، جگە لـەو پێناسـانە نـەبێت کە خوا بەو کەسانەی ئاشنا کردووە کە ڕێزی لێ نـاون، ئـەگینا جـوانی زاتـی خـوای گەورە پارێزراوە لە خەڵکی و نادیارە و پۆشراوە.

(ابـن عبـاس) دەفـەرمووێ: زاتـی خـوای گـەورە پۆشـراوە بـە سـیفاتی خـوا، سیفاتەکانی خواش پۆشراوە بە کارەکانی، کەوابوو گومانت چیە بەرانبـەر جوانیـەك کە پۆشراوە بە وەسفی کامل و بێ کەم و کوڕی، پۆشراوە بـە سـیفاتی گـەورەیی و شکۆداری.

لەو مانایەوە مرۆڤ لە هێندێ مانای جـوانی زاتـی خـوا دەگـات، چـونکە مـرۆڤ بـە ڕێگـای ناسـینی کارەکـانی خـوا سـیفاتەکانی خـوا دەناسـێت، لـە ڕێگـای ناسـینی سیفاتەکانی خواش زاتی خوا دەناسێت، جـا هـەر کاتێك جـوانی کارەکـانی خـوای بـــەدی کـــرد، جـــوانی ســـیفاتەکانی خـــوای بـــۆ ڕوون دەبێتـــەوە، لـــە جـــوانی سیفاتەکانیشیەوە جوانی زاتی خوای بۆ ڕوون دەبێتەوە، لێرەدا ڕوون دەبێتەوە کە خـوای گـەورە خـاوەنی هـەموو سـوپاس و ستایـشێکە کـەس لـە دروسـتکراوەکانی ناتوانن بە پێی شیاو ستایشی بکـەن بـەو شـێوەی خـۆی ستایـشی خـۆی کـردووە، بەڕاستی خوای گەورە پێویستە بپەرسترێ لەبەر زاتی، خۆشبویسترێ لەبـەر زاتـی، سـوپاس بکـرێ لەبـەر زاتـی، بێگومـان خـوای گـەورە خـودی خـۆی خۆشـدەوێت، ستایشی خۆی دەکا، سوپاسی خۆی دەکا.

خۆشەویستی خۆی بۆ خۆی، سوپاسی خۆی بۆ خۆی، ستایشی خۆی بۆ خـۆی، تەوحیدی خۆی بۆ خۆی، ئەوە ڕاسـتەقینەی سـوپاس و سـتایش و خۆشەویستی و تەوحیدە، خـوای گـەورە ستایـشی خـۆی دەکـات هـەر وەکـو بەنـدەکانی ستایـشی دەکـەن، خـــوای گـــەورە هـــەروەك چـــۆن زاتـــی خـــۆی خـــۆش دەوێـــت ســـیفات و

کارەکانیشی خۆشدەوێت. هـەموو کارەکـانی خـوای گـەورە چـاك و سوپاسـکراون، کارەکانی هیچ ناپەسندیەکیان تیا نیە، هیچ شتێك نیـە لەبـەر خـودی خـۆی خـۆش بویسترێ، سوپاس بکرێ لەبەر خودی خۆی جگە لە خودا نەبێت.

هەر شتێکیش خۆشبویسترێ جگە لە خوا، ئەگەر خۆشەویستیەکەی لەبـەر خـوا بوو و لە بۆ خوا بوو، ئەوە خۆشەویستیەکی دروستە و چاکە، بـەڵام ئەگـەر وانـەبوو ئەوە خۆشەویستیەکی پوچەڵە، ئەمەش تەنها شیاوی خوایە.

ئا ئەمە(الألوهیـة)ی ڕاسـتەقینەیە، چـونکە پـەرستراوی ڕاسـتەقینە، ئەوەیـە کـە لەبەر زاتی خۆشبویسترێ و سوپاسی بکرێ، ئەگەر بێتوو چاکەو نیعمەت و ئارامی و لێبووردن و لێخۆشبوون و ڕەحمەتیشی لەگەڵ بێت دەبێت چۆن بێت؟

کەوابوو: لەسەر مرۆڤ پێویستە بزانێت هیچ پەرستراوێکی بە حـەق نیـە جگـە لـە "الله" خۆشی بوێت و سوپاسی بکات لەبـەر بـێ کـەم و کـوڕی، پێویسـتە ئـەوەش بزانێـت هـیچ چـاکەکارێکی ڕاسـتەقینە نیـە کـە هـەموو نیعمـەتێکی دەروونـی و جەسـتەیت پـێ بـدات جگـە لـە "الله" جـا بۆیـە پێویـستە لەسـەر ئـەو چاکە و نیعمەتانەش خۆشی بوێت، لەسـەر ئەوانـە سـوپاس بکرێـت، لـە هـەموو ڕوویەکـەوە خۆش بویسترێ، هـەر وەك چۆن خـوای گـەورە هـیچ وێنەیـەك نیـە لـەو بـچێت، بـە هەمان شێوەش نابێت خۆشەویستی خوا بە خۆشەویستی کەس بچێت واتـە: نابێـت کەسی وەك خوا خۆش بوێت، چـونکە هـەر خۆشەویستیەك ملکەچـی لەگەڵدا بێـت ئـەوە بەندایەتیـە، ئـەو بەندایەتیـەی کـە هـەموو مرۆڤـەکان بـۆ ئـەو بەندایەتیـە دروستکراون، بەندایەتی بریتیە لە خۆشەویستی و زەلیلی، خۆشویستنی بەم جۆرە تەنها بۆ خوا دەبێت، نابێت مرۆڤ هیچ کەسێکی تری بەم جۆرە خۆشـبوێت، ئەگـەر وای کرد دەکـات هاوبەشـی بـۆ خـوا بڕیـارداوە، هـەر کەسـێکیش هاوبـەش بـۆ خـاو بڕیاربدات ئەوە خوا هـەرگیز لێـی خـۆش نابێـت و کارەکانیـشی پوچـەڵ دەکاتـەوە ئەگەر تەوبە نەکات.

شوکرانەبژێری دەبێت دوو خاڵی تیادا کۆببێتەوە:

- ✓ باسکردنی چاکەکانی و سیفاتە کاملەکانی.
- ✓ لەسەر ئەو نیعمەتەی خوا پێداوە خوای خۆش بوێت.

کەواتــە: ئەگەر کەسێك باسی چاکەی کەسێکی تر بکات، بـەڵام خۆشـی نـەوێت ناکات سوپاسـگوزارە، هـەر کەسـێکیش کەسـێکی تـری خـۆش بوێـت، بـەڵام باسـی چاکەکانی نەکات ئەویش ناکات سوپاسگوزارە، تاکو ئـەو دوو خاڵـەی باسمـان کـرد تیا کۆنەبێتەوە پێی ناگوترێ سوپاسگوزار.

سوپاسـکردنی مـرۆڤ بـۆ خـوا بـە ئیـزن و ویـستی خوایـە، چـونکە هـەر خودایـە سوپاسگوزار دەکات بە سوپاسکار، مـرۆڤ دەکـات بـە موسـڵمان، مـرۆڤ دەکـات بـە نوێژکەر، مرۆڤ دەکات بە تەوبەکار، هەر لەویەوەیە سەرەتای نیعمەت و کۆتای، هەر لەویەوەیە سەرەتای سوپاس و کۆتایشی، هەر خودایە تەوبە بۆ بەندەکەی فەراهەم دێنێت، زۆریشی پێ خۆشە، ئەمەش لە فەزڵ و بەخشندەیی خۆیەتی، بەندایەتی بۆ بەندەکەی فەراهـەم دێنێـت و یارمـەتی لەسـەر دەدات، پاشـان پاداشتیـشی لەسـەر دەداتـەوە، ئەمـەش لـە فـەزڵ و بەخـشندەی خۆیـەتی، خـوای گـەورە لـە هـەموو ڕوویەکەوە دەوڵەمەندە و پێویستی بە کەس نیە، جگە لە خوا هەموو کەس هـەژارن و پێویستیان بە خوایە لە هەموو ڕوویەکەوە، بەندە هەژارە و پێویستی بە خوایە لە هەموو بوارێکدا، جا ئەوەی بە خواوە نیە ئەوە هەر نیە، ئەوەی بۆ خوا نیە سوودی نیە.

# ڕوونکردنەوەی حەدیسەکان:

پێغەمبەرﷺ کـە دەفـەرمووێ: ((إِنَّ اللّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ))[١].

مەبەسـت لـەم حەدیسە جوانی جل و بەرگـە وەك لـە بەشـی پێشەوەی ئـەم حەدیسە ئامـاژەی پێکـردووە[٢]، جـوانی هـەموو شـتێکیش دەگرێتـەوە هـەر وەك پێغەمبەرﷺ لە حەدیسێکی تـردا دەفـەرمووێ: ((إن الله نَظِيـف يحب النظافـة))[٣]، واتـە: خوای گەورە پاکـە و حەزیش لە پاکی ئەکات.

لە حەدیسێکی تری (صحیح)دا دەفـەرمووێ: ((إن الله طيـب لا يقبـل إلا طيبـاً))[٤]، واتـە: خوای گەورە پاکـە و ئەو شتەش وەردەگرێ کە پاك بێت.

لە (السنن)دا هاتووە پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێ: ((إن الله يحب أن يرى أثـر نعمتـهِ على عبدهِ))[٥]، واتـە: خوای گەورە حـەز دەکـات شـوێنەواری نیعمـەت و بەخشـشی خۆی لەسەر بەندەکەیدا ببینێت.

(أبي الأحوص الجشمي) دەفـەرمووێ: پێغەمبـەر ﷺ منـی بینـی جلێکـی شـڕم لەبەر دابوو پێی فەرمووم: ئایا سەروەت و سامانت هەیە؟ منیش گوتم: بەڵێ هەمـە، ئەویش فەرمووی: چ جۆرە ماڵێکت هەیـە؟ منـیش گـووتم: لـە هـەموو جـۆرە مـەڕ و ماڵات و حوشترێکم هەیـە، جـا پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: (دەی کـەوابوو وابکـە بـا خوای گەورە نیعمەت و بەخششەکانی لەسەرتدا ببینێت)[٦].

---

(١) صحيح: رواه مسلم (١٩)، ابو داود (٣٠٩١)، والترمذى (١٩٩٩)، و احمد في ((المسند)) (١/٣٨٥و٤٢٧).

(٢) درێژەی حەدیسەکە بەم شێوەیە: ((لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ». قَالَ رَجُلٌ إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا وَنَعْلُهُ حَسَنَةً. قَالَ « إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ)).

(٣) رواه الترمذى (٢٨٠٠)، وفى سنده خالد بن الياس او اياس، و هو متروك الحديث كما قال الحافظ فى ((التقريب)) و له شواهد عند الطبرانى فى ((الاوسط)) من حديث سعد بن ابى وقاص ، ذكره السيوطى فى ((الجامع الصغير)) قال المناوى فى الفيض قال الهيثمى ورجاله رجال الصحيح .

(٤) صحيح: رواه مسلم (١٠١٥)، والترمذى (٢٩٩٢)، والدارمى (٢٧٢٠).

(٥) اسناده حسن: رواه الترمذى (٢٨٢٠).

(٦) اسناده صحيح: رواه النسائى (٨/١٩٦)، و احمد فى ((المسند)) (٣/٤٧٣).

خوای گەورە پێی خۆشە شوێنەواری بەخششی خۆی لەسەر بەندەکانیدا ببینێت، پێی خۆشە جوانی لەسەر بەندەکانیدا ببینێت، پێی خۆشە جوانی دڵ و دەروونیش بە دەربڕینی شوکرانە بژێری لەسەر بەندەکانی بەدی بکات، دەبینین خوای گەورە چونکە جوانی پێ خۆشە بۆیە پۆشاکی بۆ مرۆڤ فەراهەم هێناوە تاکو ڕواڵەتی خۆیانی پێ جوان بکەن و بڕازێننەوە، تەقوا و خواناسیشی بۆ فەراهەم هێناون تاکو دڵ و دەروونی خۆیانی پێ بڕازێننەوە و جوان بکەن دەفەرمووێ:

﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ﴾ (الأعراف:٢٦)، واتـە: ئەی نەوەی ئادەم، بێگومان ئێمە پۆشاکی لە بارمان بۆ ئێوە فەراهەم هێناوە، تاکو عەورەتتانی پێ داپۆشن، هەروەها پۆشاکی خواناسیشمان بۆ فەراهەم هێناون تاکو ـ دڵ و دەروونتان ـ پێ بڕازێننەوە، بێگومان پۆشاکی خواناسی چاکتر و بە فەڕترە.

لـــەبارەی بەهەشـــتیەکانەوە دەفـــەرمووێ: ﴿وَلَقَّىٰهُمۡ نَضۡرَةٗ وَسُرُورٗا ١١ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةٗ وَحَرِيرٗا﴾(الأنـسان:١١ــ١٢)، واتـــە: خـوای گـەورە ڕووگەشـی و شـادمانی پێبەخشین، لە پاداشتی خۆگری و ئارامگریان بەهەشت و ئاوریشمی پێبەخشین.

لێـرەدا خـوای گـەورە ڕووخـسارییانی شـادمان کـردووە، دڵ و دەروونیـشیانی کامەران کردووە، لاشەشـیانی بـە حـەریر ڕازاندۆتـەوە، خـوای گـەورە چـۆن جـوانی خۆشدەوێت لە قسەو کاروکردەوە و پۆشاك و شێوەدا، بە هەمان شێوەش ڕقـی لـە پیسی و گەندەڵی دەبێتەوە لە قسە و کاروکردەوە و پۆشاك و شێوەدا.

## لەم بابەتەدا دوو چین لە خەڵکی بە هەڵە داچوونە:

بەشی یەکەم: ئەوانەن کە دەڵێن: هەر شتێك خوا دروستی کردبێت ئەوە جوانـە، خوای گەورەش هـەموو دروسـتکراوەکانی خـۆی خـۆش دەوێـت، کـەوابوو: ئێمـەش هەموو ئەو شتانەمان خۆش دەوێت کە خوا دروستی کردووەو ڕقمان لەهیچ شـتێك و کەسێك نابێتەوە، بەڵگەش بـەم ئایەتانـە دێننـەوە: ﴿ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ﴾

(السجده:٧)، واتـە: خـوای گـەورە هـەموو شـتێکی بەچـاکی و ڕێکـوپێکی بـەدی هێناوە.

ئـەو ئایەتـەش: ﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ﴾(النمـل:٨٨)، واتـە: ئەوانـە دەستکردی ئەو خوایەیە کە هەموو شتێکی بەو پەڕی ڕێکوپێکی دروستکردووە.

ئـەو ئایەتـەش: ﴿مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ﴾(الملـك:٣)، واتـە: لـە نێـو بەدیهێنراوەکانی خوای میهرەبان هیچ نارێکیەك بەدی ناکرێت.

خواناسی ڕاستەقینە لەلای ئەوان ئەو کەسەیە کە هەموو شتێك بە چاك و جوان بزانێت، هیچ شتێك بە خراپ و گەندەڵ نەزانێت، ئا ئەوانە غیرەت لە پێناوی خوا لـە دڵیاندا نەماوە، ڕق لێبوونەوە لە پێنـاوی خـوا و دژایـەتی کـردن لـە پێنـاوی خـوا و قەدەغەکردنی خراپە لە پێناوی خوا و کوشتار لە پێناوی خوا و جـێ بـەجێ کردنـی سنوورەکانی خوا لە دڵیاندا نەماوە.

بەشی دووەم: ئەوانەن کە دەڵێن: خوای گەورە زەمـی جـوانی شـێوە و قیافـە و بالاو ڕێکی مرۆڤـی کـردووە ئـەوەتا لـە بـارەی مونافقەکانـەوە دەفـەرمووێ: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ﴾ (المنـافقون:٤)، واتـە: کاتێـك جەسـتەیان دەبـینی سەرنجت ڕادەکێشێت.

هەروەهادەفـــــــەرمووێ: ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَاثًا وَرِءْيًا﴾ (مریم:٧٤)، واتـە: چەندین قەومی نالەبارمان پێش ئـەوان لـەناو بـردووە کـە مـاڵ و سامانیان لەوان زیاتر بووە سیما و قیافەشیان لەوان ڕێکو پێکتر بووە.

له (صحیح المسلم)یشدا هاتووە پێغەمبـەرﷺ دەفـەرمووێ: ((ان الله لا ینظـر الی صورکم و أموالکم و انما ینظر الی قلوبکم و أعمالکم))[1]، واتـە: خـوای گـەورە سـەیری وێنەتان وماڵتان ناکات، بەڵکو سەیری دڵ و کاروکردەوەکانتان دەکات.

---

(١) صحیح: رواه مسلم (٣٤).

## ئەم دوو بەشە کامیان بۆچوونەکانیان ڕاستە:

لەم ڕووەوەگوتراوە جوانی قیافەت و پۆشاك و شێوە سێ جۆری هەیە:

١. بەشێکیان چاك و سوپاسکراوە، ئەویش ئەوەیە جوانیەکەی بۆ خوابێت، یارمەتی بدات لەسەر بەندایەتی و گوێرایەڵی و وەڵامدانەوەی خوا، هەر وەك پێغەمبەرﷺ لە کاتی هاتنی (وفد) بۆ خزمەت جەنابی خۆی دەڕازاندەوە، ئەوەش وێنەی پۆشینی کەل و پەلی جەنگە و بۆ جیهاد و پۆشینی حەریر و خۆهەڵکێشانە لە جەنگ، ئەمەیان سوپاسکراوە و دروستە ئەگەر لەبەر بەرز کردنەوەی ووشەی "الله" بێت و بۆ سەرخستنی دین و دژایەتی کردنی دووژمن بێت.

٢. بەشێکیان خراپ و زەم لێ کراوە، ئەویش ئەوەیە جوانیەکەی بەکاربێنێت بۆ مەبەستی دنیا و ناوداری و خۆهەڵکێشان و گەیشتن بە ئارەزووات، جا دەبینین زۆربەی خەڵکی لە جوانی تەنها ئەمەیان مەبەستە.

٣. بەشێکیان نە سوپاسکراوە و نە زەم لێ کراوە، ئەویش ئەوەیە لەم دووانەی باسمان کرد لە هیچیان نیە.

مەبەست ئەوەیە: ئەو حەدیسە دوو بنچینەی گرنگی لەخۆ گرتووە:

یەکەمیان: ناسینی خوایـە.

دووەمیان: ڕەوشت جوانی یە.

خوای گەورە پێی خۆشە بەندەکەی زمانی بڕازێنێتەوە بە ڕاستگۆیی، دڵی بڕازێنێتەوە بە ئیخلاص و خۆشەویستی و گەڕانەوە و تەوەکول، ئەندامەکانی بڕازێنێتەوە بە بەندایەتی، لاشەی بڕازێنێتەوە بەو پۆشاکانەی کە خوا پێی بەخشیوە، خۆی پاك بکاتەوە لەپیسی و بێدەست نوێژی و گەندەڵی ومووی پیس و سوونەت و نینۆك کردن.

پوختەی قسان ئەوەیە: خوا بناسێت بە سیفاتە جوانەکانی، خۆشی بەخوا بناسێنێ بە کاروگوفتار و ڕەوشتی جوان، خوا بە جوانی بناسێت کە سیفەتی

خوایە،  بەجوانیش بیپەرستێ کە دین و شەرعی خوایـە، بەڵـی: ئـەم حەدیسە ئـەو دوو بنچینەی لە خۆ گرتووە:

- ✓ خواناسینی بە جــوانی.
- ✓ جوانکردنی خوو ڕەوشتی.

# بەختەوەری لە ڕاستگۆیی دایە

هـیچ شـتێك وەك ڕاسـتگۆیی عەزیمـەت سـوودی بـۆ مـرۆڤ نیـە خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ﴾(محمد:٢١)، واتـە: کە غەزا بڕیار درا، ئەگەر لەگەڵ خـودا ڕاسـت بکـەن خۆیـان بـۆ شـەڕ ئامادەبکـەن، ئەوە دەبێتە مایەی خێرو قازانج بۆیان و زۆر باشترە بۆیان.

بەڵـێ: کامەرانی مرۆڤ لەو دووانەدایە:

- ڕاستگۆیی لە عەزیمەت.
- ڕاستگۆیی لە کارەکانی.

ڕاستگۆیی عەزیمەت: کۆکردنەوەی عەزم وجەزم و نەمانی دوو دڵیـە لـەو شـتەی دەیەوێت بیکات، چونکـە عەزیمەت بە هیچ شێوەیەك نابێـت دوو دڵـی لـەقی بکـات، ئەگەر هاتوو عەزیمەتی ڕاستگۆیانە بوو ئەوکات ڕاستگۆیی لە کارەکانی دەمینێت.

ڕاستگۆیی لە کاریش: تێکۆشانە بە دڵ و لاشە.

کەواتـە: ڕاسـتگۆیی لـە عەزیمـەت، دەیپارێزێـت لـە بێهێـزی ئـیرادە و هیمـەت، ڕاستگۆیش لە کاردا دەیپارێزێت لە تەمەڵی و سست و خـاوی، جـا هـەر کەسێك لـە کارەکانیدا ڕاستگۆبێت لەگەڵ خوادا، ئەوە خوای گەورەش سەرفرازی دەکـات، ئـەو ڕاستگۆییەش لە ئیخلاص و تەوەکولەوە هەڵـدەقوڵێت، بۆیـەش ڕاسـتگۆترین کـەس ئەوەیە کە ئیخلاص و تەوەکولێکی پتەو و دروستی هەیە.

# وێستگەی ئیمان

پەروەردگار خاوەن ئیرادەیە، فەرمانیش بە بەندەیەکی خاوەن ئیرادە دەکات، ئەگەر هاتوو خوا یارمەتی بەندەی خۆیدا و بەندەش توانای دایە بەرخۆی، ئەوکات جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورەی بۆ ئاسان دەبێت، بەڵام ئەگەر خوای گەورە ئەو بەندەی فەرامۆش کرد و کارەکەی دایە دەستی خودی بەندەکە خۆی، ئەوە بەندە ڕوو لەو کارانە دەکات کە هەواو ئارەزوی پێی خۆشە.

هەر بۆیەش دەبینین خوای گەورە لە قورئاندا زەمی ئینسانی کردووە، تاکو شتێکی تری لەگەڵ ئینسانیەتیەکەی خۆی زیاد نەکات، ئەویش دەبێت موسڵمان بێت، ئیماندار بێت، ئارامگر بێت، چاکە کاربێت، سوپاسگوزار بێت، خۆپارێز بێت، چاك بێت... هتد.

ئەو کارانەی باسمانکرد مرۆڤ لە سنووری ئینسانی و ئیرادە چاکی دەردەکات بۆ پلەیەکی بەرزتر، ئەویش دەبێت یارمەتی خوای لەگەڵدا بێت، هەر وەك چۆن بینین تەنها بە چاو ئەنجام نادرێت، دەبێت نووری بینینی لەگەڵدا بێت.

# دەتەوێت لەلای خەڵکی بەڕێز بیت؟!

بەڕێزان گەورەترین ستەم ونەفامی ئەوەیە کە داوا لە خەڵکی بکەی ڕێزت بگرن و بەگەورەت بزانن، کەچی خۆت دڵت چۆڵە لە بە گەورە زانینی خوا و ڕێزگرتنی خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا﴾ (نوح:١٣)، واتـە: ئـەوە ئێوە چیتانە ناترسن لە گەورەیی و شکۆداری خوا؟!

(الحسن) لە بـارەی تەفـسیری ئـەم ئایەتـەوە دەفـەرمووێ: بۆچـی مـافی خـوا بـە چاکی لەسەر خۆتان نازانن و شوکرانە بژێری ناکەن؟

(مجاهد) دەفەرمووێ: بۆ پەروەردگارتان بەشکۆ نازانن؟

(ابن زید) دەفەرمووێ: بۆ بە پوختی گوێڕایەڵی و بەندایەتی خواناکەن؟

(ابن عباس) دەفەرمووێ: بۆ بە چاکی شکۆداری خوا ناکـەن.

ئەم ووتانە هەمووی دەگەڕێتەوە سەر یەك مانـا ئـەویش ئەوەیـە ئەگـەر ڕێزیـان لەخوا بنابایە و شکۆداری خوایان بە چاکی بناسیبایە، ئەوکات بە تاکیان دەزانـی و ملیان بۆ کەچ دەکرد و شوکرانە بژێریان دەکرد.

گوێڕایەڵی خوا و خۆ پاراستن لە گوناه و شەرم کردن لە خوا، بـە ئەنـدازەی ئـەو ڕێزە دەبێت کە مـرۆڤ دایـدەنێت بـۆ خـوا لــە دڵـی خـۆی، هـەر بۆیـەش هێنـدێ لـە (السلف) گوتیانـە: ڕێـز گرتن لـە خـوا ئەوەیـە هـیچ شـتێك لـە دروسـتکراوەکانی نەهێنیتە ڕێزی خوا، نە لـە قسـە وەك بڵێی: (واللە و حیاتك) واتـە: سـوێند بـەخوا و گیانی تۆ، یان بلێی: (مالي الا اللە و انت) واتـە: من تەنها خوا و تۆم هەیە، یان بلێی : (وماشاء اللە وماشئت) واتـە: ئەگـەر خوا حەز بکات و تۆش حەز بکـەی، هـەروەها نابێت دروستکراوەکانی خوا بێنیتە ڕێزی خوا لــە خۆشەویـستی و بـە گـەورەزانی و شـکۆداری و بەندایـەتی، بـە جـۆرەك کـە گوێڕایـەڵی مرۆڤێـك بێـت هـەر وەك چۆن

گوێڕایەڵی خوا دەکات، بەڵکو زیاتریش گوێڕایەڵی مرۆڤ دەکات، هـەر وەك دەبیـنین حاڵی زۆربەی ستەمکار و خراپەکاران ئاوایـە، هـەروەها نابێـت مافـەکانی فـەرامۆش بکات بڵێـی: دەی دەی خـوا لێبووردەیـە، ئەگـەر خـواو پێغەمبـەر لـە لایـەك بـوون، خـەڵکیش لەلایـەکی تربـوون، جـەنابت ڕوو بکــە ئـەو لایـە و لـەو لایەبـە کـە خـوا و پێغەمبەرﷺ لێیەتی، نەکەی لە دڵ و دەروونەوە لە خزمەتی دروسـتکراوەکاندا بـی کە چی بێ دڵ و دەروون بەڵکو بە لاشە و زمان لە خزمەت خوا دابی، نەکـەی داوای نەفس و ئارەزوی خۆت پێش ڕەزامەندی خوا بخەیت.

ئا ئەمانە هەر هەمووی نیشانەی نـەبوونی ڕێـزی خوایـە لـە دڵـی مرۆڤـدا، ئەگـەر مرۆڤ ئاوا بوو، خوای گەورە بـە هـیچ شـێوەیەك لـە دڵـی خـەڵکی بـەڕێز و هەیبـەتی ناکات، بەڵکو ڕێز و هەیبەتی لە دڵی خەڵکی هەڵدەکێشێت، ئەگەر خـەڵکی ڕێزیشی بگرن لەبەر ئەوەیە کابرایەکی خراپە و لێی دەترسێن بۆیـە ڕێـزی دەگـرن، نـەك لـە خۆشەویستیان ڕێزی بگرن.

لە نیشانەی ڕێزی خوا لە دڵی مرۆڤ، ئەوەیە کە شەرم بکات خوا بە نهێنیەکانی و هەڵـەکانی بزانێت، هـەر لـە نیـشانەی ڕێـزی خـوا لـە دڵـی مـرۆڤ، ئەوەیـە لـە کـاتی تەنهایشدا شەرم لە خوا بکات زیاتر لەوەی شەرم لە خەڵکی دەکات.

کەوابوو: ئەگەر کەسێك ڕێـز لە خـوا و ووتـەی خـوا نـەگرێت، ڕێـز لـەو زانـست و حیکمەتە نەگرێت کە خـوا پێـی داوە، چۆن داوا لـە خـەڵکی دەکـات ڕێـز و قـەدری بگــرن؟!

قورئان و زانست و ووتەی پێغەمبەرﷺ مرۆڤ دەگەیەنن بە حەق، جـا لـە هـەموو لایەکەوە ئامۆژگاری و ئاگاداری و سەرزەنشت دەورەی داوی، کەچی ئا ئەمانە هـەر هەمووی هیچ سوودێکی پێ نەگەیاندوی! لەگـەڵ ئەوەشـدا داوا لـە خـەڵکی دەکـەی ڕێز و قەدرت بگـرن؟! تۆ وەکو زامدارێك وای کە ئامۆژگـاری و سـەرزەنـشت دەردی تیمار ناکات، کەچی دەیەوێت بەسەیر کردن دەردی تیماربێت.

کەسێك گوێبیستی سزای کەسێکی تر ببێت، وەکو ئەو کەسە نیە کە بینیبێتی، ئــەی ئەگــەر لــە خــودی خــۆی بــەدی بکـات؟﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلْآفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمْ﴾ (فصلت:٥٣)، واتــە: ئێمـە بەڵگــە و نیـشانەی سەرسوڕهێنەریان نیـشان دەدین لە ئاسۆکانی بوونەوەردا و لە خودی خۆشیان.

هەروەها دەفــەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾(یـونس:٩٦ــ٩٧)، واتــە: بێگومـان ئەوانەی بڕیاری پەروەردگاری تۆیان لەسەر هاتووە کـە ئیمـان نـاهێنن، ئـەوە تـازە ئیمان ناهێنن، چونکە دەرگای ئیمان هێنانیان لە خۆیان داخستووە، ئەوانـە ئـەگـەر چەندها موعجیزەشیان نیشان بدرێت، هـەر ئیمـان نـاهێنن، تـا دووچـاری سـزای بـە ئێش و ئازار ئەبن و بە چاوی خۆیان ئەیبینن.

لــە ئایــەتێکی تــر دەفــەرمووێ: ﴿وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ (الانعـام:١١١)، واتـــە: ئەگـەر ئێمـە مەلایکـەتیان بـۆ بنێرینـە خـوارەوە و بـە چـاوی خۆیـان بیـان بیـنن و مردوویان بۆ زیندوو بکەینـەوە و قـسەیان لەگەڵدا بکـەن و هـەموو جـۆرە شـاهید و بەڵگەیەکیان بۆ کۆبکەینەوە، بە دیدەی خۆیان بیانبینن، هەموو ئەوانە ببنـە بەڵگـە لەسەر ڕاستێتی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز لەلایەن خوداوە هێشتا هـەر بـاوەڕ ناهێنن و دەستبەرداری کافرایەتی خۆیان نـابن، چـونکە لـە دوژمنایـەتی و عینـادی زۆر سەر سەختن، مەگەر تەنها خودا خۆی بیەوێت بیانخاتە سەر ڕێگای ئیمان.

مرۆڤی ژیر و سـەرکەوتوو ئەوەیـە کـە پـەند وەرگرێت، بـە هـەر ڕووداوێك کـارو ڕەوشتی خۆی جوان بکات، هەر کـاتێکیش تووشـی تـاقی کردنـەوە بێـت بـە لاشـە، ئیمـانی زیـاد بێـت، ئەگــەر هێـزی لاشــەی کــەم بێـت، هێـزی ئیمـان و یـەقین و خۆشەویستی خوا و دوا ڕۆژی زیاد بێت، بەڵام ئەگەر مرۆڤ وانـەبوو ئـەوە مـردن زۆر

چاکـترە بۆی، چونکە بە ئێش و ئازارێکی دیاریکراو کۆتـایی بـە تـەمـەنی دێت، بـە پێچەوانەی ئەوەی تەمەنێکی درێژی هەبێت و پڕبێت لە خراپە ئەو خراپەش پاشان تووشی ئێش و ئازاری بکات، بەڵکو کاتێك تەمەن درێژی سوودی هەیە، ئەگەر مرۆڤ ئەو تەمەنەی وەك توێشوویەك بێت بۆی بەوەی بیر لە خوا بکاتەوە و تەوبە بکات و کاری چاکە بکات هەر وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾ (فاطر:٣٧)، واتـە: ئایا ئەوەندە تەمەنمان پـێ نەبەخشین؟ کـە هـەر کەسێك بیەوێت بیر لە خوا و بەخششەکانی بکاتەوە تیایدا بتوانێت بیر بکاتەوە.

هـەر کەسێك ئـەو تەمەنـەی کـە هەیـەتی نـەیکات بـە فرسـەتێك بـۆ چـاککردنی کارەکانی و ئەنجامدانی بەندایەتی و دڵ جۆڕدان بۆ بـە دەسـت هێنـانی بەهەشـتی نەبڕاوە، ئەگەر مرۆڤ وا نەکات ئەوە تەمەن و ژیان هیچ سوودێکی نیە بـۆی، چـونکە مرۆڤ لەسەر ڕێگای گەشت دایە یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ، جا ئەگـەر تەمـەنی درێژ بوو، کارەکانیشی چاك بوو، ئەوە درێژی گەشتەکەی زیـاتر خـۆش و بەلـەزەت دەبێت، چونکە هەر کاتێك گەشتەکەی درێژ بێ زیـاتر تامـەزرۆ و شـەیدا دەبێـت بـۆ ئامانجەکەی، بەڵام ئەگەر تەمەنی درێژ بوو، کارەکانیشی خـراپ بـوو، ئـەوە درێـژی گەشتەکەی زیاتر ئێش و ئازاری دەدات و دایدەبەزێنێتەوە خوارەوە پێغەمبەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((خَيْرُكُمْ مَنْ طَالَ عُمُرُهُ وَ حَسُنَ عَمَلُهُ، وَ شَرُّكُمْ مَنْ طَالَ عُمُرُهُ وَ قَبُحَ عَمَلُهُ))[1].

---

(١) حسـن: رواه الترمذی (٢٣٣١)، و احمد فی ((المسند)) (٥/٤٠و٤٣و٤٧)، و الدارمی (٢٧٤٥).

واتـە: چاکترین کەس لە ئێوە، ئەو کەسەیە کە تەمەنی درێژ بێت و کارەکانیـشی چاك بێـت، خـراپترین کەسیش لـە ئێـوە، ئـەو کەسـەیە کـە تەمـەنی درێـژ بێـت و کارەکانیشی خراپ بێت.

مرۆڤی عاقل ئەو کەسەیە فرسەت لەو زیانانە وەردەگرێت کە بەسەری دێت، هەر کاتێك زیان بە لاشەی گەیشت، فرسـەتی لێ وەردەگرێ و دەیکاتـە چاکسازی دڵ و دەروونی، هـەر کاتێـك لـە دنیـا شـتێکی لـە چـەنگ چـوو، دەیکـات بـە فرسـەت بـۆ توێشووی دوا ڕۆژی، هەر کاتێك تووشی غەم و خەفـەت و دڵ تـەنگی بـوو، دەیکـات بە شادمانی دوا ڕۆژی.

# سەفەرێك بۆ دوا هەوارگە

مـرۆڤ لـەو کاتـەوەی دروسـتکراوە بـەردەوام گەشـتیارە و لـە ڕێگادایــە، نابێـت کەلوپەلەکەی دابگرن و لێی دامەزرێن، مەگەر یان لە بەهەشت نەبێت یان لە دۆزەخ.

مرۆڤی ژیـر دەزانێـت کـە ئینـسان لـە گەشـت تووشـی ئـێش و ئـازار و ترسـناکی دەبێت و ناکرێ ئینسان لە گەشتدا لـە دوای خۆشـی و ئیـسراحەت بگـەڕێت، بـەڵکو خۆشی و ئیسراحەت دوای ئەوەی گەشتەکە تـەواو بـوو و گەیشتنە مـەنزڵگا چـەنگ دەکەوێت.

بێگومان مرۆڤی گەشتیار دەبێت بەردەوام بێت لە گەشتەکەی نابێت هیچ کاتێـك ڕاوەستی، گەشتیار دەبێت بەردەوام لە ئامادە باشی دابێـت بـە خـۆی و کەلوپـەلی گەشتیەوە، هەر کاتێکیش دابەزی بۆ ئەوەی بخـەوێت یـان پـشوویەکی کـەم بـدات، دەبێت لەسەر ئامادە باشی گەشتەکەی بێت و گەشتەکەی لەبیر نەکات.

# شەیتان لە (٣) دەرگاوە دەچێتە دڵی مرۆڤەوە

شەیتان تەنها سێ ڕێگای هەیە لێیەوە بێت و مرۆڤ هەڵخەڵەتێنێت:

دەرگای یەکەم: زیادە مەسرەفی، کە مرۆڤ زیـاد لە پێویست شت بکـات، چـونکە ئەوە ڕێگایەکی سەرەکی شەیتانە کە پێیدا بێتە ناو دڵی مرۆڤەوە، بۆ خـۆ پاراسـتن لەوەش دەبێت مرۆڤ زیـاد لە پێویست شت ئەنجان نەدات، بەوەی زیاد لـە پێویـست خواردن نەخوات، یان زیاد لە پێویست نەخەوێ یـان زیـاد لـە پێویـست ئیـسراحەت نەکات، ئەگەر مرۆڤ ئەم دەرگایەی داخست، ئەوە دڵنیا دەبێت لە نەهاتنی شـەیتان بۆ دڵی.

دەرگای دووەم: بێ ئاگایی، چونکە مرۆڤێك زیکر و یادی خـوا بکـات، وەك ئـەوە وایە لە ناو قەڵای زیکر و یاد دابێـت، بـەڵام هـەر کاتێـك بـێ ئاگـابوو ئـەوە دەرگـای قەڵاکە دەکرێتەوە و دووژمن دێنە ژوورەوە، ئەوکاتیش دەرکردنیان زۆر ئاستەمە.

دەرگای سێیەم: تەکلیف کردن لەو شتانەی کە پەیوەندی بەویەوە نیە.

# ڕێگای سەرکەوتن

هەر کەسێك داوای ڕەزامەندی خوا و دوا ڕۆژ بکات، یان داوای هەر شتێکی تر بکات لە زانست و پیشە و پلەوپایە، بەوەی ببێت بە مەشخەڵ لەم کارەیدا، پێویستە ئازابێ و پێشکەوێ و باڵادەست بێت بەسەر خەیاڵاتەکانیدا، نابێت خۆی بخاتە بەر دەستی خەیاڵ و ئەندێشە، دەبێت واز لە هەموو شتێکی تر بێنێت جگە لەوە نەبێت کە داوای دەکات، تامەزرۆی گەیشتن بە ئامانجەکەی بێت، شارەزا بێت چۆن بە ئامانجەکەی دەگات و چۆنیش لێی دادەبڕێت، دەبێت هیمەتی بەرزبێت، خۆڕاگربێت، لۆمە و سەرزەنشتی خەڵکی با ساردی نەکاتەوە، بە دڵ و لاشە بەردەوام بیر بکاتەوە، نە بە مەدحی خەڵکی نە لۆمەی خەڵکی ساردی نەکاتەوە لە کارەکەی، ڕووبکاتە ئەو هۆیانەی کە یارمەتی دەدات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی، هیچ شتێك ساردی نەکاتەوە و هەڵی نەخەڵەتێنێت، دروشمی ئارامی بێت، ئیسراحەتی ماندوو بوون بێت، تامەزرۆی ڕەوشتی جوان بێت، کاتەکانی بپارێزێت، تێکەڵی خەڵکی نەبێت مەگەر بە ئاگاداریەوە نەبێت، وەکو تەیرێك کە چۆن دێت دانەکەی لە ناو خەڵکیدا دەبات.

## کێ دەکەی بە هاوڕێت؟!

چاکترین کەس کە هاوڕێیەتی لەگەڵدا بکەی ئەو کەسەیە کە سوود و بەهرەت پێ دەگەیەنێت، ئا ئەو هاوڕێیە چاکترین یارمەتی دەرە بۆ سوود پێگەیاندنت و کامـل بوونت، جا لە ڕاستیدا سوود وەرگرتنی تۆ لەو وەکو سوود وەرگرتنـی ئـەوە لـە تـۆ یان زیاتریش.

خراپترین هاوڕێش ئەو کەسەیە کە زیانت پێ دەگەیەنێت و تووشی بـێ فـەرمانی خوات دەکات، ئا ئەوە خراپترین یاریدەدەرە بۆ زیان پێ گەیاندنت و کەم و کوڕیت.

# چێژی حـــــەرام

تام و چێژی ئەنجامدانی حەرام هیچ نیە و تەنها ناخۆشی و پەرێشانی، دوای نەمانی تام و چێژی حەرامەکەش ئێش و ئازاری بە دوادا دێت، کەوابوو ئەگەر ئەوە حاڵی ئەنجام دانی حەرام بێت، تۆش هەر کاتێك ویستت حەرامێك ئەنجام بدەی ئەوە ئەنجامی مەدەو بیر لەنەمانی تام و چێژەکەی بکەوە، بیر لەمانەوەی ئێش و ئازارەکەی بکەوە، پاشان کردن و نەکردنی بەراوورد بکە، ئینجا بڕوانە جیاوازیان چیە.

لە هەمان کاتیش ماندوو بوون بە ئەنجامدانی بەندایەتی خۆشی و شادیە، ئەنجامدانی بەندایەتی دڵ ئارامی و حەسانەوە و کامەرانی پێوە بەندە، جا هەر کاتێك ئەنجامدانی بەندایەتی لەسەر نەفست گران بوو، بیر لە نەمانی ماندوو بوونەکەی بکەوە، بیر لە مانەوەی چاکی و خۆشی و کامەرانیەکەی بکەوە، پاشان کردن و نەکردنی بەراوورد بکە، ئینجا کامەیان چاکە ئەوی هەڵبژێرە، ئەگەر دڵگرانیش مەبە بە وازهێنانت لە حەرام چونکە سزای بە دوا دادێت.

عاقڵ ئەو کەسەیە کاتێك دوو سوودی بۆ داندرێت ڕوو دەکاتە زۆرەکە و کەمەکە بەلاوە دەنێت، ئەگەر دوو زیانیشی تووشبێت کەمەکەیان هەڵدەبژێرێ و زۆرەکەی بەلاوە دەنێت.

کەوابێت: هەر کەسێك زانا و هۆشمەند بێت، ئەوە شتی چاکە بەسەر خراپەدا هەڵدەبژێرێت، بەڵام کەسێك زانا و هۆشمەند نەبێت، خراپە بەسەر چاکە هەڵدەبژێرێت، هەر کەسێکیش بیر لە دنیا و دوا ڕۆژ بکاتەوە، بۆی دەردەکەوێ و دەزانێت کە هیچیانی بێ ماندوو بوون چەنگ ناکەوێت، بۆیە خۆڕاگربە بۆ چاکترینیان و بەردەوامترینیان.

## وێســتگە

پێویستە لەسـەر مـرۆڤ کاتـەکانی هـەموو لـە گوێڕایـەڵی خـوا سـەرف بکـات، بـۆ ئەوەی لە خودا نزیك بێتەوە، مرۆڤ ئەگەر کاتەکانی سەرقاڵ کرد بە گوێڕایەڵی خوا، ئەوە لە خوا نزیك دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر کاتەکانی لە هەوا و هەوەس و ئیسراحەت سەرف کـرد، ئـەوە لـە خـوا دوور دەکەوێتـەوە، چـونکە مـرۆڤ بـەردەوام یـان نزیـك دەبێتەوە لە خوا، یان دوور دەکەوێتەوە لە خوا هەرگیز لەو دوو ڕێگایە لانادا خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ﴾(المدثر:٣٧)، واتـە: هـەر کـەس دەیەوێت یا بەرەو پێش بچێت، یان خۆی دوا بخات.

# دڵت مۆڵگەی خودایە یان شەیتان

خوای گەورە بۆ مرۆڤەکان فـەرمان پێکراو و قەدەغـەکراوی دانـاوە، بەخـشش و گرتنەوەی داناوە، خەڵکیش لەو بارەیەوە بوونە بە دوو بەش:

بەشـی یەکـەم: فەرمانـەکانی جێبـەجێ ناکــەن، قەدەغـەکراوەکانی جێبـەجێ دەکـەن، شوکرانەی بەخششەکانیشی ناکـەن و بێ ئاگان لێی، کە شتێکیـشیان لـێ دەگرێتەوە سپڵەیی بەرانبەر دەکـەن، ئا ئەوانە دووژمنانی خـوان، دووژمنایەتی هـەر کەسەشیان بەپێی خراپەکەیەتی.

بەشی دووەم: ئەوانەن کە دەڵێن: خودایە ئێمە بەندۆکەی تۆین، ئەگەر فـەرمانت پێکردین پەلـە دەکەین بۆ ئەنجامدانی، ئەگەر قەدەغەت کردین لە شتێك دەستی لێ هەڵدەگرین و وازی لێ دەهێنین، ئەگەر شتێکت پـێ بەخـشین سـوپاس و شـوکرانە بژێریت دەکـەین، ئەگـەر شتێکیـشت لێ گرتینـەوە ملکەچیت بـۆ دەکـەین و زیکـرت دەکەین، لە نێوان ئەوانـە و بەهەشتدا هیچ شـتێك نیـە، تـەنها پەردەیەك هەیـە کـە ژیانی دنیایە، هەر کاتێك مـردن ئـەو پەردەیـەی دڕانـد، ئـەوکات بـە بەهەشـت شـاد دەبن و چاویان گەش دەبێ و دەکەونە ناو خۆشی و کامـەرانی نـەبڕاوە، بـە هـەمان شێوەش ئەوانەی بەشی یەکەمیش هیچ شتێك لە نێوان ئەوان و دۆزەخدا نیە، تـەنها پەردەیەك هەیە کە ژیانی دنیایـە، هـەر کاتێـك مـردن ئـەو پەردەیـەی دڕانـد، ئـەوە دەچنە دۆزەخەوە ئەوکاتیش پەنجەی پەشیمانی دەگـەزن و تووشـی ئـێش و ئـازار دەبـن، جـا ئەگـەر هـاتوو سوپای خـودا و شـەیتان لـە دڵتـدا تێـك چـڕژان، تـۆش دەتویست بزانی لە کامیانی، بڕوانـە بزانە مەیلت بۆ کامیان دەچێ و لە دژی کامیان شەڕ دەکەی، چونکە هەرگیز ناکرێ تۆ ڕاوەسـتی و لەگـەڵ کەسـیاندا نـەبی، بـەڵکو هەر دەبێت لەگەڵ یەکێکیان بیت.

خواناسان سەرپێچی هەوا و ئارەزووات دەکەن، بە ژیرانە ڕێدەکەن، بە دڵ بیر لەوە دەکەنەوە کە بۆی دروستکراون، ئەندامەکانیان بە کاردێنن لەو شتانەی فەرمانیان پێکراوە، کاتەکانیان لە خزمەتی دوا ڕۆژدا سەرف دەکەن، پەلە دەکەن بۆ کۆکردنەوەی کاری چاکە، بەلاشە لە دنیانە کەچی دڵیان لە گەشتدایە بۆ دوا ڕۆژ، توێشوو بۆ دوا ڕۆژ ئامادە دەکەن پێش ئەوەی بیگەنێ، بە پێی پێویست ڕەزامەندی خوا بەدەست دێنن، توێشوو بۆ دوا ڕۆژ ئامادە دەکەن بە پێی ئەوەی تیایدا دەمێنێتەوە، جا خوای گەورە بە بەخششی بەهەشت دڵ نەواییان دەکات، دڵەکانیان وەردەگرێت و کۆی دەکاتەوە لەسەر خۆشەویستی خۆی و گەیشتن بە بارەگای، بەخششی هۆگری خۆی پێیان دەبەخشێ، دڵیان پاك دەکاتەوە لە خۆشویستنی دنیا و غەم و خەفەت و دڵتەنگی، بەوانە دڵخۆش و هۆگر دەبن کە نەفامەکان پێی دڵتەنگ دەبن، بە لاشە لە دنیان، بەڵام بە ڕووح لە مەلەکوتی ئاسمانەکانن.

# باسی یەکتاپەرستی

یەکتاپەرستی پاکترین و بێگەردترین و سافترین شتە، بۆیە شتێکی زۆر بچوك تێکی دەدا و پیسی دەکا و کاریگەری تێدەکات، یەکتاپەرستی وەکو جلێکی سپی وایە، کە بەشتێکی زۆر بچوك پیس دەبێت، وەکو ئاوێنەیەکی ساف وایە، کە بە شتێکی زۆر بچوك لێلّ دەبێت، یەکتاپەرستی بە ساتێك یان قسەیەك یان ئارەزوویێکی نادیار دەشێوێت، جا ئەگەر کابرا زوو فریای کەوت و لە دڵی خۆی هەڵی کێشا ئەوە باشە، ئەگەر نا باڵادەست دەبێت و دەبێت بە خوو ئەوکات هەڵکێشانی ئاستەمە.

ئەو شتانەی بە یەکتاپەرستیەوە دەلکێن تێکی دەدەن، هێندێکیان زوو پێوەی دەلکێن و زووش لادەچن، هێندێکیشیان زوو پێوەی دەلکێن و درەنگ لادەچن، هێندێکیشیان درەنگ پێوەی دەلکێن و زووش لادەچن، هێندێکیشیان درەنگ پێوەی دەلکێن و درەنگیش لادەچێت.

بەڵام هێندێ خەڵك هەیە یەکتاپەرستیەکی بەهێز و پتەوی هەیە، کە ئەو شتانە نایشێوێنێت، هەر وەك ئاوێکی زۆر وایە کە شتێکی پیسی تێکەوێ پیس نابێت، بەڵام یەکتاپەرستی کەسێکی بێ هێز دەشێوێنێت، بە جۆرێك کە ئەو کاریگەریەی لە یەکتاپەرستی بێ هێزی دەکات، لە یەکتاپەرستی بە هێزی ناکات.

هەروەها: شوێنێکی زۆر پاك ئەگەر شتێکی پیسی تێدا دەرکەوێت ئەوە خاوەنەکەی دەیبینێ، وەك ئەوە نیە کە شوێنێکی وەك ئەو پاك نەبێت پیسیش بێت خاوەنەکەی نەیبینێت، چونکە ئەوەی یەکەم زوو فریای پیسیەکە دەکەوێت و لای دەبات، بەڵام ئەوەیان هەر هەستیش بە پیسیەکە ناکات.

# تۆ خوات هەیە بۆ دڵ تەنگی؟!

وازهێنان لـە هـەوا و ئـارەزوواتی خـۆی لـە پێنـاو خـودا، ئەگەرچـی مـرۆڤ ڕزگـار دەکات لە سزای خوا و شادی دەکات بە ڕەحمەتی خوا.

زەخیرەی خوا، گەوهەراتی چاکـە، تام و چێژی هۆگری، تامەزرۆ بوونی مرۆڤ بـە خوا، کامەرانی و شادمانی، ئا ئەمانە لە دڵێك جێگای نابێتەوە کـە ئـەو دڵـە غـەیری خودای تیا بێت، ئەگەر بێتوو ئـەو کەسـە خوانـاس و زاهیـد و زانـاش بێـت، چـونکە خوای گەورە قبووڵ ناکات زەخیرەی ئەو لە دڵی کەسێك دابێت کـە جگـە لـە خـوای تیایە و هیمەتی بەستراوەتەوە بە غەیری خوا، بەڵکو خوای گەورە زەخـیرەی خـۆی لە ناو دڵێکدا دەنێت، کە هەژاری بە خـواوە بـە دەوڵەمەنـدی بزانێـت، دەوڵەمەنـدی بەبێ خوا بە هەژاری بزانێت، سەربەرزی بەبێ خوا بەسەر شۆڕی بزانێت، زەلیلی بـە خواوە بە سەربەرزی بزانێت، خۆشی بەبێ خوا بە سزا بزانێت، ناخۆشیش بە خواوە بە خۆشی بزانێت.

پوختەی قسان ئەوەیە: ئەو کەسە ژیانی تەنها بە خـواوە دەوێـت، ئەگـەر ژیـانی خوای تیا نەبوو ئەوە بە مردن و ئازار و خەفەت و غەم و پەژارەی دەزانێـت، ئەگـەر مرۆڤ ئاوا بوو ئەوە دوو بەهەشتی هەیە:

- بەهەشتێك لە دنیادا و بۆی پێشی خراوە، کە دڵی شـادمانە و وەك ئـەوەی لـە بەهەشت دابێت.

بەهەشتێکیش لە دوا ڕۆژدا بۆی دانراوە.

# باسی (الإنابة)

(ألإنابة) واتـە: پەیوەست بوونی دڵ بە خواوە، وەك چۆن (اعتكاف) پەیوەست بوونی لاشەیە بە مزگەوت و لێی جیانابێتەوە.

(ألإنابة)ی ڕاستەقینە، ئەوەیە بەردەوام پەیوەست بوونی دڵە بـە خۆشەویستی خوا، بە زیکر و یادی خوا، بەردەوام پەیوەست بوونی ئەندامەکانە لەسەر بەندایەتی خوا بە ئـیخلاص و بـەو شێوەی کـە پێغەمبـەرﷺ کردوویـەتی، هـەر کەسـێك دڵـی پەیوەست نەبێت بە خوا، ئەوە دڵی پەیوەست دەبێت بە شتی تری جۆراوجۆر، هەر وەك پێغەمبەر ابـراهیم بـە گەلەکـەی خـۆی فــەرموو: ﴿مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِيٓ أَنتُمۡ لَهَا عَٰكِفُونَ﴾ (الانبیاء:٥٢)، واتـە: ئەو بتانە چیە؟! کـە ئێـوە دڵتـان پێـوەی بەنـدە و دەیپەرستن.

لێرەدا دەبینین دڵ پەیوەست بوونی هەر دوو لایەنمان بۆ دەردەکـەوێت، بـەوەی گەلەکەی دڵیان پەیوەستە بەو بتانە و بەندایەتی دەکەن، بەڵام ئەو دڵی پەیوەستە بە خوا و بەندایەتی پەروەردگار دەکات.

کـەوابوو: دڵ پەیوەسـت بـوون بـە هـەر شـتێك و سـەرقاڵ بـوون پێـوەی، ئـەوە وازهێنانە لە خوا و پەرستنی ئەو شتەیە کە دڵی پێـوە بەنـدە، ئەمـەش وێنـەی بـت پەرستنە، ئەگەر لە دڵدا هـەر شـتێك هـەبوو جگـە لـە خـوا و ئـەو شـتە بـە جۆرێـك دەستی بەسەر دڵدا کێشا و دڵ پێوەی بەنـد بـوو و ملـی بـۆ کەچکرد، ئـەوە وەکـو پەرستنی بتەکە وایە، هەر بۆیەش پێغەمبەرﷺ ناوی بردووە بە بەندەی ئەو شتەی کە بەم جۆرە دڵی پێوە بەندە، دووعای بە هیلاك چـوون و بەپـواکـەوتنی لێ کـردووە دەفـەرمووێ: ((تعس عبـد الـدینار، تعس عبـد الـدرهم، تعس و انـتکس و إذا شیك فـلا انتقش))[1]، واتـە: بەنـدەی دینـار و درهـەم بـە هـیلاك چـێت و بـەڕوا بکـەوێت، بـە جۆرێك وەکو دڕکێك کە لێی بئاڵێ و لێی دەرنەچێت.

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٦/١٦٠و١٦١)، وابن ماجه (٤١٣٥).

# وێســـتگە

خەڵکی لەم دنیایەدا گەشتیارن و لە گەشتدان، هەموو گەشتیارێکیش لـە ڕێگـای گەشـتەکەی دەگـەڕێت بـۆ شـوێنێك تـاکو کـەمێك لێـی دابـەزێ و پـشوویەك بـدا و شادمان بێت، ئەو کەسەش کە خوا و دوا ڕۆژی مەبەستە لە گەشـتەکەیدا دەگـەڕێت بە دوای پشوویەکی حەڵاڵ بۆ ئەوەی خۆی پێ بە هێز بکات بـۆ گەشـتەکەی خـوای گـــەورە دەفـــەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾﴾ (الفجـر:٢٧ ـــ ٣٠)، واتـــە: ئـەی دڵـی پـڕ لـە ئارامی، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لـەو ڕازیـت و ئـەویش لـە تـۆ ڕازیـە، دەبچۆرە ڕیزی بەندە چاك و بەڕێزەکانمەوە، بچۆرە بەهەشتەوە.

# لە ووتەکانی شێخ ( علی )

◈ لە خەودا پێیان گووتم: ئەی بەندەکەم بۆیە تـاقیم کردیـەوە بـە هـەژاری، تـا وەك زێرێکی پاکت لێ بێت کە دوای دارِشتن نەگۆرِێت.

◈ برِیارم بۆ تۆ داوە بە هەژاری بۆ نەفـسی خۆشـم بـە دەوڵەمەنـدی، جـا ئەگـەر هاتوو منت بە دەوڵەمەند زانی ئەوە من دەوڵەمەنـدت دەکـەم، بـەڵام ئەگـەر غـەیری منت بە دەوڵەمەند زانی، سەرگەردانت دەکەم و لە دەرگای خۆم دەرت دەکەم.

◈ نەکەی روو بکەیـە غـەیری ئێمـە، چـونکە سـەرگەردانت دەکـات و دەرمـانێکی کوشندەیە بۆت، بەڵام ئەگـەر رووتکـردە کارێـك ئێمـە بۆمـان دیـاری کردبـووی یـان رووتکـردە ناسـینێکی شـیاو ئـامێز یـان رووتکـردە کـارێکی فـەرمان پێکـراو یـان رووتکـردە چـەند دروسـتکراوێك کـە تۆمـان پێـی سـپاردبوو، ئـەوە رازیـم ببم بـە پەروەردگارت و بە بەندەی خۆمتم قبووڵ بکەم.

هەناسە هەڵکێشانی قووڵ

ئەو هەناسە قووڵەی مـرۆڤ لـە کـاتی بیـستنی قورئـان یـان لـە شـوێنی تـر هـەڵی دەکێشێت چەند هۆیەکی هەیە لەوانـە:

یەکەم: لەکاتی بیـستنی قورئـان دڵـی بـە جۆرێـك رۆشـن دەبێتـەوە کـە ئـارام و شـادمان دەبێـت، بۆیـە ئـەو هەناسـە قووڵـە هەڵدەکێـشێت، ئەمـەیان هەناسـە هەڵکێشانی تامەزرۆییە بۆ پەیمانەکانی قورئان.

دووەم: گوناهـەکانی خـۆی بـیر دەکەوێتـەوە، بۆیـە لـە ترسـان و خەفـەتان ئـەو هەناسـە قووڵـە هەڵدەکێـشێت بـۆ نەفـسی خـۆی، ئەمەشـیان هەناسـە هەڵکێـشانی ترسە.

سێیەم: شتێکی بۆ دێتە ڕێ کە ناتوانێ لە خۆی لابەرێت، بۆیە هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێت لە خەفەتان، ئەمەش هەناسەی خەفەتە.

چوارەم: خۆشەویستی بێ پایانی خوای لە دڵیدا دەدرەوشێتەوە، دەشبینێ ڕێگای گەیشتن بە خوا ئێستا داخراوە تاکو دەمرێت ئینجا پێی دەگات، بۆیە ئەو هەناسە قووڵە هەڵدەکێشێت، لە داخان.

پێنجەم: خۆشەویستی خوای لە بیر نەماوە، سەرقاڵی شتی تر بووە، جا لە پڕدا کە گوێی لە قورئان دەبێت، خۆشەویستی خوای بیردەکەوێتەوە، دەشبینی دەرگای پەشیمانی کراوەتەوە و ڕێگای بۆ ڕۆشن کراوەتەوە، بۆیە هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێت لە خۆشی و ئاسوودەیدا.

ئەو هەناسە هەڵکێشانە: هێزێکە بە دڵی مرۆڤدا دێت، ئەو هێزە کاریگەری خۆی لە دڵدا دەبینێت و کاری خۆی لە دڵ دەکات، بەڵام لە ڕواڵەتدا دیار نیە.

ئەو کەسەی ئەو هەناسەیەش هەڵدەکێشێت ئەوە سێ جۆرە هەناسەیە:

١. هەناسەیەکی ڕاستگۆیانەیە و لە دڵیەوە هەڵدەقوڵێت.

٢. هەناسەیەکی دەسکردە و هیچ نیە.

٣. هەناسەیەکی ساختە و مونافیقانەیە بۆ فریودانی خەڵکی.

# بــیر لە چی دەکەیەوە؟!

بنـچینەی هــەموو کـارێکی چـاك یـان خراپــە لــە ســەرەنجامی بیرکردنــەوە سـەرهەڵدەدات، چـونکە بیرکردنــەوە سەرچـاوەی ئـیرادە و ئەنجامـدانی زوهـد و وازهێنان لە گوناه و خۆشەویستی و تورەیە.

بەسوودترین بیرکردنەوە، بیرکردنەوەیە لە چوار شت:

١. بیرکردنەوە لەو شتانەی بەرژەوەندی بۆ دوا ڕۆژی تیایە.

٢. بیرکردنەوە لەو ڕێگایانەی دوا ڕۆژی پیێ بە دەست دێ.

٣. بیرکردنەوە لەو شتانەی بەرژەوەندی بۆ دوا ڕۆژی تیا نیە.

٤. بیرکردنەوە لەو ڕێگایانەی دوا ڕۆژی پیێ لە دەست دەچێت.

ئەو چوار بیرکردنەوەیـە چـاکترین و گـرنگترین بیرکردنـەوەن بـۆ مـرۆڤ، لـە دوای ئەمانەش چوار بیرکردنەوەی تریش دێت ئەوانیش:

١. بیرکردنەوە لەو شتانەی دنیا کە بەرژەوەندی بۆ قیامەتی مرۆڤ تیایە.

٢. بیرکردنەوە لەو ڕێگایانەی ئەو بەرژەوەندیانەی پیێ بە دەست دێ.

٣. بیرکردنەوەیە لەو شتانەی دنیا کە بەرژەوەندی بۆ قیامەتی مرۆڤ تیا نیە.

٤. بیرکردنەوە لەو ڕێگایانەی ئەو بەرژەوەندیانەی پیێ لە دەست دەچێت.

ســەرەکیترین بیرکردنــەوەش بیکردنەوەیــە لــە دروســتکرا و نیعمەتــەکانی خــوا، بیرکردنەوە لـە فـەرمان و قەدەغـەکراوەکانی خـوا، بیرکردنـەوە لـە ڕێگـای زانیـاری پەیاکردن بە ناو و سیفاتەکانی لە ڕێگای قورئان و سوونەتی پێغەمبەرەوەﷺ، ئەم بیرکردنەوە خۆشەویستی و ناسینی خوا بە مرۆڤ دەبەخشێ، ئەگەر بیریکـردەوە لـە شــەڕەف و بــەردەوامی دوا ڕۆژ، بیریکـردەوە لــە بــێ نرخــی و نــەمانی دنیــا، ئــەم بیرکردنەوە تامەزرۆی دوا ڕۆژ لە دڵی مرۆڤ دروست دەکـات، ئەگـەر بیریکـردەوە لـە

ئەو ماوە کورت و تەنگەی دنیا، ئەوە زیاتر خۆی هیلاك دەکات و تـیٚ دەکۆشـێت و ناهێڵێت کاتی بە فیڕۆبچێت.

بەرانبەر ئـەم بیرکردنـەوە باشـانەش، چـەند بیرکردنـەوەی پوچـەڵ و بـیٚ هـودە هەیە، کە لە ناو دڵی زۆربەی خەڵکیدا دێت و دەچێت لەوانــە:

١. بیرکردنەوە لەو شتانەی کە داوا لـە کـەس نـەکراوە بـیری لیٚ بکەنـەوە، وەکـو بیرکردنەوە لە چۆنیەتی زاتی خـوا کە هەرگیز عەقلی مرۆڤ پێی ناگات.

٢. بیرکردنەوە و خۆ سەرقاڵ کردن بـەو زانـستانەی کـە بیرکردنـەوە لیٚـی هـیچ ڕێزێك بە نەفسی مـرۆڤ نـادات، وەکـو بیرکردنـەوە لـە وردەکـاری (منطـق)و زانـستی بیرکاری و سروشتی و زۆرێك لەو زانـستە فەلـسەفیەکان، ئەگـەر مـرۆڤ بیشی گاتـیٚ پێی کامل نابێت و نەفسی پیٚ پاك نابێتەوە.

٣. بیرکردنەوە و خۆ سەرقاڵ کردن بە ئارەزووات و ڕابواردن و ڕێگای بە دەسـت هێنانی، ئەمانە ئەگەرچی نەفسی مرۆڤ تامێکی لیٚ وەردەگرێت، بـەڵام زیانەکـەی لـە دنیا زۆر زیاترە لە دوا ڕۆژ ئەگەر مرۆڤ بیزانێت.

٤. بیرکردنەوە و خۆ سەرقاڵ کردن بە شتانێك کە وجودی نیە، وەك بیرکردنـەوە لەوەی کە ببێت بە پادشا چی بکات! یان ئەگەر کوپەیەکی زێری بدۆزێتەوە چـی لیٚ بکات! یان ئەگەر شتێك بدۆزێتەوە ئەوکات چی لیٚ بکات؟ چۆن ڕەفتاری تیا بکات، چەندین بیری بیٚ هوودەی لەم جۆرە.

٥. بیرکردنەوە و خۆ سەرقاڵ کردن بە گوزەرانی خەڵکی کە چـی دەکـەن و چـی ناکەن و دوورن لە خوا و پێغەمبەر و ڕۆژی دوایی.

٦. بیرکردنەوە و خۆ سەرقاڵ کردن بە فێل و تەڵەکانـە بـۆ گەیـشتن بـە مـەرام و ئارەزوواتی جا مباح بێت یان حەڕام بێت.

٧. بیرکردنـەوە و خـۆ سـەرقاڵ کـردن بـە هونـەری شـیعری مـەدح و دڵـداری و چەندین جۆر لەم بابەتە، چونکە ئەمە مرۆڤ لە شتێك سەرقاڵ دەکات کە کامەرانی و

ژیانی بەردەوامی پێوە بەندە.

٨. بیرکردنەوە و خۆ سەرقاڵ کردن بەو شتە خەیاڵاتیانەی کە هیچ ئەسڵی نیە و هەرگیز کەسیش پێویستی پێ نابێ، ئەوەش لـە هـەموو زانستێکدا هەیە، هـەتا لـە زانستی (الفقه) و (الاصول) و (الطب)یشدا هەیە.

ئەم بیرکردنەوانەی باسمانکرد زیانی زۆر زیـاترە لـە سـوودەکەی، هـەر ئەوەنـدە زیانە بەسە کە مرۆڤ سەرقال دەکات و ناهێڵێت بیر لە شتی چاك بکاتەوە.

# ووتەی پەندئامـێز

* داواکــردن هانــدەری مرۆڤــە بـۆ ئیمــان، کۆبوونــەوەی ئیمــان و داواکــردن پێکەوەش، بەرووبومەکەی کاری چاکەیە.

* گومانی چاکبردن بـە خـوا هانـدەری مرۆڤـە بـۆ ملکەچـی و زەلیلیـە بـۆ خـوا، کۆبوونەوەی ئەو دووەش پێکەوە، بەرووبومەکەی وەڵامدانەوەی دوعـای بەندەکانـە لە لایەن خواوە.

* لـە خـوا ترسـان هانـدەری مرۆڤـە بـۆ خۆشەویـستی خـوای، کۆبوونـەوەی لـە خواترسان و خۆشەویستی پێکەوە، بەرووبومەکەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوایە و خۆ پاراستنە لە قەدەغەکراوەکانی.

* خـۆڕاگرتن هانـدەری مرۆڤـە بـۆ یـەقین، ئەگـەر خـۆڕاگرتن و یـەقین پێکـەوە کۆبوونەوە، بەرووبومەکەی ئەوەیە مرۆڤ لە دیندا دەکات بـە پێشەوا خـوای گـەورە دەفـــــەرمووێ: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴾(السجده:٢٤)، واتـە: لە وانیشدا چەند کەسێکمان کردە پێشەوا کە هەر بە فـەرمانی ئێمـە ڕێنمـوونی مـرۆڤ بکـەن، چـونکە توانـای خۆڕاگرتنیـان تێیـدا بـوو یەقینیشیان بە ئایەتەکانمان هەبوو.

* شـوێنکەوتنی پێغەمبـەر بـە پـوختیﷺ هانـدەرە بـۆ ئـیخلاص، جـا ئەگـەر هەردووکیان پێکەوە کۆبوونەوە، بەرووبومەکەی ئەوەیە کاروکردەوەکانی لەلای خوا قبوڵ دەبێت.

* کارکردن هاندەرە بۆ زانست، جا ئەگەر کارکردن و زانـست پێکـەوە کۆبـۆوە، ئەوە بەختەوەری و سەرفرازی تیا دایـە، بـەڵام ئەگـەر یـەکیان ئـەوی تـری لەگەڵـدا نەبوو، ئەوە هیچ سوودی نیە.

* ئارامگرتن هاندەرە بۆ زانست، جا ئەگەر ئارامگرتن و زانست پێکەوە کۆبۆوە، مـرۆڤ سـەربەرزی دنیـا و قیامـەتی دەسـت دەکـەوێ، سـوود لـە هـەموو زانـستێك وەردەگرێ، بەڵام ئەگەر یەکیان ئەوی تری لەگەڵدا نەبوو ئەوە سوودی نامێنێ.

* عەزیمـەت هانـدەرە بـۆ چاوسـاغی، ئەگـەر مـرۆڤ عەزیمـەت و چاوسـاغی تیـا کۆبـۆوە، ئـەوە خاوەنەکـەی چـاکەی دنیـا و دوا ڕۆژی بەدەسـت دەهێنێـت، جـا دواکەوتنی مرۆڤ لە کامل بوون، یان ئەوەتا چاوساغ نیە، یان ئەوەتا عەزیمەتی نیە.

* نیەت چاکی هاندەری مرۆڤە بۆ چاکی زەین و بیری، جا ئەگەر ئـەم دووانـەی لە دەستچوو ئـەوە هـەموو خێرێکی لـە دەسـت دەچێت، بـەڵام ئەگـەر پێکـەوەش کۆبۆوە، ئەوە بەرووبومی هەموو خێر و چاکەیەکە.

*بۆچـوونی چـاك هانـدەرە بـۆ جـوامێری، جـا ئەگـەر ئـەم دووانـە پێکـەوە کۆبوونەوە، ئەوە سەرکەوتن و سەرفرازی بە مرۆڤ دەبەخشن، ئەگـەر هەردووکیـشی لە دەستچوو ئەوە تووشی سەرشۆڕی و دۆڕان دەبێت، بەڵام ئەگـەر مـرۆڤ بۆچـوونی هەبوو بەبێ جوامێری، ئـەوە ترسـنۆکی و بـێ توانابیـە، ئەگـەر جوامێریـشی هـەبوو بۆچوونی نەبوو، ئەوە ڕووخان و هەرەس هێنانیەتی.

* ئارامگرتن هاندەرە بۆ چاوساغی، جا ئەگەر هەردووکیان پێکەوە کۆبوونەوە، ئەوە خێرێکی زۆری تیایە.

* ئامۆژگاری هانـدەرە بـۆ بـەهێز بـوونی عـەقڵ، جـا هـەر کاتێك ئامۆژگاریەکـە بەهێز بێت، ئەوە زیاتر عەقل بەهێز دەبێ و دەدرەوشێتەوە.

* یادکردنەوە و بیرکردنەوە هەر یەکیان هاندەری یەکترین، جـا ئەگـەر پێکـەوە کۆبونەوە، بەرووبومەکەی پشت هەڵکردنە لە دنیا و ڕووکردنە دوا ڕۆژە.

* تەقوا هاندەرە بۆ تەوەکول، ئەگەر تەقوا و تەوەکول پێکەوە کۆبونەوە ئـەوە دڵ جێگیر دەبێت.

* هاندەری ئامـادەگی دڵ پەیوەسـت نـە بوونـە بـە دنیـا، ئەگـەر هـەردووکیان

پێکـەوە کۆبوونـەوە، ئـەوە هـەموو خێـر و چـاکەیەکی پێوەیـە، بـەڵام ئەگـەر لێـک جیابوونەوە ئەوە شەڕ و خراپەی پێوەیە.

* نیەتی سـاغ و پـاک هانـدەرە بـۆ هیمـەتی بـەرز، ئەگـەر ئـەم دووانـە پێکـەوە کۆبوونەوە، ئەوە بەندە دەگات بە ئامانجی خۆی.

## وەستان لەبەردەستی خوا

مرۆڤ لە دوو وێستگە لەبەر دەستی خوا دەوەستێ:

یەکیان: لە نوێژدا لە خزمەتی خوا دەوەستێ.

دووەمیان: لەو ڕۆژەی بە خزمەتی دەگات لەبەر دەستی دەوەستێ.

جـا هـەر کەسـێك بـە پـوختی و دروسـتی مـافی وێـستگەی یەکەمیـدا ــ کـە نوێژکردنەـ ئەوە وێستگەی دووەمی بۆ ئاسـان دەبێـت، بـەڵام ئەگـەر بـە پـوختی و دروستی مافی وێستگەی یەکەمی نەدا، وێستگەی دووەمـی لەسـەر گـران و ئاسـتەم دەبێـت خـوای گـەورە دەفــەرمووێ: ﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا﴾(الانــسان:٢٦ ـــ ٢٧)، واتـە: لە شەوگاریشدا سوجدەی بۆ ببە و تەسبحاتی لە هێنـدێکی شـەودا زۆر بکـە، ئەو گومڕایانە حەزیان لە دنیای بێ بەقایەو ڕۆژێکـی سـەخت و سـەنگیش پـشتگوێ دەخەن.

# وێستگە

تام و چێژ و لەزەت وەرگرتن پێویستی هەموو مرۆڤ و گیاندارێکە، بۆیە چێژ وەرگرتن سەرزەنشت و لۆمەی لێ نەکراوە، بەڵکو کاتێك سەرزەنشت و لۆمەی لێکراوە ئەگەر بە ئەنجامدانی ئەو چێژەوە چێژێکی چاکتر و گەورەتری لە دەست بچێت، یان ئەنجامدانی ئەو چێژە ئازار و سزای بە دواوە بێت.

ئا لێرەدا جیاوازی نێوان مرۆڤێکی عاقڵ و زیرەك، لەگەڵ مرۆڤێکی گەمژە و نەزان دەردەکەوێت، چونکە مرۆڤی ژیر بەراوورد لە نێوان ئەو دوو چێژە و ئازارە دەکات، بۆی دەرکەوت کە یەکیان هیچ نیە بەرانبەر ئەوی تریان، ئەوکات وازهێنانی چێژێکی کەم بۆ بە دەست هێنانی چێژێکی زۆر و بە نرختر لەلای ئاسان دەبێت، ئارامگرتن لەسەر ئازارێکی کەم بۆ لابردنی ئازارێکی زۆر لای ئاسان دەبێت، ئەگەر مرۆڤ وابیر بکاتەوە ئەوە بۆی دەردەکەوێت کە چێژ و خۆشی دوا ڕۆژ زۆر گرنگتر و بەردەوامترە لە چاو چێژ و خۆشی دنیا، بە هەمان شێوەش ئێش و ئازاری دوا ڕۆژ زۆر گرانتر و بە ئێشترە لە ئێش و ئازاری دنیا، ئەم بەراورد کردنەش پەیوەستە بە ئیمان و یەقینەوە، کە هەر کاتێ مرۆڤ دڵی پڕ بوو لە یەقین و دڵنیایی، ئەوە چێژ و خۆشی بەرز و گرنگ بەسەر چێژ و خۆشی کەم و بێ نرخ هەڵدەبژێرێت، ئێش و ئازاری کەمتر هەڵدەبژێرێت لە بری ئێش و ئازاری زۆر و قورس.

# تەفسیری چەند ئایەتێك

ئـەم ئایەتـە: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾ (الانبیاء:٨٣)، واتـە: یادی (ایوب) بکە کاتێك هانا و هاواری بۆ پـەروەردگاری بـرد، ووتی: پەروەرگارا بەراستی من ئازار و ناخۆشیم تووش بووە، تۆش لە هەموو کـەس بە رەحمتری.

ئەم نزایە ڕاستەقینەی یەکتاپەرستی لە خۆگرتووە، دەربڕینی فەقیری و هـەژاری خۆی بەرانبەر پەروەردکاری لە خۆگرتووە، پەیوەست بـوون بـە خۆشەویستی لـە خۆگرتووە، دان هێنان بـە سیفەتی رەحمـەتی خـوای بـەوەی لـە هـەموو کـەس بـە رەحمترە لە خۆگرتووە، (التوسل) ی بە سـیفاتی خـوای لـە خۆگرتـووە، دەربـڕینی ئاتـاجی و پێویـستی لـە خۆگرتـووە، جـا هـەر کەسـێك کـە تـاقی دەکرێتـەوە بـەم شێوەیەش حاڵی بێت، ئەوە خوای گەورە بەڵاکەی لەسەر لادەبات.

لــەم ئایەتەشــدا (یوســف) پێغەمبــەر ﷺ دەیفــەرموو: ﴿أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ﴾ (یوسف:١٠١)، واتـە: پەروەردگارا تۆ پـشت و پـەنای مـنی لـە دنیـا و قیامـەت، داواکـارم کـە بـە موسـڵمانی بم مرێنیـت، بمگەیەنیت بەکاروانی چاکەکاران.

ئەم نزایە ئەمانەی لەخۆگرتووە، دان هێنان بە یەکتاپەرستی خوا، تەسلیم بـوون بۆ پەروەردگار، دەربڕینی بـێ دەسـەڵاتی و هـەژاری خـۆی بەرانبـەر بـە خـوا، خـۆ پاراستن لە پەنا بردنە غـەیری خـوا، مـردن لەسـەر ئیـسلام کـە گرنگترین ئامـانجی بەندەیە کە ئەمە بەدەستی خوایە بەدەستی کەسی تر نیە، دان هێنـان بـە دوا ڕۆژ، داواکردنی دۆستایەتی خۆش بەختان.

خـوای گـەورە لـەم ئایەتـەدا دەفــەرمووێ: ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَائِنُهُ ﴾ (الحجر:٢١)، واتـە: گەنجینەی هەموو شتێك لای ئێمەیە.

ئەو گەنجینەیە ئەوەیە کە هەر شتێك داوا بکرێت ئـەوە گەنجینەکـەی لای خـوای گەورەیە و کلیلی ئەو گەنجینەیەش بەدەست خوای گەورەیـە، داوا کردنـی جگـە لـە خودا داواکردنە لە کەسێك کە هیچی لە لا نیە و هیچی لەدەست نایەت.

کە دەفـەرمووێ: ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الْمُنتَهَىٰ ﴾ (الـنجم: ٤٢)، واتــە: کۆتـایی هـەموو شتێك بۆ لای پەروەردگارتە.

ئەم ئایەتەش گەنجینەیـەکی گـەورەی لـە خۆگرتـووە، ئـەویش ئەوەیـە کـە هـەر شتێك مەبەست لێی خوا نەبێت و بۆ خوا نەبێت ئەوە بێ سوود و بڕاوەیـە، چـونکە ئەمە کۆتاییەکەی بۆ خوا نەبووە، جا خۆشەویـستی هـەر شـتێك لەبـەر خـوا نـەبێت ئەوە خۆشەویستیەکە سزاو نەهامەتیە، هەر کارێك مەبەستی خوا نەبێت ئـەوە پـوچ و بێ هوودەیە، هەر دڵێك پەیوەست نەبێت بە خواوە ئەوە سەرگەردانە و دوورە لـە کامەرانی و سەرفرازی.

کەواتە: هەر شتێك لە خواوە بێت بۆ مرۆڤ ئەوە لەو ئایەتـەدا خـۆی دەگرێتـەوە: ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَائِنُهُ ﴾ (الحجر:٢١).

هەر شتێکیش لە مرۆڤەوە بێـت بـۆ خـوا ئـەوە لـەو ئایەتـەدا خـۆی دەگرێتـەوە: ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الْمُنتَهَىٰ ﴾(النجم: ٤٢).

چونکە هیچ شتێك نیە جگە لە خوا داوابکرێت، هیچ شتێکیش نیـە کۆتاییەکـەی بۆ لای غەیری خوا بێت.

لەژێر ئەم بابەتەدا نهێنیەکی گرنگ هەیە لـە نهێنیەکانی یەکتاپەرسـتی، ئـەویش ئەوەیە هەرگیز دڵ جێگیر و ئارام و راحـەت نابێـت مەگـەر بـە خـواوە نـەبێت، هـەر شتێك جگە لە خوا کە خۆشەویستە لەبەر خاتری خـۆی نیـە، بـەڵکو لەبـەر شـتێکی ترە، تەنها خۆشەویستی خوا لەبەر زاتیەتی، ناشگونجێ کۆتـایی بـۆ لای دوو کـەس

بێـت هـەر وەك چۆن ناگونجێـت سـەرەتای دروسـتکردنی دروسـتکراوەکان لـە دوو کەسەوە بێت، جا هەر کەسێك خۆشەویستی و حەز و ئیرادە و ملکەچی بۆ غـەیری خوا بێت ئەوە کارەکانی پوچەڵ و دوا بڕاوە، هەر کەسێکیش خۆشەویستی و حەز و ترس و ئیرادە و داواکاری تەنها بۆ خوا بێت ئەوە بەردەوام سەرکەوتوو و کامەران و شادمان دەبێت.

مرۆڤ هەموو کات دەسوڕێت لە نێوان ئەو فەرمانانـەی خـوا فـەرمانی پێکـردووە، ئەو بڕیارانەش کە خودا بەسەری دا نازڵ کردووە، مرۆڤ پێویـستی بـە یارمـەتی خـوا هەیە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانـەکانی، پێویستیـشی بـە لـوتفی خـوا هەیـە لـەکاتی دابەزاندنی بڕیارێك بە سەریدا، جا بە ئەنـدازەی هەڵـسانی بـە فـەرمانی خـوا لـوتفی خـوای دەسـت دەکـەوێت لـە کـاتی دابەزانـدنی بڕیـار بەسـەریدا، ئەگـەر بـە دڵ و ڕواڵەتەوە هەڵسا بە فەرمانەکانی خوا، ئەوە لوتفی خـوا دڵ و ڕواڵـەتی دەگرێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر تـەنها بـە فەرمانـەکانی خـوا هەڵسا بـە دڵ نـەبوو، ئـەوە لـوتفی خـوا ڕواڵەتی دەگرێتەوە کەمێك لە دڵی دەگرێتەوە.

ئەگەر گوتت لوتفی خوا بۆ دڵ چییە؟ بەڵام لوتفی خوا بۆ دڵ ئەوەیە کە لـەکاتی توش هاتنی بەشتێك لە لایەن خواوە دڵی جێگیر و ئارامە، دڵەڕاوکێ و دوودڵی نیـە، لە ژێر دەستی پەوەردگار و بە مات و مەلوولی دەوەستێت بە دڵ بـۆی دەڕوانێـت، دڵی پێ ئارامە لەبەر لوتفی خودا ئـەو ئـێش و ئـازارە لـە بـیر دەکـات کـە تیایدایـە، ئاگای لەو ناخۆشیە نامێنێت لەبەر ئەوەی چاك خوا دەناسێت، دەزانێت خوا چـاکتر مەسلەحەتی ئەوی دەوێت، ئـەو تـەنها بەندەیەکـە لـە ژێـر دەسـتی گەورەکـەی کـە بڕیـاری بەسـەر دەدات، جـا ڕازی بێـت یـان نـاڕازی بێـت، ئەگـەر ڕازی بـوو ئـەوە ڕەزامەندی بە دەست دێنێت، ئەگەر ناڕازیش بوو ئەوە هەر ئەو بەدەست دێنێت، ئا ئەوە لوتفی خوایە بۆ دڵ کـە بەرووبومەکـەی پەیوەسـتە بـەکاری دڵ ئەگـەر زیـادی کرد زیاد دەبێت ئەگەر کەمی کرد کەم دەبێت.

# دڵت پەیوەستە بە چی؟!

مرۆڤ ئەگەر ئیرادە و خۆشەویستی نەبەستێتەوە بە خوا، ئەوە دەپچڕێ لە خـوا، مەبەست بە بەستنەوە ئەوەیە دڵی پەیوەست بێت تەنها بە خۆشەویستی خـوا هـیچ شـتێك لـەو خۆشەویـستیە دایـنـەبڕێنێت، دڵـی پەیوەسـت بێـت بـە نـاو و سـیفات و کارەکانی خواوە، هیچ شتێك ئەم نوورەی لێ نەکوژێنێتەوە، دڵی پەیوەست بێت بـە زیکری خواوە، هیچ شتێك ڕووی وەرنەگێڕێت لە زیکری خوا و بێ ئاگـای نـەکات لـە زیکری خوا.

مرۆڤ ئەگەر بەم شێوەبوو ئەوە چوست و چـالاك دەبێـت لـە زیکـر و کارەکـانی و گوێڕایەڵی خوا و خۆپاراستنی لە خراپە، بە جۆرێك چالاك دەبێت کـە کارەکـانی بـە کامەرانیـەوە ئەنجامـدەدات چـونکە فـەرمانی پـێ کـراوە، خـۆی دەپارێزێـت لـە قەدەغەکراوەکان چـونکە قەدەغـەکراوە و ڕقـی لێیـەتی، ئائـەوە مانـای پەیوەسـت بوونیەتی بە فەرمان و قەدەغەکراوەکانی خوا.

پەیوەست بوون بە تەوەکولیش ئەوەیە خۆشەویستی خوای لە دڵدا بێـت و پێـی دڵ ئارام و دڵنیـا بێـت و بـە خـوا ڕازی بێـت و هـەژار و بـێ دەسـەڵاتی خـۆی تـەنها بەرانبەر بە خوا دەربڕێت.

پەیوەست بێت بە تـرس وئومێـدو ڕەجـا و دڵخۆشـی و کامـەرانی و شـادمانی بـە خوا، بە جۆرێك ترسی لە کەس نەبێت تەنها لە خوا، ڕەجا لە کەس نەکات تەنها لـە خوا، بە تەواوی دڵخۆش نەبێت بـە کەسـی تـر، بـە تـەواوی بـە کەسـی تـر شـادمان نەبێت، ئەگەر چی بە هێندێ شت دڵخـۆش و شـادمان بـوو، بـەڵام دڵخۆشـی تـەواو، ئاسوودەیی کامل، شادمانی و چاوگەشی و دڵ ئارامی تەنها بە خوایە، جگـە لەمانـە ئەگەر یارمەتی بوو بۆ ئەمە دڵخۆشی و شادمانیە، بەڵام ئەگەر ڕێگر بوو لەمـە ئـەوە دڵتـەنگی و خەفـەت بـاری و پەژارەییـە، هەرچـی دڵخۆشـی و ئاسـوودەییەك هەیـە

هەمووی بە خواوەیە، یان بەوەوەیە کە بەوی دەگەیـەنێت و یارمـەتی دەرە لەسـەر ڕەزامەندی خوا.

خوای گەورە ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کە ئـەو کەسـانەی خـۆش ناوێـت، کـە بـە دنیا و جوانی دنیا دڵخۆشن، فەرمانیشی بە بەندەکانی کـردووە کـە دڵخـۆش بـن بـە فەزڵ و ڕەحمەتی خوا کە ئیسلام و ئیمان و قورئانە، جا لێـرەدا مەبەست ئەوەیـە: هەر کەسێك ئەو کارانەی بۆ خوا بکات، دەکات پەیوەستە بە خوا، ئەگەر نا دەکـات پچڕاوە لە پەروەردگاری، و پەیوەستە بە نەفسی خۆیەوە.

# شوكرانه بژێری خودا

ئـەی مـرۆڤ بزانـە هـەموو بەخـشش و نیعمـەتێك تـەنها لـە خواوەيـە، نیعمـەتی بەندايەتی نیعمەتی تـام و چێژە خـوای گـەورە دەفــەرمووێ: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ ﴾ (النحــل:٥٣)، واتــە: هەرچــی نــاز و نیعمەتێكیان هەيە هەر هەمووی لە خواوەيە، پاشـان كاتێك ناخۆشـی و بەڵايـەكتان بۆ پێش دێت ئەوە هانا و هاوار و پەنا هەر بۆ لای ئەو دەبەن.

خــــوای گـــــەورره دەفـــــەرمووێ: ﴿فَاذْكُرُوا آلَاءَ اللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (الاعراف:٦٩)، واتـە: يادی ناز و نیعمەتەكانی خوا بكەن بۆ ئەوەی سەرفراز بن.

هــەروەها دەفــەرمووێ: ﴿وَاشْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ (النحل:١١٤)، واتـە: شوكرانەی ناز و نیعمەتەكانی خوا بكەن ئەگەر ئێوە تـەنها ئـەو دەپەرستن.

جا هـەر وەك چۆن ئـەم نـاز و نیعمەتانـە لـە فـەزڵ و بەخشـشی خوداوەيە، بـە هەمان شێوەش مـرۆڤ زيكـر و شـوكرانە بـژێری خـوای دەسـت ناكـەوێت مەگـەر بـە يارمەتی خوا نەبێت.

گوناهیش سەرگەردانی خودايـە بـۆ مـرۆڤ كـە وازی لـێ دەهێنێـت و دەيـسپێرێتە نەفسی خۆی، جا ئەگەر خوای گەورە لەمەدا فريای بەندەكەی نەكەوێت، ئەوە هـيچ رێگايەكی تر نیە بە فريای بكەوێت، كەواتە: مرۆڤ ناچارە و ئاتاجە كە ملكەچ بێت و هانا و هاوار تەنها بۆ خـوا بـەرێت، تـاكو ئـەم سـەرگەردانیەی لێ لابـەرێت و تووشـی نەبێت، ئەگەر بڕيار درابوو و تووشی هات، ئەوە پێويستە ملكەچ بێت و هانا و هاوار بـۆ خـوا بـەرێت كـە تووشـی سـزاكەی نـەكات كـە پێـوەی بەنـدە، مـرۆڤ بـەردەوام پێويستی بەم سێ بنچینەيە هەيـە هـەرگیز سـەرفرازيش نابێـت مەگـەر بـەو سیانە

نەبێت، ئەویش ئەمانەن:

١. شوكرانە بژێری خوا.

٢. داوا كردنی سەلامەتی لە خوا.

٣. تەوبەی ڕاستگۆیانە.

ئەگەر بێتوو وردبییەوە لەوە بۆت دەردەكەوێت كە ئەوانە هەر هەمووی پەیوەستە بە (الرغبة)حەزلێبوون، و (الرهبة)حەزلێنەبوونی مرۆڤە، ئەم دووانەش بەدەستی بەندە نیە بەڵكو بەدەستی ئەو كەسەیە كە چۆنی بوێت دڵەكان ئاڵ و گۆڕ دەكات، ئەگەر خوای گەورە یارمەتی بەندەكەی بدات ئەوە دڵی پڕ دەكات لە (الرغبة)و(الرهبة)، بەڵام ئەگەر سەرگەردانی بكات ئەوە وازی لێ دەهێنێت و فەرامۆشی دەكات و دڵی وەرناگیرێ، پرسیاریشی لێ ناكرێت، خوای گەورە چی بوێت دەبێت، چیشی نەوێت نابێت.

پاشان بیرت كردۆتەوە ئایا هیچ هۆیەك هەیە بۆ سەرفرازی و سەرگەردانی، یان خودا تەنها بەویستی خۆی مرۆڤ سەرفراز و سەرگەردان دەكات بەبێ هیچ هۆیەك؟ ئەگەر هۆیەكە تەنها دڵە ئەوە خوای گەورە دروست كاری ئەو دلانەیە كە شیاون و یان شیاو نین بۆ توانای هەڵگرتنی چاكە و خراپە، بۆ نموونە ئەوەی گیاندار وەردەگرێت بێگیان وەری ناگرێت، هەروەها ئەم دووانەش فەرقیان هەیە لە وەرگرتن، ئەوەی مرۆڤ شیاوی وەرگرتنیەتی ئاژەڵ شیاوی نیە و وەری ناگرێت، ئەوەی ئاژەڵ شیاوی وەرگرتنیەتی مرۆڤ وەری ناگرێت، ئەگەر ئەو دڵە شیاوی نیعمەت بێت بە جۆرێك كە بیناسێت، قەدر و خراپەی بزانێت، سوپاسی خاوەن نیعمەت بكات و ستایشی بكات، بە گەورەی بزانێت، بزانێت كە ئەوە لە بەخشندەی و فەزڵی ئەوە نەك ئەوەی كە ئەو شیاوە بەو نیعمەتە، بەڵكو ئەو نیعمەتە هی خوایە بە تەنها و بە تەنها لەوییەوەیە، ئەگەر مرۆڤ بەو جۆرە بیری كردەوە ئەوە نیعمەتەكە تەنها بە مولكی خوا دەزانێت، شوكرانە بژێری لەسەر دەكات، بە بەخشش و منەتی خوای دەزانێت، كەمتەرخەمی خۆی بۆ دەردەكەوێت لە شوكرانە

بژێری، دەزانێت ئەگەر ئەو نیعمەتە لەسەری بەردەوام بێت ئەوە لە خێر و فەزڵ و چاکەی خواوەیە، ئەگەر لێشی سەنێتەوە دیارە ئەو نیعمەتە شیاوی نیە بۆیە لێی سەندۆتەوە، ئەگەر بەو جۆرە بیری کردەوە ئەوە هەر کاتێك خودا نیعمەتی زیاتر بداتێ، ئەو زیاتر ملکەچ و زەلیل دەبێت لەبەر دەستی خوا، زیاتر سوپاسی دەکات، زیاتر دەترسێ کە خوا نەوەك لێی بسەنێتەوە، لەبەر ئەوەی بەتەواوی سوپاسی نەکردووە،هەر وەك چۆن نیعمەتی خۆی لەوانە ساندەوە، کەنیعمەتەکەیان نەناسی و حەقی خۆیان پێ نەدا، چونکە ئەگەر سوپاسی نیعمەتی خوای نەکرد و بەڵکو پێچەوانەی کرد ئەوە خودا لێی دەسێنێتەوە هەر وەك خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ﴾ (الانعام:٥٣)، واتە: هەر بەو شێوە ئێمە هێندێکیان بە هێندێکیان تاقی دەکەینەوە، تا بلێن: ئایا ئەوانە خوا ڕێزی لێناون لە ناوماندا؟! ئایا خوا زانا نیە بە سوپاسگوزاران.

ئا ئەوانە نیعمەتیان ناسیوە و وەریان گرتووە و خۆشیان ویستووە، سوپاس و ستایشی خوایان لەسەر کردووە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ قَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ رُسُلُ ٱللَّهِ ۘ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾ (الانعام:١٢٤)، واتە: کاتێك ئایەتێکی قورئانیان بۆ بێت دەڵێن: ئێمە هەرگیز ئیمان ناهێنین هەتا وێنەی ئەوەی کە بۆ پێغەمبەران هاتووە بە ئێمە نەبەخشرێت، خوا زانایە بەو دڵ و دەروونەی کە شایستەیە کە پەیامی خۆی تێدا دابنێت.

# هۆكاری سەرگەردانی مرۆڤ

ئەگەر بینیت مرۆڤێك سەرگەردانە ئەوە هۆیەكەی ئەوەیـە شـیاو نیـە بـەوەی بـە نیعمەتی خوای گەورە شاد بێت، بەڵكو ئەگەر نیعمەتیشی پێ ببەخشرێت، دەڵێت: ئەمە مولكی خۆمە، ئەم سەروەت و سامانەم بۆیە پێ دراوە چونكە من شیاوم هـەر وەك خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾ (القصص:٧٨)، واتـە: دەیووت: ئەم سەروەت و سامانەم بەهۆی زانست و زانیاری خۆم پێم دراوە.

(الفراء) لـە تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا دەفـەرمووێ: دەڵێت: مـن ڕێـزم هەیـە لای خوداو شیاوم بۆیە ئەم سەروەت و سامانەی پێ داوم.

(مقاتل) دەفەرمووێ: دەڵێت: ئـەم سـەروەت و سـامانەم پێدراوە، چـونكە خـوا خێری لە من بەدی كردووە.

(عبـدالله)ی كـوڕی(الحـارث) باسـی پێغەمبـەر (سـلیمان)ی دەكـرد كـە خـوا چ مولكێكی پێ بەخشیبوو پاشان ئەو ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُ﴾ (النمل:٤٠)، واتـە: ئەمە لـە فـەزڵ و بەخشـشەكانی پەروەردگارمـە بۆ ئەوەی تاقیم بكاتەوە، كە ئایا سوپاسگوزار دەبم یان سپلە.

(سلیمان) نەیووت: (هذا من كرامتي)واتـە: ئەم سەروەت و دەسەڵاتەی پـێم دراوە لەبـەر ڕێـزی خۆمـە، پاشـان باسـی (قـارون)ی كـردوو و ئـەو ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾ (القصص:٧٨)، واتـە: ئەم سـەروەت و سـامانەم بـە هـۆی زانست و زانیاری خۆمەوە پێ دراوە.

لێرەدا دەبینین كە (سلیمان) ئەو سەروەت و سامانەی بـە فـەزڵ و منـەتی خـوا دەزانی و دەیووت: بۆ ئەوە سەروەت و دەسەڵاتەی پێداوم تاكو تاقیم بكاتـەوە كـە

ئایا سوپاسگوزارم یان نا، بەڵام (قارون) ئەوەی بە هەوڵی شان و باڵی خۆی دەزانی و خۆی پێ بە شیاو دەزانی.

هەوەها خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِن بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِي ﴾ (فصلت:٥٠)، واتـە: ئـادەمیزاد دوای ئـەو دەرد و بەڵایـەی تووشـی هاتبوو، خێر و خۆشی بە سەردا برێژین و پێـی بـچێژین، دەڵێـت: ئەمـە بـە ڕەنجـی شانی خۆم پەیدام کردووە.

بەڵـێ: مرۆڤی ئیماندار ئەو سەروەت و سامانەی هەیەتی بە موڵکی پەروەردگاری دەزانێت، کە خودا بە فەزڵ و منەتی خۆی پێی بەخشیووە، بێ ئەوەی مافی لەسەر خـوا بێـت، بـەڵکو خـوا خێرێکـە و لەگـەڵ ئەویـدا کـردووە، خـوا بۆشـی هەیـە پێـی نەبەخشێ، جا ئەگەر پێی نەبەخشی واناگەیەنێت کە مافێکی لێ پێشێل کردووە.

ئەگەر مرۆڤ ئاوا بیرنەکاتەوە ئەوە وا دەزانێت کە ئەو شیاوە بەو شـتە، بۆیـە لـە خۆی بای دەبێت بەو نیعمەتە و لە سنوور دەردەچێت، خۆی لە خەڵکی بە چاکتر و بـەڕێزتر دەزانێـت و شـانازی و فـەخری پـێ دەکـات، هـەر وەك خـوای گـەورە دەفــــــەرمووێ: ﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا الْإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ إِنَّهُ لَيَئُوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ نَعْمَاءَ بَعْدَ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ السَّيِّئَاتُ عَنِّي ۚ إِنَّهُ لَفَرِحٌ فَخُورٌ﴾ (هود:٩ ـ ١٠)، واتـە: مـرۆڤ ئەگـەر تـامی خۆشـیمان پـێ چـێژاند و پاشان لێمان ساندەوە، بێگومان نا ئومێدی و کوفرانە بژێری دەکات، ئەگـەر پاشـی لێ قەومانیش شادمانیمان پێ دا، هەڵبەتـە دەڵێـت: ناخۆشیەکانم لێ ڕەوینـەوە، بـە کەیف دەبێت و بە خۆی هەڵدەڵێ.

خوای گەورە زەمی کردووە کە بێ ئومێد و کوفرانە بژێر دەبێت لە کـاتی ئـەوەی کە تاقی دەکاتەوە بە بەڵا و نەهامـەتی، زەمـی کـردووە کـە دڵخـۆش و لـە خۆبـایی دەبێت ئەگەر بە نیعمەت تاقی بکاتەوە، ئەو مرۆڤە کاتێك ناخۆشی لێ دەڕەوێتەوە، لە باتی سوپاس و شوکرانە بـژێری و ستایـشی خـوا بکـات دەڵـێن: (ذهـب الـسیئات

عنى) واتـە: ناخۆشیەکانم لێ ڕەویـەوە ئەگـەر بیگوتایا: (اذهـب الله السیئات عنـى برحمه و منته) واتـە: ئەم ناخۆشیانەم بە رەحمەت و منـەتی خـوا لێ ڕەوایـەوە. ئـا ئەمە بەم جۆرە زەم لێکراو نیە، بەڵکو چاکیشە.

جا ئەگەر خوا ئەمەی لە دڵی بەندەیەك بەدی کرد، ئەوە گەورەترین هۆکارە بۆ سەرگەردانی ئەو بەندەیە و فەرامۆش کردنی خوا بۆی، چونکە ئەو مرۆڤە شیاوی بەخشش و نیعمەتی خوا نیە هەر وەك خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمۡ خَيۡرٗا لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ وَلَوۡ أَسۡمَعَهُمۡ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٢٣﴾﴾ (الانفال:٢١ ــ ٢٢)، واتـە: خراپترین گیاندار لەلای خودا ئەو کەڕو لاڵانەن کەوا هیچ تێ ناگەن، خۆ ئەگەر خوا خێری تیادا بەدی بکردنایە، ئەوە وای لێ دەکردن کە حەق و ڕاستی ببیستن، خۆ ئەگەر حەقیشیان پێ ببیستنایە، ئەوە هەر ڕوویان لێ وەردەگێڕا و خۆیان دەبوارد.

لێرەدا خوای گەورە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەوانە شیاوی ئـەوە نـین نیعمـەتی خوا وەرگرن، لەگەڵ ئەوەش کە شیاوی ئـەو نیعمەتـە نـین ڕێگرێکـی تریـشمان تیـا بەدی دەکرێ، ئەویش ڕوو وەرگێڕان و خۆ لێ بواردنە دوای ناسینیشی.

ئەوەی پێویستە بزانرێت ئەوەیە، هۆکاری سەرگەردانی مـرۆڤ فـەرامۆش کـردن و وازلێهێنانیەتی لەسەر ئـەو شـێوەی لەسـەری دروسـتکراوە، هۆکـاری سەرفرازیـشی ئەوەیـە کـە چـونکە شیاوی سـەرفرازییە خـوا نیعمـەتی لەگەڵدا دەکـات، هۆکـاری سەرفرازی لە فەزڵی خواوەیە، خوای گەورە بەدیهێنەری سەرفرازی و سەرگەردانیە، هەر وەکـو چـۆن بەشـەکانی زەوی دروسـتکردووە، کـە هێنـدێکی شـیاوی ڕووەك لێ شین بوونە هێندێکیشی شیاو نیە، درەختی دروستکردووە، هێندێکی بەرووبوم دەدا هێندێکیـشی نایـدا، هـەنگی دروسـتکردووە سـازاوە کـە هـەنگوین ببەخـشێ، بـەڵام زەردەواڵـە وانیـە، هێنـدێ ڕۆحـی پاکیـشی دروسـتکردووە، کـە شـیاوە بـۆ زیکـر و شـوکرانە بـژێری و یەکتاپەرسـتی و ئامۆژگـاری و شـکۆداری خـوا، هێنـدێ ڕۆحـی پیسیشی دروستکردووە کە شیاوی ئەمانە نین، بەڵکو شیاوی دژی ئەمانەیە.

# تاقی کردنەوەی خوا

(شیخ الاسلام، ابن تیمیة)(رەحمەتی خوای لێبێت) دەفـەرمووێ[(١)] خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسۡبِقُونَاۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٤﴾ مَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٖۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٥﴾ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَحۡسَنَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٧﴾ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٩﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡۚ أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴿١١﴾﴾(العنكبوت:١ ـ ١١).

واتـە: الم، ئایا خەڵکی لایان وایە، هەر بڵێن: ئێمە ئیمانمان هێناوە، وازیان لێ دەهێنرێ و تاقی ناکرێنەوە؟ بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانیشمان تاقی کردۆتەوە بە جۆرەها شێوە، تا خوای گەورە ئەوانەی راستیان کردووە دەرکەون، درۆزنەکانیش دەرکەون، ئایا ئەوانەی خراپە و نادروستی دەکەن وا دەزانن کە لە

(١) لێرەدا تا کۆتای کتێبەکە هەمووی ووتەی (ابن تیمیە)ە.

دەستمان دەردەچن و دەرباز دەبن؟! ئای چەند خراپە ئەو بڕیارەی کە دەیدەن، ئەوەی کە ئاواتە خوازە بە دیداری خوا شاد بێت، با دڵنیا بێت کە کاتی دیاریکراوی خوا و ساتی سەرەمەرگ هەر دێت، بێگومان ئەو خوایە بیسەرە و زانایە، ئەوەش کە هەوڵ وکۆشش دەکات لە پێناوی خوا، بێگومان قازانج و سوودی هەوڵ و کۆششەکەی هەر بۆ خۆیەتی، چونکە بەڕاستی خوا بێ نیازە لە هەموو خەڵکی، ئەوانەی ئیماندارن و ئاکار چاکن، هەڵە و گوناهیان دەسڕینەوە و بە چاکتر لەوەی کە دەیانکرد پاداشتیان دەدەینەوە، ئێمە فەرمانمان داوە بە ئینسان کە چاک رەفتار بێت لەگەڵ دایك و باوکیدا، خۆ ئەگەر زۆریان لێکردیت تا هاوبەشیم بۆ بڕیار بدەیت، بێ ئەوەی زانست و زانیاریان هەبێت لەم بارەیەوە، بە گوێیان مەکە، دڵنیاش بن کە گەڕانەوەتان بۆ لای منە، ئەو کاتە ئاگادارتان دەکەمەوە لەو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا، ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و کاری چاکەیان ئەنجامداوە، بێگومان دەیانخەینە ریزی چاکەکارانەوە، هێندێك لە خەڵکی هەن دەڵێن: ئیمانمان هێناوە، جا کاتێك لەبەر خوا تووشی ئازار و ناخۆشی دەبن وا دەزانن ئازاری خەڵکی وەکو سزای خوا وایە، خۆ ئەگەر لە پەروەردگارتەوە سەرکەوتنێك بێت، دەڵێن: ئێمەش هاوکارتان بووین، مەگەر خوا لەوەی کە لە سینەی خەڵکیدایە شارەزاتر و ئاگادارتر نیە؟ بێگومان خوا ئیمانداران باش دەناسێت و منافقانیش باش دەناسێ.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴾ (البقرە:٢١٤)، واتە: ئایا لاتان وایە هەروا بە ئاسانی دەچنە بەهەشتەوە، مەگەر نموونەی ئیماندارانی پێشووتان بۆ باس نەکراوە، کە تووشی ناخۆشی و تەنگانە و گرانی و نەداری بوون و تەکانیان خواردووە و زۆریان بۆ هاتووە بە ڕادەیەك، هەتا پێغەمبەرەکەیان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لەگەڵیاندا، دەیانگوت: کەی پەروەردگار سەرکەوتن دەبەخشێت؟

ئاگادار بن و دڵنیا بن سەرکەوتنی خوا نزیکە.

خـەڵکی کاتێـك خـوا پێغەمبـەرانیان بـۆ دەنێرێـت دوو وەڵامیـان بـۆ پێغەمبـەران هەیە:

- یان دەڵێن: ئیمانمان هێنا.
- یان دەڵێن: ئیمانمان نەهێنا و بەردەوام دەبن لەسەر خراپەکاریەکانیاندا.

جا هەر کەسێك بڵێ: ئیمانم هێنا ئەوە پەروەردگار تاقی دەکاتەوەتاکوڕاستگۆ و درۆزن لێك جیابێتەوە، بەڵام ئەوەی ناڵێـت: ئیمـانم هێنـا وا نـەزانێت پـەروەردگاری خەڵەتاندووە و خوا تاقی ناکاتەوە.

بەڵـێ: ئەوە سوونەتی خوایە پێغەمبەران بۆ خـەڵکی ڕەوانـە دەکـات خـەڵکی بـە درۆیان دەزانن و ئازاریان دەدەن خوای گەورە دەفــەرمووێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ ﴾ (الانعــام:١١٢)، واتـــە: هــەروەها بــۆ هــەموو پێغەمبەرێك دوژمنێکمان لە شەیتانەکانی ئینس و جنۆکە سازاندووە.

خوای گـەورە دەفــەرمووێ: ﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا۟ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴾ (الـذاریات:٥٢)، واتــە: هـەروەها بـەر لەمانـەش هـەر وابـووە، هـەر کاتێـك پێغەمبەرێکیان بۆ هاتووە گوتیانە: یان جادوگەرە، یان شێتە.

هەروەها دەفـەرمووێ:﴿ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ﴾(فـصلت:٤٣)، واتـە: هەرچی بە تۆ گوترا بێت، بە پێغەمبەرانی پێش تۆش گوتراوە.

هەر کەسێك ئیمان بـە پێغەمبـەران بهێنـێ و گوێڕایـەڵیان بکـات، ئـەوە دژایـەتی دەکەن و ئازاری دەدەن، خوای گەورە بەم شێوە بە ئێش و ئازار تـاقی دەکاتـەوە، ئەوەی ئیمانیش بە پێغەمبەران نـەهێنێ، ئـەوە لەلایـەن خـواوە سـزا دەدرێـت، کـە ئێش و ئازاری سزای خوا زۆر گرانتر و بەردەوامترە.

کەواتە: دەبێت هەر هەموو کەسێك ئێش و ئازار بچێژێت جا ئیمانـدار بێـت، یـان کافر بێت، بەڵام ئیماندار سەرەتا لە دنیادا کەمێك ئێش و ئـازار دەکێـشێت، پاشـان ئەوەی بۆ دەبێتە سەرفرازی لە دنیا و قیامەت، بەڵام کافر سەرەتا لە دنیادا کـەمێك خۆشی دەچێژێت، پاشان بۆی دەبێت بە ئێش و ئازار.

پیاوێك پرسیاری لە ئیمامی (الشافعي) کرد و ووتی: باوکی (عبدالله) ئایا کام لەم دووانـە فـەزڵیان زیـاترە، پیاوێـك دامـەزراو بێـت، یـان تـاقی بکرێتـەوە؟ ئیمـامی (الشافعي) لە وەڵامدا فەرمووی: مرۆڤ دامەزراو نابێت تاکو تاقی نەکرێتەوە، چـونکە خوای گەورە (نوح) و (ابـراهیم) و (موسـى) و (عیـسى) و (محمـد)(سـەلامی خوایـان لێبێت) تاقی کردەوە جا کاتێك خـۆراگر بـوون خـواش دامـەزراوی کـردن، بـا کـەس گومانی وا نەبات کە بە تەواوی رزگاری بووە لە ئێش و ئازار.

بەڕاستی خاڵێکی گرنگ هەیە پێویستە مرۆڤـی ژیـر لێـی بـە ئاگـا بێـت، ئـەویش ئەوەیە هەموو کەسێك تووشی ئازار دەبێـت —لەلایـەن خـەڵك وخـزم و کەسـیەوە — لەبەر ئەوەی مرۆڤ عادەتی وایـە تێکـەڵی خـەڵکی دەبێـت، خـەڵکیش هـەموو جـۆرە بۆچونێکیان هەیە، جا بۆیە داوای لێ دەکـەن کـە بـۆ چـوونی ئـەوان پەسـند بکـات، ئینجا ئەگەر پەسەندی نەکرد ئازار و سزای دەدەن، بەڵام ئەگـەر پەسـەندی بکـات، ئەوە هەر تووشی ئازار و سزا دەبێت، جارێك لەلایەن ئەوانەوە، جارێکیش لەلایـەنی خەڵکی ترەوە، ئەگـەر مـرۆڤ لـە حـاڵی خـۆی و خـەڵکی ووردبێتـەوە شـتی زۆر لـەم بارەیەوە بەدی دەکات وەك ئەوەی کەسانێك کە حەزیان لـە داوێـن پیـسی و سـتەم کردن و شیرك بڕیار هەیە بە هێندێ ووتەی پوچەڵ بـە نـاوی دینـەوە ئـەو گوناهانـە ئەنجام دەدەن وەك خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْيَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ (الاعـراف:٣٣)، واتــە: بلـێ: بەڕاسـتی پـەروەردگارم هەرچـی گوناه و خراپەیەك هەیە حەرامی کردووە چ ئەوانـەی ئاشـکران چ ئەوانـەی پـەنهانن،

هەموو گوناه و دەست درێژیەکی بە ناحەقی حەرام کردووە، هەروەها حەرامی کردووە شەریك بۆ خوا دانان بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکتان بە دەستەوە بێت، حەرامی کردووە لە خۆتانەوە بە ناوی خواوە شت بڵێن.

دەبینی جاری وا هەیە کەسێکی موسڵمانی چاك بە ناچاری تێکەڵی ئەو خەڵکە خراپانە دەبێت کە هەردوولا لە یەك شوێن دانە وەك شوقە، یان دوکان، یان قەیسەری، یان قوتابخانە، یان لە کارێك پێکەوەن، یان لە گوندن لەگەڵ یەکن، یان لە ڕێگادا، یان لە شارێك پێکەوەن، یان لە شوێنێکی تر، ئەو موسلمانانە بیانەوێ هەر شتێك بکەن دەبێت ئەوانەی لەگەڵیانن قایل بکەن، یان لە خراپەکانیان بێ دەنگ بن.

بەڵێ: ئەو کەسە خراپانە داوا لە موسڵمانە چاکەکان دەکەن کە کارە خراپ و بۆچوونەکانیان پەسند بکەن، یان بێ دەنگ بن لە خراپەکانیان، ئینجا ئەگەر هاتوو خراپەکانیان پەسند کرد و لێی بێ دەنگ بوون، ئەوە لە بەلا و فیتنەی ئەوان سەلامەت دەبن، بەلام بەسەریان زاڵ دەبن و سوکایەتیان پێ دەکەن کە زۆر خراپترە لەوەی کە پێشتر لێی دەترسان، وەك ئەوەی داوای شایەتی دانی بە درۆیان لێ دەکەن، یان بەناوی دینەوە فتوایەکی گەندەڵیان بۆ بدەن بۆ ئەوەی ڕێگایان بۆ خۆش بکات بۆ خراپە و ستەم، ئەوکات ئەگەر گوێڕایەڵی نەکردن ئەوە ئازاری دەدەن و دژایەتی دەکەن، ئەگەر گوێڕایەڵیشیان بکات، ئەوە بەسەریدا زاڵ دەبن و سووکایەتی پێ دەکەن زۆر لەوە زیاتر کە ئەو لێی دەترسا، بڕوانە (معاویة) نامەیەکی بۆ (عائشة)ی دایکی ئیمانداران نووسی کە ئامۆژگاری بکات، (عائشة)(رضی الله عنها ) بەو شێوە بۆی نووسی (سَلامٌ عَلَيْكَ) لە پێغەمبەرم بیستووەﷺ کە دەیفەرموو: ((مَنِ الْتَمَسَ رِضَاءَ اللَّهِ بِسَخَطِ النَّاسِ كَفَاهُ اللَّهُ مُؤْنَةَ النَّاسِ وَمَنِ الْتَمَسَ رِضَاءَ النَّاسِ بِسَخَطِ اللَّهِ وَكَلَهُ اللَّهُ إِلَى النَّاسِ))[1]، واتە: هەر کەسێك

---

(١) صحيح: رواه الترمذي (٢٤١٦).

ڕەزامەندی خوا بـە دەسـت بێنێـت گـوێ نەداتـە ڕەزامەنـدی خـەڵکی، ئـەوە خـوای گەورە خەڵکی بۆ مەیسەر دەکات، بـەڵام هـەر کەسێك ڕەزامەنـدی خـەڵکی پـێش ڕەزامەندی خوا بخات، ئەوە خوا کارەکانی دەسپێرێتە خەڵکی.

ئەگەر خوا هیدایەتی کەسێك بدات و سەرفرازی کردبێت، ئەوە تووشی ئـەو کـارە حەرامانە نابێت و ئارام دەگرێت لەسەر ئازاردان و دژایەتی کردنی مل هـوڕان، پـاش ئەوەی ئارامی گرت سـەرفرازی دنیـا و قیامـەتی چـەنگ دەکـەوێت، هـەروەکو چـۆن پێغەمبـەران و شـوێن کـەوتوانیان و زانایـان و پیاوچـاکان ئـازاردراون و دژایـەتیان کراوە، بەڵام ئەوان ئارامیان لەسەر گرتووە.

بێگومان دەبێت ئەوەش بزاندرێت کە هێندێ جار دروستە لە ڕوالـەت ڕەزامەنـدی دەربڕێت، بەڵام لە دڵەوەدا پێی ڕازی نەبێت، وەك ئەوەی کە زۆری لێبکرێـت کـوفر بکات، ئەم بابەتە جگە لەم باسە قسەی لێکراوە بە درێژی.

ئەوەی مەبەستمانە لێرەدا باسی بکەین ئەوەیە دەبێـت هـەر هـەموو کەسێك بـە گوێرەی خۆی تاقی بکرێتەوە، هەرگیز کەس لە تاقی کردنـەوە ڕزگـاری نابێـت، جـا بۆیە خوای گەورە لە زۆر شوێندا باسـی ئـەوەی کـردووە کـە دەبێـت خـەڵکی تـاقی بکرێتەوە، تاقی کردنەوەش یان بە خۆشی یە، یان بە ناخۆشیە، ئـەوکات پێویـستە مرۆڤ ئارامگر و سوپاسگوزار بێـت خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾ (الكهـف:٧)، واتــە: هەرچـی لەسـەر ڕووی زەویدا هەیە ئێمە کردوومانـە بـە هـۆی ڕازاندنـەوە تـا تاقیـان بکەینـەوە، کـە کامیان کاروکردەوەی چاکتر ئەنجام دەدەن.

هــــەروەها دەفــــەرمووێ: ﴿وَبَلَوْنَٰهُم بِٱلْحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ (الاعـراف:١٦٨)، واتــە: بـە خۆشـی و ناخۆشـی تاقیمـان کردنـەوە بـۆ ئـەوەی بگەڕێنەوە.

دەفـەرمووێ: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ

﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾﴾ (طه:١٢٤)، واتـە: ئەگەر هیدایەتی منتان بۆ هات، ئەوەی شوێنی هیدایەتی من بکەوێت، نە گومڕا دەبێت نە تووشی نەگبەتی دەبێ، هەر کەسێکیش پشت لە قورئان بکات، بێگومان تووشی ژیانێکی تەنگ دەبێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشر دەکرێن.

لـە ئایـەتێکی تـر دەفـەرمووێ: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَـٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَيَعْلَمَ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾(ال عمران:١٤٢)، واتـە: ئایا ئێوە وادەزانن هەر ئاوا بـە ئاسـانی دەچـنە بەهەشـت؟! کـە هێـشتا خـودا دەری نەخـستووە کامتـان خەباتکاری کردووە کامتان خۆراگربوونە.

نەفسی مرۆڤ پاك نابێتەوە و گەشە ناکات تاکو بە بەلا پاك نەکرێتـەوە، وەك زێـر کە چۆن پاك و چاکەکەی لە پـیس و خراپەکـەی جیـا ناکرێتـەوە تـا بـە کـورە پـاك نەکرێتەوە.

هەر خراپەیەك تووشی مرۆڤ دەبێت ئەوە لە نەفسی خراپ و نـەفام و سـتەمکاری خۆیەتی خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ۚ﴾ (النساء:٧٩)، واتـە: هەر چیت بۆ پێش دێت لە خێـر و چاکە، ئـەوە لـە خواوەیە، هەرچی ناخۆشیەکیشت بۆ پێش دێت، ئەوە دەستی خۆتی تیایە.

هـەروەها دەفـەرمووێ: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَـٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَـٰذَا ۖ قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنفُسِكُمْ ۗ﴾(ال عمـران:١٦٥)، واتـــە: ئـاخۆ کاتـێ زیانتـان لـە دووژمـن پێگەیشت کە جارێکیش دوو ئەوەندە زیان لێدان هیچ پرسیتان زیانەکەمان لـە چـی بوو؟ بڵێ: لە خۆتانەوە بوو.

لـــە ئایـــەتێکی تردەفـــەرمووێ: ﴿وَمَآ أَصَـٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُوا۟ عَن كَثِيرٍ﴾(الشوری:٣٠)، واتـــە: هـەر بـەلا و نەهامەتیـەکتان بەسـەر

بێت، ئەوە لە ئەنجامی ئەو کاروکردەوانەیە کە بە ئارەزووی خۆتان ئەنجامتان داوە ـ کەچی خوای گەورە ـ لە زۆربەی گوناهەکانیشتان دەبوورێت.

هەروەها دەفـــەرمووی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ (الانفال:٥٣)، واتـە: خودا دەروی چاکەی لـە هـەر گەلێکدا کردبێتـەوە، هەتا ئەوان بیری خۆیان نەگۆڕیبێ، قەت خودا لێی نەگۆڕیون.

خوای گەورە لە ئایـەتێکی تردەفـــەرمووی: ﴿وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوْمٍ سُوٓءًا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥ ۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ﴾ (الرعد:١١)، واتـە: ئەگەر خوا بیەوێت بەڵایەك بەسەر هەر میللەتێکدا بهێنێت، ئەوە هیچ هێزێك ناتوانێت بەری بگرێت، هیچ کەسیش ناتوانێت جگە لە خوا فریایان بکەوێت و ڕزگاریان بکات.

خوای گەورە کە باسی سزای گەلەکانی پێشتر دەکات لە ئادەمەوە تا کۆتای، لە هەموویدا دەفەرمووێ: ئەوانە ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردووە ستەمکار بوونـە، هەرگیز نەیفەرمووە: ستەم لێکراو بوونـە، یەکـەم کەسێکیش کـە دانـی بـە ستەمی خۆی نا باوە ئـادەم و دایـە حـەوا بـووە کـە ووتیـان: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ (الاعـراف:٢٣)، واتـــە: پـەروەردگارا ئێمـە ستەممان لە نەفسی خۆمان کرد، خۆ ئەگەر لێمان خۆش نەبیت و بەزەییت پێمانـدا نەیەتەوە ئەوە لە خەسارەتمەندان دەبین.

خوای گەورە بە (إبلیس)ی فـەرموو: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾ (ص:٨٥)، واتـە: سوێند بە زاتی خۆم دەبێـت دۆزەخ پـڕ بکـەم لـە تـۆ و لـە هـەموو ئەوانەی کە شوێنی تۆش دەکەون.

ئەو کەسانەی شوێنی (إبلیس) دەکەون سەرکەردان و گومڕان هەر وەك (إبلـیس) خـۆی دەڵێـت: ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ﴾ (الحجـر:٣٩ ـــ ٤٠)، واتـــە: پـەروەردگارم، مـادەم بەهۆی ئەم ئینسانەوە منت سەرکەردان و گومڕا کرد شەرت بێت لـە زەویدا هـەموو

گوناه و تاوانێکیان لا جوان بکەم و هەر هەموویان سەرگەردان و گومڕا بکەم، تەنها بەندە دڵسۆزەکانت نەبێت.

خوای گەورەش پێی فەرموو: ﴿إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ﴾ (الحجر:٤٢)، واتە: بڕۆ چیت پێدەکرێت بیکە لەبەر ئەوەی بەندە چاك و پاكەكانی من بە تۆ فریو نادرێن و تۆ هیچ دەسەڵاتێکت بەسەریاندا نیە، تەنها ئەوانەی سەرکەش و یاخی و سەرگەردانەکانن شوێنت دەکەوون.

بۆیە دەبینین پێشینانی چاکمان بەردەوام دانیان بە هەڵەی خۆیان ناوە نموونەی (ابی بکر)و(عمر)و(ابن مسعود) کاتێك قسەیەکیان دەکرد دەیانووت: ئەوە بۆچوونی خۆمانە ئەگەر ڕاست بوو و پێکا بوومان، ئەوە لە خواوەیە، ئەگەر هەڵەش بوو و ئەوە لە نەفسی خۆمان و شەیتانەوەیە خوا و پێغەمبەر لێ ی بەرینە.

لە حەدیسی (القدسي)یشدا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ لە پەروەردگاری دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: ((یا عبادي، انما هي اعمالكم احصيها لكم ثم اوفيكم اياها، فمن وجد خيراً فليحمد الله و من وجد غير ذلك فلا يلومنَّ الاّ نفسه))[1]، واتە: ئەی بەندەکانم هەرچی دێتە ڕێتان ئەوە کردەوەی خۆتانە، من زۆر بە ووردی سەرژمێریان دەکەم بۆتان، پاشان بە تەواوی دەیدەمەوە پێتان، جا هەرچی هاتەوە ڕێتان کردەوەی خۆتانە، ئەگەر باش بوو سوپاسی خوای لەسەر بکەن، خۆ ئەگەر بە جۆرێکی تر بوو ئەوە سەرزەنشتی خۆتان بکەن بەس.

---

(١) صحيح: رواه مسلم (٢٥٧٧)، و ابو داود ()، والترمذي (٢٤٩٧)، و احمد في ((المسند)) (٥/١٥٤و١٦٠)، وابن ماجه (٤٢٥٧).

## چەند حەدیسێك لەسەر دان پێ داهێنانی بەندە بە هەڵەكانی:

لە حەدیسێكی (صحیح)دا هاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((سيد الاستغفار، أن يقول العبد: اللهم انت ربي لا أله إلا انت، خلقتني و انا عبدك، وانا على عهدك و وَعدكَ ما استطعتُ، أعوذ بكَ مِنْ شَرِ ما صَنَعْت، أبوءُلكَ بنِعمتكَ عليَّ و أبوءُ بِذَنبي، فاغفر لي إنـهُ لا يغفر الذنوبَ إلا أنْتَ، من قالها إذا أصبح مُوْقِناً بها فمات من يومه دخل الجنـة، و مـن قالها إذا أمسى مُوْقِنـاً بهـا فمـات مِـن ليلتـهِ دخـل الجنـة))[1]، واتــە:گەورەی (الاستغفار)ان ئەوەیە بەندە بڵێت: خوایە تۆ پەروەردگارمی، هیچ پەرستراوێك نیـە بـە حـەق جگـە لە تۆ، بەدیت هێناوم و من بەندەی تۆم، من تا بتوانم لەسەر ئەو پـەیمان و بەڵێنـەم كە بە تۆم داوە، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی ئەوەی كە كردوومە، دان ئەهێنم بـەو نیعمەتانەی بەسەرتدا ڕژاندووم، دان ئەهێنم بە گوناهـەكانم، لـێم خۆشبە بەڕاستی كەس لە گوناه خۆش نابێت جگە لە تۆ، هـەر كەسێك كاتێك بـەیانی دەكاتـەوە بـە یەقینەوە ئەمە بلێت، ئەگەر لەو ڕۆژەدا بمرێ دەچێتە بەهەشت، هەر كەسێكیش كە ئێوارە دەكاتـەوە بـە یەقینـەوە ئەمـە بلێـت، ئەگـەر لـەو شـەوەدا بمرێـت دەچێتە بەهەشت.

(ابـي بكـر الـصديق) بـە پێغەمبـەری فـەرموو ﷺ چـی بلێـت: ئەگـەر بـەیانی و ئێوارەی كردەوە، وە ئەگەر چووە سەر جێگا: پێغەمبەر ﷺ (ابي بكر الـصديق)ی فێركرد ئەگەر بەیانی و ئێوارەی كـردەوە، ئەگـەر چـووە سـەر جێگـا بڵێـت: ((اللَّهُـمَّ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأرْضِ، عَالِمَ الْغَيْـبِ وَالـشَّهَادَةِ، رَبَّ كُـلِّ شَـيْءٍ وَمَلِيكَـهُ، أشـهد ان لا الـه الا أنت، أعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشَـرَكِهِ، وَأنْ أقْتَـرِفَ عَلَـى نَفْـسِي سُـوءًا أوْ

---

(١) صحيح: رواه البخارى (٨٣/١١)، والنسائى (٢٧٩/٨)، والترمذى (٣٣٩٠).

أجْرُهُ إِلَى مُسْلِمٍ))[١]، واتـە: خوایە ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، ئەی زانـای غەیب و ئاشـکرا، پـەروەردگار و پادشـای هـەموو شـتێك، شـایەتی دەدەم کـە هـیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لە تۆ، پـەنات پێـدەگرم لـە خراپـەی نەفـسی خـۆم و خراپەی شەیتان و هاوبەش دانانی لەوەی کە خراپەیەك بهێنم بەسەر نەفـسمدا یـان بیئاڵێنم لە موسڵمانێکەوە، کاتێك بەیانیت کردەوە یان ئێوارەت کردەوە ئـەم نزایـە بکە.

پێغەمبەرﷺ لە ووتەکانیدا دەیفـەرموو: ((الحمـد لله نـستعینه و نـستغفره، و نعـوذ بالله من شرور انفسنا ومن سیئات أعمالنا))[٢]، واتـە: سوپاس بۆ خوای گەورە، پـەنای پێدەگرین، داوای لێبوردنی لێدەکەین، پەنا دەگرین بە خوا لە خراپەی نەفـسماندا و لە کردەوەی خراپماندا.

لە فەرمودەیەکی تر پێغەمبەرﷺ دەفـەرمووێ: (( إِنِّی آخِذٌ بِحُجَزِكُمْ عن النَّارِ وانـتم تتهافتون تهافت الفراش))[٣]، واتـە: من کەمەرتانم گرتووە تاکو نەچـنە نـاو ئـاگرەوە، کەچی ئێوە وەکو پەپولە خۆتان ڕادەپسکێنن و خۆتانی تێدەهاوێن.

پێغەمبـەر ﷺ لێـرە مرۆڤـی تاوانبـاری بـە پەپولـە چـواندوە، لەبـەر نـەفامی و جولەی بە پەلەی، چونکە پەپولە هیچ نازانێ و بە پەلەش جوولە دەکات.

لە حەدیسێکی تردا هاتووە دەفـەرمووێ: ((مثـل القلـب، مثـل الریـشة ملقـاة بـأرضٍ فلاة))[٤]، واتـە: نمونەی دڵ وەکو نمونەی پەڕێك وایە کە لە بیابان فڕێدراوە.

ئەوەش دیارە کە پەڕ چۆن بە ئاسانی بـە هـەوادا دەچـێت، بۆیـە بـەو کەسـەش دەگووترێ: کە گوێڕایەڵی کەسێك دەکات کە دەیچەوسێنێتەوە (انه استخفه)واتـە:

---

(١) صـحیح: رواه ابـو داود (٥٠٦٧)، والترمـذی (٣٣٨٩)، و احمـد فـی ((المـسند)) (٢/١٩٦)، وحـاکم (١/٥١٣).

(٢) صحیح: رواه النسائی (٣/١٠٥)، و ابو داود (٢١١٨)، والترمذی (١١٠٥).

(٣) .صـحیح: رواه البخـاری (٧/٢٧٤)، ومـسلم (٢٢٨٤)، والترمـذی (٢٨٧٧)، و احمـد فـی ((المـسند)) (٢/٢٤٤و٣١٢).

(٤) سنده حسن: کما قال الالبانی فی صحیح جامع (٥٧٠٩).

بەسووکی زانی و سەرگەردانی کرد، دەبینین لە بارەی فیرعەونەوە دەگووترێت: ﴿فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ﴾ (الزخرف:٥٤)، واتە: (فرعون) هیچ نرخی بۆ دانەنا بۆ گەلەکەی و بەسووك سەیری دەکردن و سەرگەردانی کردن، ئەوانیش گوێڕایەڵی بوون.

خوای گەورەش دەفەرمووێ: ﴿فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقٌّۖ وَلَا يَسۡتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ﴾(الروم:٦٠)، واتە: ئارام بگرە، بەڵێنی خوا دێتەجێ، نەکا ئەوانەی بە گومانن، تۆ لە ڕێی حەق بترازێنن و سووکت بکەن.

چونکە (الخفیف)بێ هێز، جێگیرنابێ و دەڕوخێ، بەڵکو خاوەن یەقین دامەزراو و جێگیر دەبێت، جا (الیقین) جێگیر بوون و دامەزراندنی ئیمانە لە دڵ بە زانست و کردەوە، جاری واش هەیە بەندە زانستێکی چاکی هەیە، بەڵام لەکاتی پێش هاتنی بەڵا دەڕوخێ، بۆیە نەفسی مرۆڤ لە پەلەیی و خراپی و تووڕەیی بە ئاگر چوێنراوە، ئارەزوواتەکانی لە ئاگرە و شەیتانیش لە ئاگرە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ((الغضبُ منَ الشیطان و الشیطان من النار، و انما تطفأ النـارُ بالماء، فإذا غضب أحدكم فليتوضأ))[١]، واتە: تورەیی لە شەیتانەوەیە، شەیتانیش لە ئاگر دروستکراوە، ئاگریش بە ئاو دەکوژێتەوە، کەواتە هەر کەسێك لە ئێوە تووڕە بوو با دەست نوێژ بشۆرێت.

---

(١) حسن: رواه ابو داود (٤٧٨٤)، و احمد فی ((المسند)) (٤/٢٢٦).

لە حەدیسێکی تردا هـاتووە: ((الغـضب جمـرة توقـد في جـوف ابـن ادم، ألا تـرى إلى حمرة عينيه و انتفاخ أوداجه))[1]، واتـە: تووڕەیی وەك پشكۆیەك وایە كە لـە سـینگی مرۆڤدا هەڵدەگیرسێ، ئایا نـابینن كـە چـۆن چـاوی سـوور دەبێـت و ڕەگـی لاملـی هەڵدەستێ.

ئەمە هەڵچوونی و كوڵانی خوێنی دڵـە بۆ تۆڵـە سـەندنەوە، لـە حەدیسـێكی تـردا هاتووە پێغەمبەر ﷺ دەفـەرمووێ: ((إن الشيطان يجري من ابن ادم مجرى الـدم))[2]، واتـــە: خەتـــەرە و وەسوەسـەی شـەیتان لەگـەڵ خـوێنی نـەوەی ئادەمـدا دێـت و دەڕوات.

## خۆپاراستن لە شەیتان:

دوو پیاو لە خزمەت پێغەمبـەردا ﷺ بـوو بـە شـەڕە جنێویـان، یـەكێكیان زۆر تووڕە بوو بۆیە پێغەمبەر ﷺ فـەرمووی: من ووشەیەك دەزانم ئەگـەر ئـەو كابرایـە بیڵێـت ئـەوە ڕقەكـەی دەنیـشێتەوە، ئـەویش ئەوەیـە، كـە بڵێـت: ((اعـوذ بـالله مـن الشيطان الرجيم))[3]، واتـە: پەنادەگرم بە خوا لە شەیتانی نەفرەت لێكراو.

خوای گەورەش دەفـەرمووێ: ﴿ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٦﴾﴾ (فصلت:٣٤ ـ ٣٦)، واتـە: بە جوانترین و چاكترین شێوەبەرەنگاری خراپە و نادروستی بكە، ئەوكاتە ئیتر دەبینیت ئەوەی كە لە نێوان تۆو ئەودا دووژمنایەتی و ساردیەك هەیە، دەبێتە دۆستێكی دڵسۆز و گیانی بە گیانی، كەسیش ناتوانێت

---

(١) (رواه احمد فی المسند (١٩/٣) والترمذی (٢١٩٢) لـە سـەنەدەكەی (علی)ی كوڕی (زید)ی كوری (جدعان) هەیە كە (ضعیف)ـە لەگەڵ ئەوشدا (الترمذی) بە حەدیسێكی (حسن)ی داناوە.

(٢) صـحیح: رواه البخـاری (٤/٢٤٠)، ومـسلم (٢١٧٥)، و ابـو داود (٢٤٧٠)، و احمـد فـی ((المـسند)) (٦/٣٣٧).

(٣) صحیح: رواه البخاری (١٠/٤٣١)، ومسلم (٢٦١٠)، و ابو داود (٥٧٨١)، والترمذی (٣٤٤٨).

بەو ڕەفتارە هەستێت جگە لەوانەی کە ئارامیان گرتووە، هەروەها کەسیش ناتوانێت هەڵوێستی وا بنوێنێت جگە لە کەسێك نەبێت کە خاوەنی بەهرەیەکی گەورە بێت، هەرکاتێ لە شەیتانەوە خەتەرە و خەیاڵی نادروست لە دڵ و دەروونتدا دروست بوو، گورج پەنا بە خوا بگرە، چونکە بەڕاستی خوای گەورە بیسەر و زانـایە.

خوای گەورە دەفـەرمووێ: ﴿ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى الْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا ۖ وَتَرَاهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿١٩٨﴾ خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ ﴾ (الاعراف:۱۹۹ ـ ۲۰۰)، واتـە: چاو بپۆشە و فەرمان بە کاری چاکە بکە و وازبێنە لەو نەزانانە، هەر کاتێکیش خەیاڵاتێکی خراپت لە شەیتانەوە بە دڵدا هات، هەر پەنا بە خوا بگرە، بێگومان خوای گەورە بیسەر و زانایە.

هەروەها دەفـەرمووێ: ﴿ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾ ﴾ (المؤمنون:۹٦ ـ ۹۸)، واتـە: بە چاکترین و جوانترین شێوە پاڵ بە خراپە و هەڵەکان بنێ، خەمت نەبێت ئێمە چاك ئاگادارین لە گوفتار و قسەی ناڕەوایان، بڵێ: پەروەردگارا من پەنا دەگرم بە تۆ لە هەموو خەتەرە و خەیاڵاتێکی شەیتانەکان، پەنا دەگرم بە تۆ ئەی پەروەردگارم، کە ئەوان دێن بەلامەوە.

بە پشتیوانی خوای گەورە تەواو بووم لە وەرگێڕان و پوخت کردنی
ئەم کتێبە، خودایە زۆر سوپاست دەکەم کە یارمەتیت
دام بۆ تـەواو کردنی، خودایە داوات لێدەکەم
بۆم بکەی بە توێشووی قیامەت،

واخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين، حسبنا الله و نعم الوكيل.

# ناوەڕۆك

